# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە
ئەمینداریێتیی گشتیی رۆشنبیریی و لاوان
بەزمانی کوردیی و عەرەبی دەری دەکا

ژمارە 10 تەموزی 1983

## لەم ژمارەیەدا





ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمینداریێتی گشتیی رۆشنبیریی و لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ـ ت : 20862

**لە یادی پازدەمین ساڵەی سەرکەوتنی شۆڕشی 17 — 30 تەمموزی مەزندا .**

# با هەرشەکاوە بێ ئاڵای شۆڕشی تەمووزی پیرۆز

گەلی عیراقمان لەم ڕۆژانەدا ئاهەنگو زماوەند دەگێڕی بە بۆنەی پازدەمین بیرەوەری سەرکەوتنی شۆڕشی 17 — 30 تەمموزی پیرۆز . ئەو شۆڕشەی کە لە بەرەبەیانی ڕۆژی 17ی تەمموزی ساڵی 1968 دا بەرپابوو لەهەمان ڕۆژیشدا پارتی بەعسی سۆشیایستی عەرەب بە مەزنترین شۆڕش هەڵسا لە مێژووی عیراقی هاوچەرخدا ، لەو کاتەی کە ڕژێمی کۆنەپەرستی ڕووخاندو ووردووخاشی کرد لە شۆڕشێکی سپیدا کە تەنانەت دلۆپە خوێنێکیش تێدا نەڕژاو بە سەرکەوتنی شۆڕش ئاسۆیێکی نوێ بۆ پێشکەوتنو پەرە پێدان کرایەوە لەبەر دەم گەلی عیراقو سەردەمێکی نوێ دەستیپێکرد لە برایەتیو ئاسایش لەگەڵ فرێدانی ڕژێمی کۆنەپەرست بۆ ناو زبڵدانی مێژووو گەلی عیراق لە ستەمو نوشستیەکانی رزگاری بو تا هەتایە .

شۆڕش هەر لە ڕۆژانی یەکەمی سەرکەوتنەکەیدا خەباتی دەکرد لەچەند بەرەیەکەوە بۆ ڕاستکردنەوەی لادانو دەرهێنانی ڕەگو ریشەی سەردەمەکانی پێشوو لە هەمان کاتدا بنیاتنانی عیراقێکی پێشکەوتوو بەختیار . ئەمەو شۆڕش سیاسەتێکی ڕاستو دروستی گرتە بەر بۆ چارەسەرکردنی باری ڕامیاییو ئابووریو کۆمەلایەتیو ڕۆشنبیری دەستیکرد بە بەردانی گیراوە سیاسییەکانو گێڕانەوەیان بۆ سەر فەرمانەکانیان لەگەڵ قەرەبوە کردنەوەی ئەو زیانانەی کە لێیان کەوتبو لەسایەی بارە ناهەموارەکانی رابردوو پاشان دەستی دایە تێکدانی دەزگاکانی تۆقێنیەرو دابلوسێنەرو بەندیخانەی «نوگرەسەلمان»ی داخست لەگەڵ داخستنی دەرگای گەلی بەندیخانەی ترو بەردانی گیراوەکانیان . هەنگاوی تریشی بە شوێن ئەم هەنگاوە خێرایانە داهات بۆ یەککگرتنی عیراقیەکانو یەکخستنیان لە بەرەیێکی دژ بە ئیمپریالیزمو نۆکەرانی لەگەڵ لەناو بردنی تۆڕەکانی سیخوڕی سەربەستیو دیموکراتیەت درا بەگەلو کیشەی کوردی چارەسەرکرا لەگەڵ کیشەی کەمایەتیە نەتەوەییەکان بە گیانێکی دیموکراتییانەو زانستیانەی بنیاتنەر بەم جۆرە کیشەی کورد بە دەرکردنی بەیاننامەی 11 مارتی مێژوویی ساڵی 1970دا چارەسەرکرا کە دانی بە مافی ڕەوای نەتەوەیی گەلی کوردنا بەوەی کە مافی بەڕێوەبردنی کاروباری خۆی هەبیو لەگەڵ بوونی مافی ئۆتۆنۆمیدا لە چوارچیوەی کۆماری عیراقدا .

شتێکی سروشتیش بو کە سەربەخۆیی ڕامیاری گەشە بە سەربەخۆی ئابووری بدات .

. بەم جورە شۆڕش ، ڕەویکی پاكو ڕاستو دروستی گرتە بەر . جا پاش ئەوەی کە شۆڕش توانی یەکێتی نیشتمانی وەدیبێنێ ریشەی سەرکەوتنەکانی داکوتا لەبەرەی سیاسەتدا بە دروستکردنی بناغەیێکی ئابووریی پتەو قاییم بۆ ئەوەی ببێتە بنچینەیێك بۆ سەربەخۆیی سیاسیو

کۆمەڵی بریاری شۆڕشگێڕانەی دەرکرد وەك جێبەجێ کردنی چارەسەر کردنی بنەڕەتی‌ی کشتوکاڵ لە ڕێگای دەست تێوەردانی یاسای کۆنی چارەسەر کردنی کشتوکاڵی لە 20 ئاپاری ساڵی 1969دا پاشان دەرکردنی یاسای نوێی ژمارە 117ی ساڵی 1970 کە زەبرێکی کوشندەی لە دەرەبەگی عیراقدا . بە نەهێشتنی دەرەبەگ گرنگترین بنچینەی ئیمپریالیزمو پاشکەوتن لە وولاتەکەماندا لە ناوچو .

شۆڕش بە سەرکردایەتی ڕۆڵە دڵسۆزەکەی کاك صدام حسین خەونی گەلی عیراقو هەموو پێشکەوتو خوازانی جیهانی وەدی هێنا لەو کاتەی کە زەبری کاریگەری وەشاند لە کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکانی نەوتی ئیمپریالی کە یاریان بە سامانەکانی گەلی عیراق دەکرد بە درێژایی دەیان ساڵ . شۆڕش یاسای ژمارە 80ی ساڵی 1961 هێشتەوەو لە تەمموزی ساڵی 1969دا نەوت بە شێوەیێکی نیشتمانی بەرهەم هێـزاو لە 1977/6/1دا کۆمپـانیای نـەوتی عیراق خـۆماڵیکـراو لە 1973/10/21 و 20/ 1973/12 بـەشی هۆڵەندەو پورتەغاڵ یەك لەدوای یەك خۆماڵی کرا پاشان بەشی بەرتیانیاو فەرەنسا لە کۆمپانیای نەوتی بەسرادا لە 1975/12/8 خۆماڵی کرا .

بە گەڕانەوەی ئەم سامانە مەزنو سەرەکی‌یە شۆڕش نەخشەی گەشەی تەقینەری کێشاو دەستی‌دایە پیشەسازی کـردنی وولاتو کردنی عیـراق بە دەوڵەتێکی پێشکـەوتـو لە پیشەسازیدا . لە هەمان کاتیشـدا شۆڕش گـۆڕینی بنەڕەتی ئەنجامدا لە دێهاتدا ، لە ڕێگای پەرەپێدانی سامانی کشتوکاڵ پاش‌ئەوەی کە پشت‌گوێ خرابو . هەروەها چاودێری کـردنی گشت جوتیارەکانو یارمەتیدانیان بە ئامێرو پەینو تۆو .. هتد لە پێویستیەکانی پێشخستنی سامانی کشتوکاڵی .

شۆڕش بە سەرکردایەتی تێکۆشەر کاك صـدام حسین خزمەتگـوزاریەکی زۆری بـەگەڵ پێشکـەش‌کرد . لە بـواری خزمەتگوزاریە گشتی‌یەکانیش‌دا شۆڕش دەستی داوەتە زۆر کـردنی ئەم خـزمەتگـوزاریانـە بۆ هـاوولاتیان ، بـۆ نموونـە خزمەتگوزاریەکانی تەندروستی زۆر فراوان بوونە بە مەبەستی نموونە هێنانیش :

[ژمارەی نەخۆشخانەکان کە 149 نەخۆشخانە بو لە ساڵی 1968 گـەیشتە 167 نـەخۆشخـانـە لە سـاڵی 1975 داو 203 نەخۆشخانە لە ساڵی 1981دا لە هەمان‌کاتدا ژمارەی قەرەوێلەکان لە 16,3 هەزار قەرەوێلە گەیشتە 22,1 هەزار قەرەوێلە پاشان بو بە 25,3 هەزار قەرەوێلە . جگـە لەمەش دەزگـاکانی تـەندروستی فراوانترو زۆرتر بوو ژمارەیان لە 933 دەزگا گەیشتە 1505 و 1745 دەزگا هەر لە هەمان‌کاتداو بۆ یەکەم جار عیاداتی پزیشکی‌ی میللی لە وولاتدا دامەزراو ژماراو ژمارەیان گەیشتە 55 عیادە لە سـاڵی 1975 داو 124 عیادە لە سـاڵی 1981داو لە ئەبخـامی ئەم پەرەپێدانە ژمارەی بزیشکەکان پەرەپێـدراو زیاد بـو لە ساڵی 1968دا 1759 پزیشك هەبو کە چی ژمارەیان گەیشتە 4478 پزیشك لە ساڵی 1975داو گەیشتە 5518 پزیشك لە ساڵی 1981دا] .

ئەمەو یاسای زامن کردنی تەندروستی لە لادێدا دانرا بۆ مسوگەر کردنی خزمەتگوزاریەکانی پاراستنو چارەسەرکردنی تەندروستی بۆ 70٪ی دانیشتوانی عیراقو ئەوەی شایانی باسە خزمەتگوزاریی تەندروستی بە شێوەیێکی خۆڕایی پێشکەش بە هاوولاتیان دەکرێت . جگە لەمەش شۆڕش گـۆڕینی بنەڕەتی پەیداکرد لە خزمەتگوزاریەکانی خوێندەواریدا وەك بە خۆڕایی کردنی فێرکردنو دەرکردنی هەردوو یاسای بە زۆری خوێندنو نەهێشتنی نەخوێندەواریی ئەم ژمارانەش نیشانەی ڕاستی‌یە لە قسەکانماندا :

[ژمارەی ساوایانی باخچەی ساوایان لە 14,5 هەزار ساوا لە سـاڵی 1968 — 1969دا گەیشتـە 35,3 هـەزار سـاوا لە سـاڵی 1974 — 1975داو 76,5 هـەزار سـاوا لە سـاڵی 1980 — 1981داو هەروەها لە هەمان‌کاتدا ژمـارەی باخچـەی ساوایـان لە 135 باخچە گەیشتە 203 باخچەو 387 باخچە .. ژمارەی قوتـابیانی خوێندنی سەرەتای لە 1,1 ملیون قوتابی لە ساڵی 1968 گەیشتە 1,7 ملیۆن قوتابی لە ساڵی 1975 داو 2,6 ملیـۆن لە ساڵی 1981دا] ژمارەی قوتابیانی خوێندنی دواناوەندی [لە 285,7 هەزار قوتابی لە ساڵی 1968دا گەیشتە 487,8 هەزار قوتابی لە ساڵی 1975داو 1,01 ملیۆن قوتابی لە ساڵی 1981دا] . خوێندنی پیشەییش لە وولاتدا پەرەپێدارا [ژمارەی قوتابخانە پیشەییەکان لە 36 قوتابخانە لە ساڵی 1968 گەیشتە 75 قوتابخانە لە ساڵی 1975داو 148 قوتابخانە لە ساڵی 1981دا . لە هەمان‌کاتدا ژمارەی قوتابیەکانی زیادبو و لە 8,6 هەزار قوتابی گەیشتە 23,3 هەزارو 53,2 هەزار قوتابی] هتد .

شۆڕش بایەخێکی مەزنی‌دا بـە مەسـەلەی سەکـەنو [تێکرای ئەو خانوانەی دەزگاکانی کەرتی سـۆشیالیستی بـۆ

هاوولاتیانی دروستکرد گەیشتە 11561 خانو لەنێوان ساڵانی 68 — 74دا .. ئەم ژمارەیە گەیشتە 96878 خانو لە نێوان ساڵانی 1975 — 1981] دا .

هەروەها ژمارەی سەرسوڕێنەری تر هەیە کە لە بوارەکانی خزمەتگوزاری دەردەکەون وەك ئاوو کارەباو ڕێگاوبان .. هتدو ئێمە بە ناوبردنی تەنها بەشێکیان وازمان هێناوە .

بۆ ئەوەی عیراق ببێتە دەوڵەتێکی بە هێزو سەربەخۆیی ڕامیاریو ئابووری پتەو بێت لە هەمان کاتدا ، شۆڕش بایەخی بە هێزە چەکدارەکان داوەو نوێ ترین و پێشکەوتوترین چەکی بۆ فەراهەم کردووەو سەرچاوەی جۆراو جۆری بۆ پەیداکردنی دۆزیتەوەو جگە لە پەیداکردنی دەستەی نوێ لە ڕیزکانیدا بە تواناییو لێها توویی سوپاکەمان بەوە دەرکەوت کە ئەفسانەی ناونراو بە «سوپای پێنجەم» لە جیهاندای تێکشکاند کە ئەویش سوپای ئێرانییە کە لە ماوەی چەند ڕۆژێك لەبەردەم زەبرو هێزی هێزەکانی چەکدارمان خۆی نەگرت لە پایزی ساڵی 1980 داو تا ئێستا هەر سەر شۆڕو هەلاتووە لەبەردەم زەبرو زەنگی سوپای بەرەو پێشی چوومان .

ئێمە لە کاتێکدا کە ئاهەنگ دەگێڕین لە بیرەوەری 15 ساڵەی سەرکەوتنی شۆڕشدا دووپاتی دەکەینەوەو دەڵێین شۆڕشی تەمموز ڕووداوێکی مێژوویییە لە ژیانی گەلی عیراقدا بە گشتیو گەلی کوردمان بە تایبەتی ، چونکە شۆڕش بایەخی بە کێشەی کورد داوە بە پێی بیرو ڕاکانی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبی مرۆڤانەو ئامۆژگاریەکانی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسینو پاش تێپەڕ بوونی کەمتر لە دوو ساڵ بە سەر سەرکەوتنیدا توانی گەلی کورد بۆ خۆی ڕابکێشێ بە تایبەتیش دوای دەرکردنی بەیاننامەی 11 مارتی مێژووی لە ساڵی 1970دا کە خواستە میللیەکانی گەلی کوردی جێگیر کردووەو هەموو مافە نەتەوەییە ڕەواکانی دان پیا ناوە بە مافی ئۆتۆنۆمییەوە لە چوار چێوەی کۆماری عیراقیدا . بەم جۆرە گەلەکەمان دەستکەوتێکی گرنگی وەدەست هێنا کە ملیۆنەها کوردی وولاتانی تر خەونی پێوە دەبینن و بە دەرکردنی بەیاننامەی ئازاری مێژوویی میری دەستیدایە ڕێکخستنو دامەزراوەکانی دەستووری بۆ دابینکردنی ئەم مافانەو کار پێکردنیانو بەرگری لێکردنیان ، چەندەها یاسا دانران وەك یاسای ئۆتۆنۆمی .

بێجگە لەبوونی دامەزراوەکانی یاسا دانانی ناوچەی کوردستان چەندەها بە ڕێوەبەرایەتیو دەزگای‌تر هەن کە بایەخ بە ڕۆشنبیری کوردی دەدەنو مافە نەتەوەیەکانی گەلی کورد بەرەوپێش دەبەنو دەوڵەمەند دەکەن وەك : «دەستەی کوردی لە کۆڕی زانیاری عیراقداو خانەی ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردیو بەڕێوبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی .. هتدو لەپاڵ ئەم دامەزراوانەش دامەزراوی ڕۆشنبیری تر هەن لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا لە سەروویانەوە ئەمنیداریەتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان کە ڕۆشنبیری کوردی بلاودەکاتەوە بە شێوەیێکی فراوان لە رووی چاپو یارمەتیدانی کتێبی نووسەرانی کوردو ڕێکخستنی کۆڕی ڕۆشنبیریو هاندانی تیپەکانی هونەریو شانۆییو دەرکردنی گۆڤاری «کاروان» جا لە کاتەی کە دەبینین کوردی وولاتانی دراوسێ بێ بەشن لە گۆڤارو ڕۆژنامە بە زمانی کوردی هەروەها لە خوێندن بە زمانی کوردی . لەم کاتەدا دەبینین کوردەکانی عیراق پتر لە ڕۆژنامەیێكو گوڤارێکیان هەیە وەك : کاروان ، هاوکاری ، بەیان ، ئۆتۆنۆمی ، ڕۆشنبیری نوێ ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق/ دەستەی کودی ، نووسەری کورد ، عیراق .. هتدو خوێندنیشیان بە کوردییە لە قوتابخانەکاندا . هەروەها لە کاتێکدا کە کورد لەو وولاتانەدا هیچ بەرنامەی تەلەفزیۆنیان نییە کەچی حکومەتی شۆڕش ئێزگەی تەلەفزیۆنی تایبەت بە کوردی داناوەو نبکەکەی لە شاری کەرکوکی سەر بە پاریزگال تەئمیمەو بەرنامەی ڕۆژانەی جۆراوجۆر پێشکەشی دەکات — ئەمە جگە لە پێشخستنی ئێزگەی کوردی لە بەغدادا ، پاشئەوەی کە بەرنامەی ئەو ئێزگەیە لە چەند سعاتێك تێنەدەپەڕی لە سایەی حکومەتەکانی پێشو . ئێستاکە پرۆگرامەکانی زۆربەی سعاتەکانی ڕۆژو شەو دەخایەنێ .

ئەمەو لەوەتی ڕۆڵەی تێکۆشەر کاك صدام حسین سەرۆکایەتی کۆماری عیراقی وەرگرتووە ، گەلی عیراق گەلێ دەستکەوتی گرنگی وەدەست هێناوەو ڕێگای بەرەو پێش چوون چاکتر بۆی خۆش کرا . ئا لە دوای بوونی تێکۆشەر صدام حسین بە سەرۆکی کۆمار ، ئەنجومەنی نیشتمانی لە ئەنجامی هەڵبژاردنێکی سەربەخۆ هاتەدی ئەمەو جگە لە هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان بە

شێوەیێکی سەربەخۆ ، هەروەها مووچەی فەرمابنەران زیادکراو خۆش و بەختیاری سەرانسەری عیراقی داپۆشی . سەرۆکی فەرماندە لە هەمانکاتدا راستەو خۆ بایەخێکی گرنگی بە ویژەو رۆشنبیری هونەری کوردی داوەو دەدات . بەڵگەیێکی درەو شاوەی ئەمەش دانیشتنی لەگەڵ کۆمەڵێك رۆشنبیری کورد لەخانەی رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردیدا بەر لە چەند مانگێك و رێزلێنانی دەستەیەك هونەرمەندی کورد پاش ئەمەو جاودێری کردنی بێهاوتای ویژەو هونەری کوردی جگە لە چەندەها جار سەردانی بۆ ناوچەی کوردستان و بەخشینی پارەی زۆر بۆ جۆرەها کەرت و پرۆژەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمی .

شتێکی ئاسایی یە کە باری باش و پێشکەوتووی کوردەکانی عیراق کار بکاتە سەر کوردەکانی هەندەران و وولاتانی دراوسێ بە تایبەتیش ئەو وولاتانەی کە ژمارەیێکی زۆری کوردیان تێدایە وەك کوردەکانی ئێران . بەم جۆرە کوردی عیراق بوونەتە مایەی سەرنج راکێشانی هەموو کوردەکانی جیهان و لەجیانی ئەوەش کە حکومەتەکانی ئەم وولاتانە گوێ بۆ داخوازی کوردەکان شلبکەن بە تایبەتی حکومەتی ئێران لەباتی ئەمە بە بەکارهێنانی توندو تیژی وەلامی کوردەکان دەدەنەوە ، لەماوەی کەتێیدا خومەینی جلەوی فەرمانرەوای لە ئێران لەدەست دایە بە کۆمەڵ کوشتنی کوردەکان رێکخراوەو دووا قەسابخانەشیان لە سێدارەدانی 59 هاوولاتی کورد بو لە شاری مەهاباددا . خۆ باری کوردەکانی سوریاش زۆر چاکتر نی یە لە باری کوردەکانی ئێران هەر لەوەتی دەستەی حافز ئەسەد خۆی سەپاندووە بەسەر دەسەلاتداری لە سوریادا کوردەکانی ئەوێ بارێکی ناهەموارو پڕ لە ئە شکەنجە دەبەنە سەرو روو بە رووی تووانەوەی نەتەوەیی و سڕنیەوەی بوونیان بوون لەگەڵ بەربەرەکانی کردنیان بە هەموو شێوەیێکەوە ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە چۆن تاقمی حافز ئەسەو ئۆتۆنۆمی ی بۆ کوردی عیراق بە دروست کردنێکی «ئیسرائیلی دووەم» لە وولاتی عەرەبدا لە قەلەمدا لە سەرەتای هەفتاکاندا .

لەبەر ئەم هۆیەو چەندەها هۆی‌تر هەردوو حکومەتی ئێران و سوریا دەستیان دایە پیلان نانەوە دژ بە شۆرشی 17ی تەمموز هەر لە رۆژانی یەکەمی سەرکەوتنیەوە تا ئەمرۆ هەرەشە لە شۆرشەکەمان دەکەن و پاڵپشتی نەیاران و ناحەزان دەکەن بۆ ئازادانی و لەناوبردنی ئەو دوو رژێمە پەیمانێکی گومان لێکراویان بەستووە دژی شۆرش 17 تەمموزو پارتە سەکردەکەی ، دوژمنکاری هەرەشەیان دژ بە پارت و شۆرش گەیشتە رادەی دەست تێوەرانی چەکدارانە لەو کاتەی کە رژێمی ئێران بەر لە نزیکەی سێ ساڵ هێرشی چەکداری کردە سەر وولاتەکەمان بە لێدانی گوندو شارەکانی سنووریمان وەك سەرەتایێك بۆ داگیرکردنی تەواوی وولات و لێدانی رژێمان و دەست بەسەراگرتنی دەستکەوت و مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردمان کە بە تێکۆشانێکی سەختی خوێناوی و لە سایەی شۆرشی 17ی تەمموز دەستگیری کردبو . جا پاش ئەوەی کە رژێمی ئێران نەیتوانی داگیر کردنەکە وەدەس بهێنێ و پاش ئەوەی کە تووشی بەزینێکی بێ وێنە بو لەبەردەم دەستەکانی سوپای دلێرمان ئەوسا هەندێ هێزی‌تر هەولی رزگارکردنی و هاوبەشی کردنیانی‌دا لە دەست درێژی کردنە سەر وولاتەکەمان ، قەوارەی زایۆنیزم بەر لە دوو ساڵ کارگەی ئۆتۆمی عیراقی لێداو دوژمنکاری رژێمی حافز ئەسەد بەرامبەر بەرژێمان گەیشتە ئەوپەری ، لەو کاتەی کە رێگەی تێپەربوونی نەوتی عیراقی لە خاکی سوریادا . بەم جۆرە ناحەزان شەوو رۆژ لە کۆشش‌دان لەپێناو لەناوبردنی شۆرش 17ی تەمموزی پیرۆزو زەوتکردنی هەموو ئەو دەستکەوتوانەی کە شۆرش بەدی‌هێناوە بۆ تێکڕای جەماوەری عیراق و گەلی کورد بە تایبەتی . ئێمە بڕوامان بە تینە بەوەی کە شۆرشی 17ی تەمموز بە سەرکردایەتی بەرپاکەرە ئازاو زیرەکەکەی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب و رۆڵە دلێرەکەی صدام حسین هەرسەردەکەوێ لە گشت جەنگەکانی داهاتوودا دژ بە خومەینی‌ی جادوگەر و حافز ئەسەدو قەزافی‌ی نەیار بەرامبەر بە رژێمان وەك چۆن شۆرش لە جەنگی خۆماڵی کردنی نەوت و .. هتد سەرکەوتنی هێنایەدی بۆیە سەرکەوتن هەر بۆی دەبێ لە جەنگەکانی داهاتوودا .

بژی یادی شۆرشی 17ی تەمموزی پیرۆز .

پتەو بێت کاروانی ئۆتۆنۆمی . تەمەنی درێژ بۆ سەرۆکی فەرماندەو سەرکەوتنی هەمیشەیی بۆ شۆرش .

**«دەستەی نووسەران»**

به بۆنەی یادی پانزەهەمینی شۆڕشی (17 — 30) تەمووزی پیرۆزەوە ، نوێنەری گوڤارەکەمان چووە دیدەنیی هەندێ لە کاربەدەستان و لەو بارەیەوە چەند پرسیارێکی لێکردن کە ئەمانە وەرامەکانن و لە گەڵ سوپاسماندا بۆ ئەو بەڕێزانە بڵاویان دەکەینەوە :

# بەڕێز عبداللە اسماعیل وەزیری دەوڵەت

**«لە گەرمەی ئاهەنگ گێڕانماندا بە بۆنەی جەژنەکانی تەمووزەوە ، خۆشحاڵ دەبین گەر ڕای بەڕێزتان بزانین دەربارەی بەشداری کردنی گەلی کوردمان لە سەرجەمی کاروانی شۆڕشگێڕی وولاتداو ئەو دەورەی بینیویەتی لە پاڵپشتی کردنی جەنگی «قادسیەی صدام»دا .. هەر لە سەرەتای بەرپا بوونی شۆڕشی 17 — 30 ی تەمووزی ساڵی «1968»ەوە تاوەکوو ئیمرۆ » ..**



که دیین باسی خەباتی ناوکۆیی کوردو عەرەب بکەین ، دەبێ بگەڕێینەوە سەر باسی پەیوەندی نێوان ئەو هەردوو نەتەوەیە کە پتر لە هەزار ساڵ لەمەوپێش بە هۆی ئایینی ئیسلامەوە دروست بووە ، جا لەبەر ئەوەی کە نەتەوەی کورد هەر لە سەرەتاوە ئەم ئایینە پیرۆزەی بەدڵ قەبووڵ کردووەو هەتا ئێستاش دینداریو بەجێهێنانی دابو نەریتو دەستوورو فرمانەکانی ئیسلامەتیو پاراستنی ڕەوشتە باشەکانی وەکو ڕاستگۆییو دەستپاکیو سەرڕاستیو خۆ لە حەرام لادانو هەر شتێکی پێچەوانەی ئامۆژگاریەکانی ئەم ئایینە پیرۆزە لەناو کوردەواریدا بایەخێکی تایبەتی هەیەو گەورەو بچووك فرچکی پێوە گرتووە .. ئەمە بە جۆرێك کوردی بە عەرەبەوە لکاندووە کە هەر خێرو خۆشییەکی بۆخۆی ویستبێتی بۆ ئەویشی خواستییە ، وەهەر شتێك ئەوی نیگەران کردبێ ئەمیشی پێ نارەحەت بووەو لە هەموو خۆشیو ناخۆشییەکیشدا هەر پێکەوە بوون .

لە سەردەمی پەرەسەندنی بزووتنەوەی رزگاری هێنەری نەتەوایەتیی عەرەبیشدا کە لە شەڕی یەکەمی جیهاندا گەیشتبووە پۆپەکەی ، دیسان نەتەوەی کورد هاو ئامانجو ئاواتو یارمەتی دەری بووە .. لە ساڵی 1920دا کە لە خوارووی عیراقدا شۆرشی دژ بە دەسەڵاتی ئینگلیز بەرپابوو ، زۆر بە خێرایی لە کوردوستان دەنگی دایەوەو جەماوەری کوردیش بەرەنگاری داگیراکەران بوونەوەو لە زۆر لە ناوچەکانی کوردوستاندا دەستیان لە نوێنەرەکانی ئینگلیز وەشاند ، لە ئەنجامدا زۆر لە شارو دێهاتەکانی بۆمباران کرانو ژمارەیەکی زۆریشی لە خەڵکی ئەو ناوچانە تێدا چوون .

لە پاش دامەزرانی دەسەڵاتی ناوخۆیی «الحكم الاهلي»ش گەلی کورد لە خەباتی نیشتمانی دژ بە داگیر کەرو کۆنەپەرستیی عیراقدا هیچ کاتێك دوورە پەرێز نەوەستاوەو لە

هەموو چالاكیو ڕاپەڕینو خۆبەخت كردنێكدا شان بە شانی گەلی عەرەبی برایو هێزە سیاسییە نەتەوە پەروەرو ئازادیخوازەكانی عیراق وەستاوە بەبێ ئەوەی ئەو هێزە سیاسیانە لە پالپشتی كردنی هێنانە دیی ئامانجە نەتەوایەتییەكانی گەلی كورد هەلوێستێكی برایانەی ڕوونو ئاشكرایان هەبووبێت ، گەلی كورد ئازایانەو بێ سلەمینەوە لە هیچ ڕاپەڕینو خۆبەخت كردنێكدا درێغی نەكردووە ، وەنەبێ ئەو بڕوایەی كورد بەو یەكیەتی چارەنووسەی لەگەل عەرەبدا هەر لە سنووری عیراقدا بووبێتو بەس : بەلكو ئەو هەستو بڕوایەی لەوەش تێپەڕیووە ، بۆوێنە : لە سالی 1948دا لە شەڕی ڕزگاریی فەلەستیندا كەرخی جەنگاوەرە كوردەكان دیاربووەو تا ئێستاش لەبیر نەچوویەتەوە ، وە لە هێرشە ئیستعماریی یە سێ قۆلییەكەی سالی 1956دا بۆ سەر گەلی میسر ، گەلی كوردیش شان بە شانی گەلی عەرەبی برای لە عیراقدا توڕەییو نارەزایی خۆی بە مانگرتنو خۆپیشاندان دەربڕیووەو زۆریش لە ڕۆلە تێكۆشەرەكانی لە ئەنجامی ئەوەدا دووچاری ڕاونانو دەربەدەریو گرتنو ئازارو ئەشكەنجە بوون .

جا گەلی كورد بەبێ ئەوەی هەستی بە هیچ پالپشتی كردنێكی ڕوونو ئاشكرا لەگەلی عەرەبی برایو هێزە نیشتمانییەكانی عیراق كردبێ بۆ هێنانە دی ئامانجە نەتەوایەتییەكانی ، كەچی لەگەل ئەوەشدا ئەوەی باسمان كرد هەلوێستی بووبێ بەرامبەر نەتەوەی عەرەبو نیشتمانی عیراق ئیتر ئەوە شتێكی زۆر ئاساییە كە لەگەل هاتنی شۆڕشی «17 — 30» تەمووزی 1968دا بە سەركردایەتی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست ڕوو بكاتە شۆڕشو بە هەموو هێزو توانایەكییەوە پالپشتیی لێ بكاو تێكەلی ببێو بەشداری چەسپاندنو بەرەو پێش بردنو خەملاندنی بێت ، چونكی ڕابەرە سیاسییەكەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی كورد لەپێش بەرپا بوونی شۆڕشدا ئاشناییو پەیوەندییەكی تەواوی لەگەل سەركردایەتی شۆڕشدا هەبووو لە ئامانجە گشتییەكانی ئاگاداربوو بە تایبەتی ئەوانەی دەربارەی مەسەلەی كوردو چارەسەركردنی كێشەكەی بوون لەسەر بنچینەیەكی دیموكراسیانە ، بۆیە هەر لەگەل هاتنە كایەی شۆڕشەوە بزوتنەوەی نەتەوایەتی دیموكراسی كورد بارو بارخانەی خۆی لێناو بێ ئەوەی گوێ بداتە هاژو هوژوو تیرو توانجی هەندی تاقمی كرچو كالو ئەوانەی چاویان لەبەر پێی خۆیان بەولاوە بڕ ناكات ، لەگەل كاروانی 17 — 30 ی تەمووز بەرەو قۆناخی چەسپاندنی شۆڕشو وەدەست هێنانی سەربەخۆیی تەواوی ئابووریو سیاسیو كۆمەلایەتیی گەلو وولاتو چارەسەركردنی مەسەلەی كورد لەسەر بناغەی ئۆتۆنۆمی ، بێ ووچان كەوتەڕێ ، شۆڕش هەر لە سەرەتاوە دەستی كردە چارەسەكردنی گیرو گرفتە ئاساییەكانی عیراقو بناغە دانان بۆ یەكلا كردنەوەی كێشە دژوارەكانی ..لە مەیدانی مەسەلەی نەتەوایەتی كوردیش هەر بە زوویی چەند دەسكەوتێكی وەكوو دامەزراندنی زانكۆی سلیمانیو كردنی دهۆك بە پارێزگایایەكی سەربەخۆو گەلی شتی تری وەدەست هێنا ، هەلوێستو ڕێڕەوی ڕاستی شۆڕش كارێكی ئەوتۆی كردە سەر ئەو تاقمەو دەستانەی كە لە سەرەتاوە دوورە پەرێزو نارازی وەستابوون ، كە لە پاش ماوەیەكی كەم بە ناچاری مل بە هەق بدەنو لە كەنارەكی كاروانە چوستو چالاكەی شۆڕش ووردە ووردە دوورو نزیك بەدوای بكەون ، یان هیچ نەبێ كۆسپو تەگەرەی نەهێننە ڕێگاوەو ، لەدواییدا هەندێكیان بە گەلی بكەون ، بەمەیش تینو تەوژمی شۆڕش بە جۆرێكی وا پەرەی سەند كە بەبێ سلەمینەوە بەرەنگاری كێشە دژوارەكانیش ببێتەوە وەكوو چارەسەركردنی مەسەلەی كورد لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی بەپێی بەیاننامەی یازدەی ئادارو لەبەردەست دەرهێنانی سەروەتو سامانی نیشتمانیمان لەدەست كۆمپانیا چاو چنۆكەكانی سەر بە ئیمپریالیزمو ئەویش لە ڕێگەی خۆمالی كردنی هەلهێنجانو فرۆشتنی نەوتو چارەسەركردنی بنەڕەتیی مەسەلەی كشتوكالو دانانی زۆر لە یاسای پێشكەوتوو شۆڕشگێرانەی وەكوو ئەوەی لەمەڕ كرێكارانو سیگورتەی كۆمەلایەتیو زێدە كردنی مووچەی كرێكارو فەرمانبەرانو بەكار خستنی هەموو كاركەرێكو پەیداكردنی دەرامەتی بۆ هەر پیرو پەككەوتەیەك كە توانای ئیش كردنی نەبێو دامەزراندنی زۆر لە كارگەو پرۆژەی پیشەسازیو ئاوەدان كاری .. ئەم سیاسەتە ڕاستەو ڕەفتارە خزمەت گوزارەی شۆڕش بەگەلو وولات بە ڕادەیەك دوژمنانی پێشكەوتنو سەربەستی گەلانی لە ئیمپریالیزمو نۆكەرانی ورووژاند ، كە هەرچی لەتواناو دەسەلاتیاندا هەبێ بۆ وەستاندنی كاروانی شۆڕش یان لە ئامانج لادانی یان هیچ نەبێ

ـــوو کرنی بیخەنە کار ، لە پێشەوە نۆکەرانی ناوخۆو دەورو ەرین بەو نیازە گلاوە بە گژدا کرد کـە هەرچی کـردیان بێ سوودو بە هیچ دەرچوو ، ئینجا هاتن بـە هەمـان نیاز رژێمی کۆنەپەرستی خومەینی جادووگەریان لێ هاندا بۆ گرو گێچەل تێ ئالاندنی ، کە ئەمیش ئەوە نزیکەی سێ ساڵە سـەرگەرمی ئەنجامدانی ئەو نەخشەو پیلانە گلاوەیە بێ ئەوەی لەوە پتری ی بکرێ کە بزن بە قـۆچ هەوڵی کـەلکردنی چیـای سەفینی کوردوستان بدات .

وەکـوو دەبینین گـەلی کورد لە کـوردستانی عیـراق لە سایەی شۆرشی 17 — 30 ی تەمووزی پیرۆزدا شـۆرشی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست بـە سەرۆکـایەتی سـەرکردەی هەڵکەوتوو کاك صدام حسین بە ئۆتۆنۆمی گەیشتووە ، ئەمە لە کاتێکدا کە لە پارچەکانی تری کوردوستـاندا رێگـەی ئەوەی پێنادرێت کە خۆی بە کورد ناو ببات یان بە ئاشکرا بە زمانی خۆی بدوێت نەخوازەلاکە داوای شتێك لە مـافی نەتـەوایەتی خۆی بکات . هەرچەنـدە زۆریش سادەبێ ـ خێـرا دووچاری کوشتن‌و برین‌و گرتن‌و راوەدوونان دەبێت ، خۆ ئەگەر داوای جۆرێك لە خودموختـاری بکات ئـەوا بە لەنـاوبردنی گشتی‌و وێرانکاری شارو دێهاتەکانی وەلام دەدرێتەوە ، هەر وەکوو لە کوردوستانی ئێران رەفتاری لەگەلدا دەکرێت ..

جا کە ئەو هەل‌و مەرج‌و باری ژیانەی ئێستای خەلکی کوردوستانی عیراق بەری ئەو خەباتە ناوکۆیی‌یە پرلە کـون‌و کەلەبەرەی گەلی کورد بێ لەگەل شۆرشی 17 — 30 ی تەمووز ، ئەگەر ئەو کون‌و کەلەبەرانە پر بکرێنەوە ئەوا بێ‌گومان هەل‌و مـەرجی گەلێـك لەمـەی ئێستـاش بـاشتـر بـۆ گـەلی کـورد هەلدەکەوێ ، جگە لەوەش بە لەبەر چاو گرتنی راستی‌یەك کە لە هەموو لایەك روون‌و ئاشکرایە ئەویش ئەوەیە :ـ

ئەگەر نەتەوەی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردوستان سەرپشك بکرێ لە هەلبـژاردنی یەکێـك لەو نەتـەوە جۆر بـە جۆرانەی کە بە یەکەوە دەژیەن ئەوە بێ گومان لەنێو هەمووانداا نەتەوەی عەرەب بەگەن دەکات ، وە لە نێـوان هەمـوو هێزو دستـەو کۆمـەلە نـەتـەوە پـەروەرەکـانی عـەرەبیش‌دا بـە تاقیکردنەوە ساغ بۆتەوە کە تاکە هێزێك لە وانە بتوانی وەکوو نەتەوەیەکی جیا رەفتا لەگەل گەلی کورد دا بکـا هەر پـارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستە ، کەوابوو دەبێ گەلی کورد ئەو

هـەلە لەدەست نەدا کـە شـۆرشی 17 — 30 ی تـەمـووز بـۆی رەخساندووە ، وە پەرە بە خەباتی ناوکۆیی بداو بە هەموو هێزو تواناو بـە گشتی‌و گەلێـك لە رابردوو بـە تەوژمتـر دەست لە دەست‌و پشت بە پیرۆزی خـەباتی نـاوکۆیی لەگـەل کاروانی شۆرش بە سەرکردایەتی سەر قافلەچی‌یە لێهاتووەکەی هەتا قۆناخی دوایی کە کردنی عیراقە بە قەلایەکی سەختی پۆلایینی لە شکاندن نەهاتووی هەردوو نـەتە وەی کـوردو عەرەب بـۆ وەدەست هێنانی دوا رۆژێکی خۆشترو ژیانێکی کامەرانتـر بۆ هەردوو نەتەوەی برا .

کە ئەو راستی‌یانەی باسمان کردن وایان لە نـەتەوەی کورد کردبێ کە بە درێژایی مێژوو پشتی نـەتەوەی عـەرەبی بەرنەدابێ ، دەبێ لەمەودواو لەو سەردەمەدا لەژێر سێبەری شۆرشی 17 — 30 ی تەمووزو سەرکردایەتی کاك صدام حسین دا بەگشتی‌و کوردانە قۆل‌و باسکی دلێرانەی لێ هەلمالین‌و کالك‌و گۆریانی لێ هەلکێشین‌و لەگەل کاروانی شۆرشدا بۆ پێشەوەو بەرەو ئەو قۆناخە برۆین . لەوەش دلنیاین کە کاروانێك کاروانی یەککرتووی کوردو عەرەب بێ‌و ئەو هەموو قۆناخە دوورانەی بریبێ‌و بەسەر ئەو هەموو کۆسپ‌و تەگـەرە سەختـانەدا زال بووبێ‌و ئەو ئامانجە پیرۆزەی هەبێ‌و سەرقافلەچی‌یەکی ئەوها لێهاتووو شارەزاو دنیا دیدەو زرنگ‌و ئازاو چاونەترسی وەکـوو کاك «صدام حسـین»ی تێکۆشـەری هەبێ ، ئـەوا هەرگیـزاو هەرگیز شەوی تاریك‌و ئەنگوستە چاوو سەرماو سۆل‌و بەفرو باران‌و قورو چلپاوو سەختی رێگەو شیوو دۆل‌و چیاو هەلدێرو جـەردەو رێگر ، بگـرە رێگە هـەلەکردن‌و یـان لەرێگە لادانی هەندێکیش لە کاروانچیان ئەو کاروانە راناگرێ ، با هەندێك لە ماندوویەتی کۆل بدەن‌و بووەستین ، با هەندێکی‌تر رێگە هەلە بکەن یا بە ئەنقەستیش ملی کوێرە رێیان بگرن لە دواییدا هەر دێنەوە سەر شەقامە رێ‌یەکە ، ئەوەی نەشیەوێ بێتەوە سەر رێگەی راست ئەوە لە ئەنجامدا توون بە توون دەچی هەرچەندە هیوادارین ئەوانیش بێنەوە سەر شەقامـە رێ‌یەکـە کە هـەتا زووتر هەموو لایەك بە یەکەوە بگەینە ئەو قۆناخەی کە ئامانجی پیرۆزی هەموو خێر خوازێکە بـۆ ئەوەی لێی بحـەسێینەوە ، بەلام نابێ بارو بارخانەکـانمان بـە تەواوی هـەلبوەشێنـین‌و کەرەستەو تفاقی کاروانمان پەرش‌و بلاو ببیتەوە بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا بە دەست‌و برد کاروان ساز دەینەوە ..



# بەڕێز
# هاشم عقراوی
# وەزیری دەوڵەت

● تکامان وایە بە بۆنەی بیرەوەری‌ی پانزەهەمینی شۆرشی (17 — 30) تەمووزی پیرۆزەوە باسێکی گرنگترینی ئەو دەسکەوتانەمان بۆ بکەیت کە شۆرش بۆ گەلی عیراقمانی بەدی هێناوە .

- بێگومان کە باسی شۆرشی «17 — 30» تەمووز بکەین ، دەبێ باسی وولاتی خۆمان بکەین پێش شۆرش ، تاوەکو بزانین چۆن بووەو گیروگرفتەکانی چی بوون ، هێزە نیشتمانیەکان داوای چیان دەکردو باری ئابووری‌و سیاسی وولات چۆن‌بوو ، جا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پێش شۆرشی «17»ی تەمووز ئەوەد بە ئاشکرا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە وولات بەرەو رووی جۆرەها گیروگرفت ببووەوە ، هێزە نیشتمانی‌یەکان نەیان دەتوانی بە تەواوی رێك بکەون لەسەر بەرنامەیەکی کاری نیشتمانی لەهەمان کاتیشدا شەری براکوژی لە ئارادا بوو لە نێوان عەرەب‌و کوردا ، یان راستر بڵێین لە نێوان رژێمەکانی پێش شۆرش‌و کوردەکان ، باری ئابووری وولات رێك نەبووو کۆمپانیا مۆنۆپولەکانیش هەر بەردەوام بوون لەسەر رفاندنی سامانی وولاتەکەمان‌و گیرفانی خۆیانیان لێ پر دەکرد ، لە هەمووشتێ گرینگتریش ئەوەبوو کە ئەوسا سەربەخۆیی نیشتمانی لە وولاتدا نەبوو بەو شێوە فراوانەی کە مەبەستە . بەڵکو ئیرادەی میللەتی عیراقیش لەدەست میللەتەکەدا نەبوو . ئیتر کە شۆرشی «17 — 30» تەمووز بەرپابوو ئەو هەموو کێشەو گیروگرفتە لە ئارادا بوون‌و پێویستسان بە چارەسەری هەبوو ..

مەعلوومە بارێکی واقورس بە قەناعەتی ئێمە دەبێت فیکرییەکی زۆر روون هەبێت لەسەر ئەم گیروگرفتانە . هۆیەکانی چین وە لە بەرچی‌و چۆن چارەسەر دەکرێ .

وەکو دەزانین شۆرشی «17»ی تەمووز بە سەرۆکایەتی

حیزبی بەعسی عەرەبی سوشیالیست دامەزرا ، وە ئەم حیزبەشی حزبێکی نیشتمانیو نەتەوەیی بوو لە وولاتەکەماندا و شارەزایی یەکی چاکی هەبوو لە بارەی ئەم هەموو مەوزوعانە ، بۆیە یەکەم شت پێویست بوو مەسەلەی سەربەخۆیی وولات جێ بەجێ بکات ، چونکە ئەگەر وولات بە شکڵێکی فراوان رزگاری خۆی وەگیر نەکەوێو بڕیارەکەش لە دەست میللەتەکە نەبێت بە قەناعەتی ئێمە ناتوانێت هیچ هەنگاوێك بنێت بۆ پێش کەوتنی کۆمەڵو میللەت ، ئەمەش کردارێکی ئاسان نەبوو ، بە تایبەتی لەو بارە سیاسی یەی کە هێزە نیشتمانی یەکان لە نێوان خۆیاندا ناکۆکیان هەبوو لە گەڵ

ئەوەشدا شۆرش بە شکڵێکی زانستانە کەوتە چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە ، ئێمە لێرەدا دەتوانین بپرسین ، چۆن رزگاری بەدی دێت ، بێگومان بۆ ئەنجامدانی ئەم مەبەستە دەبێ هیچ

جۆرە دەسەلاتێکی دەرەوەو بێگانە نەمێنێت لە وولاتداو رەگو ریشەی ئەوانەش بنەبڕ بکرێت کە بەرژەوەندیان لەگەڵ بێگانەدا رێك دەکەوێو بنکەکانیان نەهێڵدرێن .. وە گرنگترین شت لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە کە دەبێت یەکیەتی نیشنمانی جێ بەجێ بکرێت .

شۆرش بەرەو ئەم رێگایە رۆیشتو توانی پاش ئەرکێکی زۆرو پاش ئەوەی کە تووشی زۆر پیلان بوو ، چونکە دوژمن بە تەواوی لەوە تێگەیشتبوو کە بیروباوەڕو نیازی ئەم شۆرشە چی یە . ئیتر کەوتە پاككردنەوەی وولات لە نۆکەرەکانو لە پاشدا رووی کردە چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد ، ئەو مەسەلەیەی چەندین ساڵ بوو بەو رادەیە گەیبوو کە دەتوانین بڵێین چارەسەر نەدەکراو ئەوەش هۆی تایبەتی خۆی هەبوو لە لایەك سەرکردایەتی خێلەکی نێو بزووتنەوەی کورد توانی دەست بە سەر بزووتنەوەکە دابگرێتو تەیاراتی فیکری نێو ئەم بزووتنەوەیە ناکۆکی یەکی زۆریان هەبوو ، کە دەشلێین تەیاراتی فیکری واتە ئەو پێکهاتنەی بزووتنەوەی کورد هێندە سەیربوو بە جۆرێ کە رێکوپێکی یەکی تیادا بەدی نەدەکرا وە ئەو رژێمانەی پێشووش نیازی ئەوەیان نەبوو بە شێوەیەکی بنەڕەتی ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەن چونکە لە بەرژەوەندی تایبەتی یاندا هاوبەشی یەکتری بوون بە یەکتریشەوە بەسترابوونەوە بیرکردنەوەیشیان بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکە لە سفوورێکی تەسكو کاتیدا دەخولایەوەو بەس بۆ ئەوەی تەنها خزمەتی ئامانجەکانیان بکات نەك بە شێوەیەکی نیشتمانی فراوان کە دان بنێت بە مافو شەرعیەتی میللەتی کورد ، بەڵکو هەتا باوەریان بە مافی مرۆڤایەتی میللەتەکەش نەدەهێنا .

لە لایەکی تریش هەندێ لایەنی دەرەوەیش دەستیان خستبووە نێو کاروباری وولاتو وای لێهاتبوو کێشەکە ئاڵۆزتر بێتو رێگە لە بەردەم چارەسەرکردنی مەسەلەی کورددا تەسكتر ببێتەوە .

شۆرشی «17»ی تەمووز ئەم شتانەی لەلا روون بووو پێویست بوو لەسەر بناغەیەکی راستو دورست چارەسەریان بکات . بۆ ئەوەی بتوانێت هەنگاوی گرنیگ گرنیگ بهاوێژێت بۆ جێ بەجێ کردنی هەموو گیروگرفتەکانی تر .

لێرەدا نامانەوێ باسی ئەم هەموو شتانە بکەین چونکە لە راستیدا ئەڵقەیەکی بەسەریەکەوەو نەپساوەی زۆر دوورو درێژە بەڵکو دەتوانین بە بۆنەی بیرەوەری بەرپا بوونی شۆرشی «17 — 30» تەموزەوە زیاتر لە بارەی مەسەلەی کوردەوە بدوێینو باسی لێوە بکەین .

هەرکە شۆرش بەرپابوو یەکەم شت کە پێویست بوو بیکا دان نان بۆ بە هەقی میللەتی کورد بە شکڵێکی دەستووری بۆ ئەوەی بتوانێت لە چوارچێوەی ئەم دەستوورەدا شتی تر بنیادبنێت ، ئەوەبوو کە کەوتە گفتوگۆکردن لە گەڵ سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد زۆر چاك لەو بارە پڕ کێشەو ئاڵۆزەی نێو وولاتیش ئاگاداربووو دەیزانی ، بەلام شۆرش توانی بە باشی ئەم دوو مەسەلەیە گرینگە لە یەکتری جیا بکاتەوە ، مەسەلەی سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردو ئەو تەیارە کۆنەپەرستەی کە خۆی بە دوژمنانی میللەتی کوردەوە بە ستبووەوە و لە لایەکی تریش ئەمە جیا بکاتەوە لە میللەتی کورد خۆی کە میللەتەو هەموو مافێکی خۆی هەیە لە سنووری ئەم وولاتەداو بە ئۆتۆنۆمیش نەبێت چارەسەری ئەم کێشە

نەتەوایەتی یەی تەواو نابێت و ئیتر هەر ئەوەش بوو کە کرا .. ‘

کاتێ کە بە بیاننامەی «11»ی ئاداری 1970 دەرچوو ، ئەگەر بە چاکی لێی وورد ببینەوە ئەوە بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ کە هەمووی باسکردنی ماف میللەتی کوردە . وە هەمووی ئیلتزاماتی شۆرشە بەرامبەر بە میللەتی کورد . جا هەر لەو رۆژەوە کە ئەم بەیاننامەیە ئیمزاکرا ، سەرکردایەتی بزووتنەوەی گەلی کورد کە باسمان‌کرد ، زانی کە شۆرش دەیەوێت ئەو بەرەیەی وا لە ژێر قاچیانەو بە ساختە لە سەری‌یەوە وەستاون رای بکێشێت .. ئیتر هەر کە بەندێك لە بەندەکانی بەیاننامەکە جێ‌بەجێ دەبوو بەرەکە زیدەتر لەژێر قاچیان دەردەچوو ، لە بەر ئەوە ئەو سەرکردایەتی‌یە زۆر هەوڵی‌دا کە ئەم بەیاننامەیە جێ‌بەجێ نەکرێ ، بەلام هەمدیسان نەفەس درێژی‌و بیروو باوەڕە چەسپاوەکەی شۆڕش وایان کرد کە گوێ بەو مەسەلانە نەدات‌و بەردەوام بێت لە سەر جێ‌بەجێ‌کردنی بەیاننامەکە .

ئەوەبوو کە لە ساڵی 1974دا یاسای ئۆتۆنۆمی بلاوکرایەوەو دەست‌کرا بە جێ‌بەجێ کردنی ، لەم ڕووەوە دەتوانین مەسەلەیەك ڕوون بکەینەوەو بڵێین لەوانەیە کەسانێك هەبن واتێبگەن مەسەلەی کوردو مافە نەتەوایەتی‌یەکەی مەسەلەیەکی کاتی‌و میکانیکی‌یە ، هەرکە کەوتە سەر کاغەز دەبێت لە هەمان کات‌و بە هەمان بۆچوون جێ‌بەجێ بکرێت .. بەلام ئەمە ڕاست نی‌یە ، چونکە مەسەلەی کوردو ماف نەتەوایەتی لە وولاتێکی وەکو وولاتی عیراق کە دەیەها گیروگرفتی هەبووبێت نەك هەر بە تەنها مەسەلەی کوردو بەس ئەوە شتێکی ئاشکرایە چارەسەرکردنەکەی پێویست بە نەفەس درێژی‌یەکی تەواو دەکات ، چونکە لەراستیدا مەسەلەی کورد هەر خۆیشی بە بارێکی ئاڵۆزدا ڕەت دەبوو ..

گومان لەوەدا نی‌یە کە ماف نەتەوایەتی مەسەلەیەکی سیاسی‌یە ، مەسەلەیەکی ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و فیکری‌یە ، مەسەلەیەکە دەبێت بە چاکی هەزم بکرێت لە لایەن هەموو ئەوانەی ئەم مەسەلەیان بە لاوە مەبەستە ، مەبەستم ئەوەیە کە بلێم ئەم مەسەلەیە پێویستی بە کات‌و تێکۆشان هەیە ، پێویستی بە تێگەیشتن هەیەو ئەوەیشە کە ئێمە ئێستا پێیدا ڕەت دەبین ئەم چارەسەری‌یەی تاقی‌کردنەوەیەکی تازەیە لە وولاتێکدا کە تەنانەت باوەڕ بە بوونی میللەتی کورد نەدەکرا ، تاقی کردنەوەیەکە پەیوەندی هەیە بەو فیکرو بیرو باوەڕەی کە ئەم خەڵکە بەرامبەر بە کوردەوە هەی‌بوو . وە ئەو کێشەو بیرو باوەڕانەی کە لەناو کورددا پەیدا بوون لە ئەنجامی ئەوەبوو کە مەسەلەکە بۆ ماوەیەکی زۆر بێ جێ‌بەجێ‌کردن مایەوەو ئەو هەموو کێشانە دەبێت حیسابی بۆ بکرێت‌و دەبێ هەنگاوەکانی ئێمە زۆر بە ووردی بن‌و لە سەر ئەساسێکی وابێت کە جارێکی‌تر هەڵ نەوەشێتەوە ، وە دەبێ مەسەلەی کورد لە سەر ئەو ئەساسە دورست بکرێت کە یەکیەتی‌یەکی نیشتمانی ڕاستەقینە لە عیراقدا دابمەزرێت ئەمەش دوورە لە ئارەزووی تاکە کەس‌و هەروەها دوریشە لە ئارەزووی چەند کە سانێك ، بەڵکو مەسەلەی میللەتێکی تەواوەو ئەم مافەش دەبێت بۆ میللەت بێت‌و هەر ئەویش دەوری سەرەکی تیادا هەبێت .

بێگومان زۆر کەس لە بەرژەوەندیان دراوە بە هۆی چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە ، وە لە بەرژەوەندی ئەو کەسانەیش دراوە کە هەردەم مەسەلەی کورد وەرەقەیەکی سوود بەخشی‌بووە لە دەستیاندا بە ئارەزووی خۆیان بە کاریان هێناوە . ئیتر ئەم لایەنانە هەرگیز دەستە بەستە دانانیشن‌و بە ئاسانی خۆیان بە دەستەوە نادەن .. ئەوانیش نەخشەو پیلانی خۆیان هەیەو تێدەکۆشن بۆ نانەوەی ئاژاوەو گێرەشێوێنی .

ئەوەی دەتوانم بیلێم ئەوەیە کە مەسەلەی کورد بەرەو ڕەوتێکی ڕاست دەڕوات‌و ڕووی کردۆتە ئەو ئاواتەی کە بۆی هاتووە . وە ئێمە نابێ گوێ لە کەسانی‌تر بگرین چونکە مەسەلەکە مەسەلەی خۆمانەو خۆمان هەوڵمان داوە بۆ چارەسەرکردنی هەر خۆشمانی بەرەو پێشەوەی دەبەین‌و ماوەش بە بێگانە نادەین کە جارێکی‌تر هەڵی وەشێنێتەوە .

ئەوە یەکەم جارە کورد بەم شێوە فراوانە ماف خۆی وەردەگرێ وە یەکەم جارە هەست بەوە دەکات کە هاونیشتمانی‌یەکی ڕاستەقینەیە نەك لە پلەی دووەم‌و سیەمدا دێ ، بەڵکو ئیمرۆ لە هەموو ڕوویەکەوە دەوری خۆی دەبینێت ، هەروەها یەکەم جارە میللەتی کورد لە ژێر دەستی کۆنەپەرستان‌و نەخشەو پیلانی ئیمپریالیزم‌و دوژمنانی دەرئەچێت هەر بۆیەشە دەوری کورد دەورێکی ڕوونە بە تایبەتی لەم کاتەدا ، لە حوکمی زاتی‌و لە بەشداری کردنیدا لە دەسەلات داریەتی مەرکەزی لە ڕووی ئیداری‌و ڕۆشنبیری‌و هەموو ڕوویەکی ترەوە . وە ئێمە دەتوانین ڕاستی‌و دلپاکی ئەم شۆرشە بەرامبەربە مەسەلەی کورد لە چەند خالێکدا

تێبگەین ، بە قەناعەتی ئێمە شۆرشێك چارەسەری هەموو گیروگرفتی كۆمەلایەتیو ئابووری بكات لە ناوچەی كوردوستان ، وەكو چارەسەركردنی مەسەی كشتوكالی ، كردنەوەی قوتابخانە بەم فراوانی یە ، نەهیشتنی نەخوێندەواریو وەرگرتنی هەزاران قوتابی كورد لە زانكۆكاندا ، ئەمانە هەمووی بە قەناعەتی ئێمەو هەموو خاوەن ویژدانێك ئەوە دەگەیەنێ كە ئەم شۆرشە نەك هەر فیكری چاكە بەرامبەر بە میللەتی كورد بە تەنیا بەلكو لەوەش زیاتر بەردەوامە بۆ ئەوەی كورد بە تەواوی لە مافەكانی خۆی بگات .

ئیتر لەم بارەداو پاش ئەم هەموو دەستكەوتو گۆرانكاریانە وابزانین كورد تازە لە مافی خۆی دەگاتو شۆرشێكیش ئەمە بكات ، ئەوە بێگومان ئەوە دەسەلمێنێ كە هەلگری بیروباوەرێكی باشەو ئیرادەیەكی بەردەوامی هەیەو هەرگیز لێی پاشگەز نابێتەوە ..

ئێمەی كورد پێویستە بە شكلێكی فراوانەوە سەیری كاروباری خۆمان بكەینو ئەو گیروگرفتانەی دێنە بەردەم رەوتی تێكۆشانی میللەتەكەمان چارەسەریان بكەین ، چونكە لە ژیانی رۆژانەدا كەس ناتوانێت بلێت ئەم رێرەوە لە سەدا سەدی بێ گیروگرفت دەبێت ، چونكە ئەمەیان راست نیە هەر ئەوەیشە دەبێتە هۆی دورست بوونی هەندێ بۆچوونو بیرورا كە بە قەناعەتی ئێمە لە ئەنجامی ئەوەدا هاتووە كە مەسەلەی كورد ماوەیەكی زۆر بێ چارەسەری مایەوەو رۆژێ لە رۆژان لایەنێك نەهات بەراستیو روونی چارەسەری مەسەلەكە بكات ، بۆیە هەقی ئەوە دەدەنیە میللەتی كورد كە كەم باوەربێتو لە ئاست هەندێ لایەنەوە دوو دڵ بێت .

ئێمە گەر بە چاكی لە هەندێ شتی جەوهەری وورد ببینەوە ئەوسا بە چاكی دەزانین لایەنی راست كێیەو لایەنی لاریش كێیە ، ئەوكاتەش زیاتر رووی راستەقینەی شۆرشمان بۆ روون دەبێتەوەو دەزانین چۆنەو بە چ جۆرێكەو بۆ كوێ هەنگاو دەنێ ، وە بۆ نموونەش ئەمەهەندێ لەو مەسەلە سەرەكیانەن كە لێرەدا دەیان خەینە روو :

1 - شۆرش لە ناوەوەو دەرەوەی وولات دانی نا بە مافی میللەتێك كە میللەتی كوردە هەروەها دانی بە شەرعیەتی بوونیدا نا لەسەر ئاستی مێژوویيو سیاسی ، وە ئەم دان پیانانەیش قالبێكی دەستووری وەرگرت .

2 - بریاردانی خودموختاری ناوچەی كوردوستان بە ئاگاداری هەموو لایەنە سیاسی یەكانی ناوەوەو دەرەوەی وولات كە ئەمەشیان هەر دیسان شتێكی زۆر گرینگە .

3 - چارەسەركردنی باری ئابووریو كۆمەلایەتیو پەروەردەو رۆشنبیری لە ناوچەكەدا كە هەندێكیان بە زۆری چەسپێنراون واتە شۆرش قوربانی داوە تاوەكو بچەسپین ..

جگە لەمانەیش دامەزراندنی دەزگاكانی حوكمی زاتیو ئەنجومەنی یاسا دانانو جێبەجێ كردن ، وە رێگەدان بە رۆشنبیری كوردی بەو فراوانی یەی كە ئێستا كورد پێی راناگات لە رۆژنامەو گۆڤارو ئیسگەو كتێب ، هەروەها رێگە دان بەو رێكخراوە پیشەیی یانەی كە لە كوردوستاندا هەن ، وەكو رێكخراوەی پیشەیی رۆشنبیریو كۆمەلایەتی ئەمانە هەمووی شتی سەرەكینو دەبێت بە بەرچاومانەوە بن .

دەبێ ئەوە بزانین كە ناوچەی كوردوستان چەند پارەی بۆ تەرخانكراوەو چەندی لێ سەرفكراوە ، چەند قوتابخانەو دەزگای تەندورستی كراونەتەوەو چەند زەوییو زارو ئەرز دابەش كراوە بەسەر جوتیارەكانداو ، كرێكار چ مافێكی وەرگرتووە بێگومان ئەمانە هەمووی شتی بنەرەتین دەبێت بە بەر چاووەوە بێت ، هەربۆیەشە كە كورد ئیمرۆ بە ئارەزووی خۆی نەوەك بە زۆركاری لەم وولاتەدا لە هەموو شتێ بەشداری دەكاتو دەزگاو لێپرسراوەكانی دەولەتیش ئەم راستی یە چاكتر دەزانن .. كاتێكیش كە كار دەگاتە سەر ژمارەو سەرژمێری كردن ئەوكاتە شتمان چاكتر بۆ روون دەبێتەوە ، چونكە ئەوسا لە عمومیات دەردەچێو دەبێتە شتێكی زانستی راست ..

لای هەموومان ئاشكرایە كە كورد چەند شەهیدی داوە ، چەند كورد لە بەرەكانی شەردا بەشداری كردووەو ئێستاش هەر بەشدارن لە بەرپەرچ دانەوەی هێرشی دوژمنكارانەی ئێران ، هەروەها كورد چەند یارمەتی پێشكەش كردووە بە مالو سامان ، وەئەم یارمەتیو پیتاكەی ئەم دوایی یەی ئالتون ئەوە بە ئاشكرا ئەم راستی یە دەسەلمێنێ ..

وە هەڤاڵ سەرۆك صدام حسین زۆر جار باسی ئەم دەورەی میللەتی كوردی كردووەو لە دوا بروسكەی فەرماندەی فەیلەقی یەكەمیشدا بۆ هەڤاڵ سەرۆك صدام حسین ئەم راستی یە زیاتر دەسەلمێ كە دەلێ «راوەستانی كورد هەروەك راوەستانی ئەو لەشكرە دلێرەبوو كە هێرشیان بردە سەر ئەو

شاخانه» ئه‌مانه هه‌مووی به‌ڵگه‌ی ئه‌وه ده‌ده‌ن به ده‌سته‌وه كه كورد به ئاره‌زووه‌وه‌و له چوارچێوه‌ی یه‌كیه‌تی نیشتمانیدا له‌گه‌ڵ براكانی تری خۆی له خۆشی‌و ناخۆشی ئه‌م وڵاته‌دا به‌شداری ده‌كات ..

به‌ڵام ئه‌گه‌ر هاتوو ئه‌نجوومه‌نی یاسادانان وه یا ئه‌نجوومه‌نی راپه‌راندن هه‌ندێ كه‌موو كورتی تیادا هه‌بوو ئه‌وه له حیساباتی كات و ئه‌و حیساباتانه‌ی كه باسمان كردن هه‌روه‌ها له‌و باروو زروفه‌ی كه ئێستا وڵات پێیدا ره‌ت ده‌بێت ئه‌وه شتێكی زۆر ئاسایی‌یه ..

ئێمه بروامان وایه ئه‌وه‌ی دژی ئۆتۆنۆمی رابوه‌ستێت ئه‌وه دژی میلله‌تی كورد راده‌وه‌ستێت ، دژی به‌رژه‌وه‌ندی ئه‌ساسی میلله‌تی كورد راده‌وه‌ستێ‌و دژی شۆرشیش راده‌وه‌ستێ ، با ئه‌وه‌ش بڵێین كه چۆن ئه‌م شۆرشه هه‌ر له سه‌ره‌تای به‌رپابوونی‌یه‌وه نیازی به‌رامبه‌ر مه‌سه‌له‌ی كورد ئاشكراو دیار بووه ، وه چۆن دوژمنان هه‌ستیان به‌و نیازه كردووه .

ئیتر ئه‌وه‌بوو له «17»ی ته‌موزی ساڵی 1968 ، واته رۆژی یه‌كه‌می شۆرش سه‌ركردایه‌تی بزووتنه‌وه‌ی كورد ـ كه له‌وه‌به‌ر باسمان كرد ـ وه‌زیرێكی له حوكمدا به‌شداربوو ، له رۆژی «30»ی ته‌موز پاش ئه‌وه‌ی «عبدالرزاق نایف و عبدالرحمن داود» لێدران‌و دوور خرانه‌وه‌و شۆرشه‌كه به ته‌واوی كه‌وته ده‌ست برا به‌عسیه‌كان ، سه‌ركردایه‌تی بزوتنه‌وه‌ی كورد وه‌زیره‌كه‌ی خۆی له حوكم كێشایه‌وه ، چونكه بۆی روون بووه‌وه كه شۆرشه‌كه به‌ره‌و چی ده‌چێ‌و زانی چ مه‌ترسیه‌ك به‌ره‌و رووی سه‌ركردایه‌تی‌یه‌كه چاوه‌نواری ئه‌و پیلانه بوو كه دژی شۆرش كرا ، چونكه له‌و كاته‌دا شۆرش له سه‌ركردایه‌تی بزووتنه‌وه‌ی كورد نزیك ببووه‌وه‌و ده‌یه‌ویست بگاته ئه‌نجامێك ..

ئێمه كه ئه‌و قسانه ده‌كه‌ین وه‌نه‌بێ به مه‌به‌ستی ئه‌وه‌بێت كه له‌م رووه‌وه دیفاع له شۆرشی 17 — 30 ته‌مووز بكه‌ین ، نه‌خێر ، به‌ڵكو وابزانم ئامانج‌و بیروباوه‌رو ره‌وشتی شۆرش كه ره‌نگدانه‌وه‌یه‌كی راسته‌وخۆی رێره‌وه‌كه‌یه‌تی‌و شتی واشی تیایه كه پێویست به دیفاع لێكردن ناكات ، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه خۆی دیفاع له خۆی ده‌كات‌و خۆی ته‌عبیر له خۆی ده‌كات ، به‌ڵكو ده‌مانه‌وێ هه‌ندێ شتی مێژوویی‌و سیاسی‌و كۆمه‌ڵایه‌تی راسته‌قینه بۆ میلله‌تی خۆمان روون بكه‌ینه‌وه به‌تایبه‌تی بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه هێشتا دڵیان له كینه پاك نه‌بۆته‌وه چونكه ئێمه هه‌رگیز نابێت به‌پێی خواست‌و سۆزو ئاره‌زووی چه‌ند كه‌سانێك ره‌فتار بكه‌ین‌و به‌رێوه برۆین ..

وه‌كو بۆ هه‌موومان ساغ بۆته‌وه ئه‌وانه‌ی دژی بزووتنه‌وه‌ی كورد راوه‌ستان وه‌ئێستاش دژی شۆرشن به‌چاكی ئاشكرا بوون كه كێن ، خومه‌ینی هه‌ڵوێستی له‌م باره‌یه‌وه دیاره كه دژی عیراق‌و شۆرشه‌كه‌یه‌تی ، رژیمی «حافظ أسد»یش هه‌ر دیسان هه‌ڵویستی دیاره‌و هه‌ر ئه‌و رژێمه‌یش بوو كه حوكمی زاتی درایه كورد گووتی : «ئه‌مه خیانه‌ته‌و له «عروبه» ده‌كرێت» . جا ئه‌وانه‌ی كه ئیمرۆ به‌ناو دیفاع له مافی نه‌ته‌وایه‌تی كورد كورد ده‌كه‌ن ، با هه‌قی ئه‌و كوردانه بده‌ن كه لای خۆیاندا ده‌چه‌وسێنه‌وه ، با دان به بوونیاندا بنێن وه‌كو مرۆڤ تاوه‌كو له پاشدا گه‌ر راست ده‌فه‌رموون بینه جێی باوه‌ری خه‌ڵكی تر .. به‌ڵام له راستیدا ئه‌مانه له ئامانجی تایبه‌تی‌و دوژمن كارانه به‌ولاوه هیچ ئامانجێكی تریان نیه ، دژی شۆرشی عیراق‌و دژی ئه‌و دیموكراتیه‌ته‌ن كه له وڵاتدا هه‌یه ، دژی ئه‌و ده‌ستكه‌وتانه‌ن كه وه‌ده‌ست هاتوون ، دژی ئه‌م سه‌ركردایه مێژوویی‌یه‌ن كه بۆ ئه‌م میلله‌ته هه‌ڵكه‌وتووه ، كه سه‌ركردایه‌تی سه‌رۆك «صدام حسین»ه ، ئه‌و دوژمنانه ده‌یانه‌وێ له ده‌رگایه‌ك بێنه ژووره‌وه‌و ئه‌و هه‌موو ده‌ستكه‌وتانه له‌ناو به‌رن‌و نه‌ی هێڵین ، جا به‌هه‌ر بیانوویه‌ك‌و به‌هه‌ر شێوه‌و له‌ژێر هه‌ر درووشمێكدا بێت ، وه ئه‌مه‌ش له راستیدا دژایه‌تی حوكمی زاتی‌یه كه ئیمرۆ له ناوچه‌كه‌دا مه‌ترسی‌یه‌كی گه‌وره‌ی ناوه‌ته‌وه به‌رامبه‌ر به‌و رژێمانه‌ی كه تا ئێستا نه‌یان توانیوه چاره‌سه‌ری گیروگرفتی میلله‌ته‌كانی خۆیان بكه‌ن ، وه رێگه‌ی راستیش كه رێك بكه‌وێ له‌گه‌ڵ به‌رژه‌وه‌ندی میلله‌تی كورد ئه‌وه‌یه كه پارێزگاری له شۆرش‌و ئامانجه‌كانی شۆرش بكه‌ین ، وه ئه‌و ده‌ستكه وتانه بپارێزین كه وه‌ده‌ست میلله‌ته‌كه‌مان كه‌وتوون ، پارێزگاری له خودموختاری بكه‌ین‌و بناغه‌كه‌ی زیاتر بچه‌سپێنین‌و ناوه‌رۆكه‌كه‌ی قوڵتر بكه‌ینه‌وه‌و به رێگایه‌كی زانستانه‌ی راست‌و له‌سه‌ر رێبازێكی دیموكراتی زیاتر له‌گه‌ڵ برا عه‌ره‌به‌كانمان تێكه‌ڵ بین‌و له‌یه‌كتری نزیك بینه‌وه ، چونكه هه‌ر به‌م برایه‌تی‌یه‌و به‌م رێگه‌یه ده‌توانین خزمه‌تی خۆمان‌و وڵاته‌كه‌مان بكه‌ین ، وه هه‌ر كاتێ توانیمان خزمه‌تی خۆمان بكه‌ین ئه‌وه ده‌توانین به‌چاكی خزمه‌تی غه‌یری خۆشمان بكه‌ین ..



# بەڕێز محمد امین محمد احمد
## ئەمینداری گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان

**پ : بە بۆنەی یادی 15 مینی بەرپا بوونی شۆڕشی 17 — 30ی تەمموزی پیرۆزدا ، چۆن ڕۆڵی ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان هەڵدەسەنگێنن لە بواری جێبەجێ کردنی بیروڕای شۆڕشی 17 — 30 تەمموزی پیرۆزداو ئەم ئەمینداریەتیە چ ڕۆڵێکی بینیوە لە کاروانی ئۆتۆنۆمیدا ؟ .**

و : ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان وەك هەموو دەزگا شۆڕشگێڕیەکانی شۆڕشی 17 — 30 تەمموزی نەمر ، بە ئەرکی شۆڕشگێڕانەی خۆی هەڵدەستیو بە ڕێكو پێکی فەرمانە شۆڕشگێڕ یەکانی سەرکردەی تێکۆشەر کاك «صدام حسین»و بیروڕاکانی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست جێبەجێ دەکات .. ئەگەر سەرنج بدەینە ناوی ئەمیندرایەتیەکەمان ئەرکی ئەم دەرگایەمان بۆ دیار دەکەویو ئەویش کارکردنە لە پێناوی ڕۆشنبیریو لاواندا .

شۆڕشی 17 — 30 تەمموز لە ڕۆژی بەرپا بوونیو سەرکەوتنی تا ئێمرۆ بایەخێکی گرنگی بە مرۆڤ داوەودەدات ، هەوڵو تەقەلایێکی بێ ووچانی داوە لە پێناوی دروستکردنی مرۆڤی نوێ ، مرۆڤی شۆڕشو توانی بە درێژای ئەو سالانەی نێوان 1968 — 1983 بایەخێکی گرنگ بە لاوان بداتو نەوەیێکی نوێ پەروەردە بکات بە بیروڕاکانی پارتی بەعسیو شۆڕشی تەمموزو سەرۆکی نەبەز صدام حسین ، ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان بە ئەرکی پەروەردەکردنی نەوەی نوێ لە کوردستاندا هەڵدەستێو لە سالانی ڕابردوودا گەلێ بنکەو هۆڵی بۆ لاوان دروست کردو توانی زۆربەی زۆری لاوان لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوەو گەلێ لە پێویستیەکانی جموجووڵی لاوان بۆیان بهێنێتە دی .

دان نان بە ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کوردمان لە 11 مارتی 1970دا بووە هۆی گەشە کردنی ڕۆشنبیری ی کوردی بەتایبەت دووای پێکهێنانی ئەمینداریەنی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان کە بەیەکێ لە هەرە گرنگترین دەزگای ڕۆشنبیریو لاوان دەژمێردرێت لە کوردستاندا ، ئەم ئەمینداریەتیە یاریدەی بە چاپ گەیاندنی گەلێ کتێبێ داوە جگە لەساز کردنی کۆڕو میهرەجانی ڕۆشنبیری ، شایانی باسە کە ئەم دەزگا ڕۆشنبیری یە کوردیە گرنگە لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەهیچ جۆرێك کاری نالەباری نەکردۆتە سەر چالاکی دەزگا ڕۆشنبیریە کوردیەکانی سەر بە دەسەلاتی ناوەندی لە بەغدا بەڵکو بە پێچەوانەوە بە نیازێکی پاكو خزمەتگوزاری فیکری کوردیو ڕۆشنبیری کوردی یارمەتی داوونو هاوکاری لەگەڵدا کردوون . ئەم ئەمینداریەتیە بەردەوامە لە پێشکەش کردنی چالاکی فیکریو هونەریو ڕۆشنبیری ، باری نالەباری جەنگ کاری نەکردۆتە سەر چالاکی یە جۆر بە جۆرەکانی ، تەنیا لە سالی 1981دا ئەم ئەمینداریەتیە ئاهەنگی بیرەوەری ڕۆژی ڕۆژنامەگەری عیراقی سازکردو بەبۆنەی یادی (112) مینیەوە ، بەم بۆنەیەوە ڕێز لە (24) ڕۆژنامە نووسنرا جگە لە ڕێز لێنانی ژمارەیێك لەگۆرانی بێژو هونەرمەندان لەوانەی هاوبەشی جەنگی «قادسیەی صدام»ی پیرۆزیان کردووە بە سروودو تابلۆکانیان .. هتد .

لێرەدا بۆمان ناکرێ باسی جموجوولە هونەریو ئەدەبیە جۆراو جۆرەکانی ئەم ئەمینداریەتیە بکەین لەبەر زۆری ئەم جموجوولیانەو زۆری ئەم دەزگاو لقانەی سەر بەم ئەمینداریەتیەن ، ئەوەی شایانی باسە گشت بەڕێوەبەرایەتیەکانی ڕۆشنبیریی جەماوەری لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا بەم ئەمینداریەتیەوە بەستراوونو هەر یەکە لەم بەڕێوەبەرایەتیانە پرۆگرامو جموجوولی ڕۆشنبیریو هونەری

خۆی هەیەو لەکاتی دیاری کراودا پێشکەشیان دەکات ، لە هەرە جموجوولیە بەرزەکانی ئەم ئەمیندارێتیە بەستن و پێکهێنانی دوو فیستیڤالی مەزن بۆ چیرۆکی کوردی یەکەمیان لە هاوینە هەورای سەلاحەددین بەستراو دووەمیان لە مەلبەندی پارێزگای هەولێر ، وە بە هۆی پاڵپشتی تەواوی ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان یارمەتیدانی بۆ تیپ و کۆمەلە هونەریەکانی ناوچەی کوردستان جموجوولی و چالاکی یەکانی ئەم تیپە هونەریانە بەردەوامەو پەرە دەسێنێ ، ئەمیندارێتی گشتی پارەو پولێکی زۆری بەم تیپانە بەخشیوە ، بۆ نموونە ئەم یارمەتیەی بەشێوەی خوارەوە پێشکەش کرد :

| ز | ناوی تیپ و یەکێتی | یارمەتی بەدینار |
|---|---|---|
| 1 | کۆمەلی هونەرە جوانەکانی کورد/سلێمانی | 11000 |
| 2 | کۆمەلی هونەری کوردی ـ هەولێر | 6000 |
| 3 | یەکێتی نووسەرانی کورد / لقی هەولێر | 4000 |
| 4 | یەکێتی نووسەرانی کورد / لقی سلێمانی | 3500 |
| 5 | یەکێتی نووسەرانی کورد / لقی دهوك | 3000 |
| 6 | تیپی سلێمانی بۆ تەمسیل | 1500 |
| 7 | تیپی شانۆگەری کوردیی پێشرەو/سلێمانی | 1500 |
| 8 | تیپی مۆسیقای سلێمانی | 1500 |
| 9 | تیپی مۆسیقای مەولەوی | 1500 |
| 10 | تیپی هونەرمەندان/ سلێمانی | 1000 |
| 11 | تیپی هونەری هەولێر | 1500 |
| 12 | نەقابەی رۆژنامە نووسانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی | 1000 |
| 13 | نەقابەی هونەرمەندان هەولێر | 1000 |

لە ساڵی 1982دا ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان ، یارمەتی لە چاپکردنی کتێبی کوردی بە 50,000 دینار داوەو لە هەمان ساڵدا گۆڤاری کاروانی دەرکردو تا ئێستا دە ژمارەی لێ بلاوکراوەتەوە ، گۆڤاری کاروان لە رۆژانی دووای دەرچوونیەوە توانی ببێتە یەکێ لە گۆڤارە هەرە گەورەو بەناو بانگەکانی کوردو هەروەها توانی زۆربەی زۆری نووسەرو خوێندەوارانی کورد لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە .

ئەم دەزگا رۆشنبیری یە چەند هیواو ئاواتی مەزنی هەیەو سوورە لەسەر هێنانەدی و جێبەجێ کردنی و نیازیشی وایە لە مانگەکانی داهاتوودا چاپخانەکەی خۆی بخاتە کارو رۆژنامە یێکی رۆژانە یاخود هەفتانە دەر بکات .

هەروەها ئەمیندارێتیەکەمان گەلێ چالاکی تری هەیە وەك پەیدا کردنی نەقابەی رۆژنامە نووسانی ناوچەی کوردستان و پەرەپێدان بە هونەرە میللی یەکان و دامەزراندنی تیپێکی هونەری لەبەرێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەری لە هەولێردا ، ئەمە لە لایەك و لەلایەکی تریشەوە ئەمیندارێتیەکەمان رۆڵێکی تایبەتی هەیە لە رسواکردنی تاقمی تاران و دمشق و هەموو دوژمنەکانی گەلەکەمان .

ئیمرۆ کە ئاهەنگ بە بیرەوەریی 15 مینی شۆرشی 17 — 30 تەمموزو دووای تێپەر بوونی نزیکەی سێ ساڵ بەسەر جەنگی رەوامان ، دەبینین کە چۆن پایەی عیراق لە نێو دەولەتاندا زیاتر بەرز بووەتەوەو چەسپاوەو گەلەکەمانیش زیاتر لە هەموو کاتێك لە دەوری سەرۆکەکەی و پارتە نەبەزەکەی کۆ بوویتەوەو ، هەروەها دەبینین کە چۆن دەسەلاتی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی فراوانتر بووەو سەرۆکی فەرماندە بایەخێکی تایبەت بە کوردو ناوچەی کوردستان داوەو دەدات . بۆیە هەردوو رژێمە تاوانبارەکەی دیمەشق و تاران زیاتر بەربەرەکانی رژێمە پێشکەوتوو خوازەکەمان دەکەن و بازرگانی بەکێشەی کورد دەکەن . بەلام گەلی کوردمان چاك خومەینیی خوێن رێژ دەناسێ ، هەروەها هەلوێستی حافز ئەسەدی لە بیر ناچێ کە چۆن ئۆتۆنۆمیی بۆ گەلی کوردمان لە عیراقدا بە «ئیسرائیلێکی دووەمی» لەقەلەمدا . سەرەرای ئەمەش حافز ئەسەد نەك هەر دژی کوردە بەلکو دژی عەرەبیشە بە تایبەتی دژی فەلەستینیەکانە ، یاسر عەرەفات بەر لە چەند هەفتەیێك ووتی : «بە بریاری ئیسرائیل لە لوبنان دەرچووم و بە بریاری حافز ئەسەدیش لەسووریادەرچووم» . بەلێ .

«ئەوەی بۆ عەرەب دلسۆز نەبێ بۆ کورد هەر دلسۆز نابێ» .

لە کۆتاییدا پیرۆزباییکی گەرم لە سەرۆکی فەرماندەو پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب دەکەم بە بۆنەی یادی 15 مینی شۆرشی 17 — 30 تەمموزو لەیەزدان دەپارێمەوە تەمەنی درێژ بە سەرۆکمان ببەخشێ و سەرکەوتنی هەمیشەیی بۆ گەل و سوپا بێت لە جەنگی رەوامانـدا دژ بە خومەینی و ئەسەدو قەزافی و گشت بە کرێگیراوەکانی ئمپریالیزم و زایۆنیزم .

# بەڕێز دکتۆر خەسرەو شاڵی
# سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین



**پ : راتان بەرامبەر پەرەپێدانی ژیانی زانکۆیی لە زانکۆی سەلاحەودین چییەو تا چ رادەیێك زانکۆی سەلاحەودین لە جەنگی قادسیەی صدامدا بەشداری کردووە ؟ .**

و : دوای بەرپا بوونی شۆرشی پیرۆزی 17 — 30 تەمموزی سالی 1968 بە سەرکردایەتی تێکۆشەر صدام حسێن و پارتی بەعسی سۆسیالیستی عەرەوب ، دوای بەرپا بوونیەوە بە چەند مانگێك ، زانکۆی سەلاحەدین (سلێمانی لە رابردوودا) بە بریارێکی سیاسی لە لایەنی سەرکردایەتی سیاسی هاتە دیو دامەزرا . دروستکردنی ئەم زانکۆیە بە دەستکەوتێکی گرنگ بۆ گەلی کوردو گشت جەماوەرانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دەژمێردرێت جگە لە وەی کە بروای بە تینی سەرکردایەتی شۆرشی 17 — 30 تەمموز بەرامبەر بە مافە رۆشنبیریەکانی گەلی کورد دەردەبری . بەڵێ ، دوای سەرکەوتنی شۆرش یەکێ لە هەنگاوە گەورەکانی سەرۆك و پارت دروستکردنی زانکۆی سەلاحەددین بوو .

ئەگەر بگەرێنەوە بۆ سەرەتای دروستکردنی ئەم زانکۆیە ئەبینین یەکێ لە ئەرکەکانی ئەم زانکۆیە : بایەخدان بوو بە رۆشنبیری گشتی لە ناوچەی کوردستان . هەر وەها بایەخدان بە ئەدەبی کوردییە . خوێندنیش لە زانکۆکەماندا زمانی کوردی و عەرەبیە . ئەوەی شایانی باسە لە رۆژی دروستبوونی زانکۆکەمان و تا ئێشتا بایەخدانی سەرکردایەتی سیاسی سال بە دوای سال پتربووە . لە سەرەتای دروستبوونیەوە بریتی بوو تەنها لە سێ کولیج کەچی ئێستا هەفت کولیجی تیایە . لە سەرەتاوە خوێندنی بەرزی تیا نەبوو ، بەلام ئێستا خوێندنی بەرز لە کۆلیجی : زانیاری و ئەندازەیی و کشتوکالی هەیە .. لە سەرەتاوە کولیجەکان یەك دوو بەشی زانستیان هەبوو ، بەلام ئێستا تەنها کۆلیجی کشتوکالی شەش بەشی زانستیانەی تیایە .. بەلی لە سەرەتاوە زانکۆکەمان لە چەند کۆلیجێك بریتی بوو ، بەلام لە ئەنجامی بایەخدانی سەرکردایەتی سیاسی ، هەندێ دامەزراوی تر دروست کراو پەیدا بوو ، وەك کتێبخانەی گشتی و چاپخانەی زانکۆو مەڵبەندی رۆشنبیریی کۆمەلایەتی کە جەماوەری ناوچە بە زانکۆ دەبەستێ ، هەر وەها زانکۆ توانی دوو گۆڤاری رۆشنبیری دەربکات وەك : ئاسۆی زانکۆیی و گۆڤاری زانکۆ کە دووبەشە «بەشی زانستی و بەشی مرۆڤایەتی» .

لە ماوەی رابردوودا زانکۆی سەلاحەددین هەندێ هەنگاوی نا بۆ پەیداکردنی بەشەکانی ناوەوە «الأقسام الداخلية» بۆ قوتابیان . ئێستاش بەشێکی زۆری قوتابیەکانمان سوود لەم بەشانە وەردەگرن . هەر وەها پارەو پولێکی زۆر بۆ دابینکردنی خانوو بۆ مامۆستاو فەرمانبەرانی زانکۆ تەرخانکرا . وەئێستا پتر لە (150) خێزان لە خێزانەکانی مامۆستایان و فەرامانبەرانی زانکۆ لەم خانووانەدا دەژین و (100) خانووی ترمان هەیە تەواو بووەو هیوادارین دوای سێ چوار مانگی تر بەسەر مامۆستایاندا دابەش بکرێت .

لە ماوەی نێوان 1968 — 1983 دا بایەخدانی شۆرشی 17 — 30 تەمموزی نەمر بە زانکۆی سەلاحەددین هەر بەردەوام بووەو رۆژ لە دوای رۆژ پەرەی پێ دەدرێ بۆ ئەوەی شان بەشانی زانکۆکانی تر خەبات بکا لە پێناوی پەروەردەکردنی نەوەیێکی رۆشنبیری پێشکەوتوو . ئەمە لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە زانکۆکەمان بەشداریێکی تەواوی هەبووەو هەیە لە جەنگی رەوامان جەنگی قادسیەی صدام چ بە بەخشینی خوێن و بەشدار بوونێکی تەواو لە جەنگ چ بە کۆکردنەوەی پارەو زێرو چ بە بلاوکردنەوەی ووتارو پێکهێنانی کۆرو فیستیڤال بۆ روونکردنەوەی هەڵوێستی عادیلانەمان لەم جەنگەدا ، وە لە گەل هەموو گەلی عیراقی خۆشەویست ئەم زانکۆیە بە گشت مامۆستایان و قوتابیانی خۆی ئامادە کردووە بۆ ئاهەنگگێران بە بۆنەی یادکردنەوەی 17 — 30 تەممووزەوە . بەم بۆنەیەوە بە ناوی خۆم و هەموو مامۆستاو فەرمانبەرو قوتابیانی زانکۆ پیرۆزباییێکی گەرم ئاراستەی سەرۆکی خۆشەویست صدام حسێن و پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب دەکەم و ئومێدەوارم کە هەمیشە سەرکەوتن هەر بۆ گەل و پارت و سەرۆك بێت بە سەر هەموو دوژمنانمان و هێزە ناحەزەکان .



راستی دەقی شیعرەکە لە سەرچاوەکاندا بەم جۆرە نووسراوە :ـ

مەعلوومە بۆچی حاجی مەدحت دەکا بە کوردی
تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری ..(3) .

2 ـ نووسەر هەستاوە نیشانەی پرسیاری لە دوای نیوە دێرە شیعرێکی حاجی داناوە ، کە هیچ نیشانەیەکی پرسیاری تێدا نی یە ، وەك نووسیویەتی :ـ

لە ئادەم بگرە تا دەورانی ئێستا ،
یەکێ وەك حاجی لەو خاکە هەڵستا (؟) (4)

وەك سەرنج دەدەین هیچ ئامرازێکی پرسیارکردن لە شیعرەکەدا نی یە تا لە کۆتایی دا پرسیاری بوێ . بەلام لە جیاتی ئەمە ئەگەر نیشانەی سەرسوڕمان «التعجب» (!) لە جیاتی دابنرێ لە جێی خۆیەتی . چونکە لەو کاتەی کە بڵێ : «لە ئادەمەوە تاکو ئێستا تەنیا یەکیکی غەمخۆری وەك حاجی بۆ کورد هاتووە .» ئەم سەرهەڵدانەی حاجی رووداوێکی گرنگە ، نیشانەیێکی سەرسوڕمانی پێ دەوێ و بەم جۆرە بنووسرێ :

لە ئادەم بگرە تا دەورانی ئێستا ،
یەکێ وەك حاجی لەو خاکە هەڵستا !

کۆمەڵەی عەبدورەحمان سەعید :16

هەرچەندە لە دەقەکەی لای گیوی موکریانی لە کۆتایی دێرە شیعرەکە نیشانەی پرسیار دانراوە بەلام لە جێی خۆیدا نی یەو لە کۆمەڵەی عەبدورەحمان سەعیددا نی یە . بەلام وا راستە نووسەر دەورێکی سەرەکی ببینێ لە هەڵبژاردنی دەقی راستو بزانێ نیشانەی پرسیاری دەوێ یان نا ؟

3 ـ لە لاپەرە (27)ی کاروانو لە دێری (4)دا مامۆستای نووسەر دێرە شیعرێکی حاجی بەم جۆرە خستۆتە روو :ـ

قوڕی کام (جێگە) بکەم بە سەرما
ئەمە لێم (بوەتە) عیللەتی سەودا

دەبینین ووشەی (جێ) ی دەقە چاپ کراوەکانی کردووە بە (جێگە) بە مە بڕگەیەك لە شیعرەکە زیاد بووەو ، هەستاوە بۆ چارە سەر کردنی ئەم زیادەیە ووشەی «خۆما» ی کۆتایی نیوە دێری یەکەمی لێ فڕیداوە . لە نیوە دێری دووەمی شیعرەکەش ووشەی «بۆتە» یان «بویتە» کە کێشەکەیان تەنیا دووبڕگە هەڵدەگرێ کردوویەتی بە (بوەتە) کە دەشێ بە دوو بڕگە یا سێ بڕگە بخوێنرێتەوە ، ئەمەش جۆرە هەڵبەزینەوەیەك دەدات بە مۆسیقای شیعرەکە . کەچی راستی ئەم شیعرە بەم جۆرەی خوارەوەی لە هەموو سەرچاوەکانی دا هاتووە :ـ

قوڕی کام (جێ) بکەم بەسەر خۆما ،
ئەمە لێم بۆتە عیللەتی سەودا

رۆژی کورد : 26 ، ع : 38 ، گ : 93

4 ـ لە ستوونی یەکەمی دێری پێنجەمی هەمان لاپەرە (27) ی کارواندا ، مامۆستای نووسەر بەم جۆرە دەقی دێرە شیعرێکی حاجی تۆمار کردووە :ـ

بە قسەی چاکە دەستیان دەگرم
تەرکی ناکەم        هەتا دەمرم

ئەوەی شیاوی باسە هەڵبەستەکەی حاجی سەر لەبەری لە سەر کێشی (10) بڕگەیی دەڕوات ، کەچی لێرەدا دەبینین نیوەی یەکەمو دووەم کێشەکەیان بۆتە (8) بڕگەیی . لە نیوە دێری دووەمی دا بە ئاشکرا دیارە ووشەیێکی لێ پەڕیوەو ، بە پێی هەردوو سەرچاوەی چاپ کراوی دەستەواژەی (بە لۆمە) پەڕیوەو ، راستی دەقی شیعرەکە بەم جۆرەیە :ـ

بە قسەیی چاکە دەستیان دەگرم
تەرکی ناکەم (بە لۆمە) تا دەمرم
ع : 38 ، گ : 93
بە مەرجێ دەستەواژەی (بە قسەیی) بە 3 برگە بخوێنرێتەوەو ، لە نیوە دێری دووەمیش فرمانی رانەبوردووی «دەمرم» بە دوو برگە حیساب بکرێ .

5 ـ هەر لە ستوونی یەکەم و لە لاپەڕە (27)دا ، دێڕە شیعری حەوتەمی هەمان هەڵبەست ، نووسەر ووشەی (ئولئی) گۆڕیوە بە (بەیتی) و بەم جۆرەی خوارەوەی نووسیوە :ـ
یا وەکو (بەیتی) شیرین و فەرهاد
بەیتی حاجی لەبەر کرایە بە یاد
کەچی لە سەرچاوە چاپ کراوەکانیدا ئەسڵەکەی بەم جۆرەی خوارەوە نووسراوە :ـ
یا وەکوو (ئولئی) شیرین و فەرهاد
بەیتی حاجی لەبەر کرایە بە یاد
ع : 37 ، گ : 92

6 ـ لە کۆتایی هەمان ستوونی لاپەرە (27)دا مامۆستای نووسەر لە جیاتی پیتی (و) چووە ئامرازی (بە) ی بەکارهێناوەو لە ئەنجامدا نیوە دێرە شیعرەکە برگەیێکی زیاد کردووەو بەم جۆرەی نووسیوە .
بەیتی من چونکە کەڵکیان دەگرێ
لە غەریبی (بە) بێ کەسی دەمرێ !
کەچی راستیی دەقی شیعرەکە بەم جۆرەی خوارەوە لە سەرچاوە چاپ کراوەکانیدا هاتووەو دەڵێ :ـ
بەیتی من چونکە کەڵکیان دەگرێ
لە غەریبی (و) بێ کەسی دەمرێ
ع : 37 ، گ : 92

7 ـ لە ستوونی دووەمی هەمان لاپەرەی (27) دا ، نووسەر دێرە شیعرێکی حاجی بەم جۆرە نووسیووە :ـ
قازیی نەسرو[6] موفتی می نازیم
تێ دەگەن تا مودەرریسو عالیم
وەك سەرنج دەدەین ، دەبینین ووشەی (می) لەنیوە دێری یەکەمدا زیادە ، من لەو باوەڕەدام نووسەر لە جێی خۆیدا (ی) نووسی بێ و لە چاپ کردندا بووبێ بە (می) . لە نیوە دێری دووەمیشدا (و) ی ئامرازی بەستنەوە (العطف : Conjunetion)ی بە ووشەکەی پێشەوەی لکاندوەو نووسیویەتی (مودەرریسو عالیم) ، کەچی بە پێی رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ئەم جۆرە (و) ە ، ئەگەر کەوتە نێوانی دوو ووشەوە ، بە تەنیا دەنوسرێ و بە هیچ ناوێك یا ووشەیێك نالکێ . وەك : «ئازادو ئاسۆ بران .»[6] کەواتە بە پێی رێزمانی کوردی وا راستە بنووسرێ (مودەرِیس و عالیم) و بۆ مەسەلەی (ڕ) ی قەڵەویش بە دوو (رر) لەمێژە دەستی لێهەڵگیراوەو ئێستا دەنووسرێ (ڕ) راستی دەقەکەش بەم جۆرەیە :ـ
قاضیی نەثرو موفتیی ناظم ،
تێ دەگەن تا مودەڕیس و عالم
ع : 13 ، گ : 104
ئەگەر ئەم دەقەش بە بێ دەستکاری کردن بیخەینە سەر رێنووسی نوێی کوردی ، بەم جۆە دەنووسرێ :ـ
قازیی نەسرو موفتیی نازیم
تێ دەگەن تا مودەڕیس و عالیم

8 ـ نووسەر لە هەمان ستوونی دووەم و لاپەرە (27)دا دێرە شیعرێکی حاجی بەم جۆرە خستوتە روو :ـ
پەشمە حاجی (••••) وەکوو جاران
بێرەوە سەر حیکایەتی کوردان
بەکەمێك وورد بوونەوە ، دەبینین نیوە دێرە شیعری یەکەمی (2) برگەی لە کورتی داوەو ، دیارە ووشەیێکی لێ پەڕیوە ووشەکەش دوو برگەیی یە ، چونکە سەرتاپای هەڵبەستەکە لە سەر کێشی (10) برگەیی دەڕوات ، جا بۆ ئەوەی بگەینە راستیی دەقی شیعرەکە وا ڕاستە سەیریکی سەرچاوە چاپ کراوەکانی بکەین کە بەم جۆرە راست و دروستە نواسراوە :
پەشمە حاجی (وەرە) وەکوو جاران
بێرەوە سەر حیکایەتی کوردان
ع : 13 ، گ : 104
لە مەوە بۆمان دەرکەوت کە فرمانی داخوازیی (وەرە) لە دەقی لای نووسەر پەڕیوە

9 ـ نووسەر لە ستوونی دووەمی لاپەرە (27)دا دێرە شیعرێکی حاجی بەم جۆرە هێناوەو پشتی بە (کۆمەڵەی عەبدورەحمان سەعید) بەستوەو دەڵێ :ـ

قوڕی کوێ کەم بە سەر خۆما لە (غیرەت)
خەوم نایێ لە داخی موڵك و میللەت

لە کاتێ کە سەرنج دەدەینە دەقەکەی چاپی سێیەمی دیوانەکەی حاجی دەبینین وشەی (غیرەت) نییەو (غوربەت) ە ، لە راستیشدا حاجی لە غوربەتیدا لە داخی دواکەوتنی میللەتەکەی قوڕی پێواوەو گوتوویەتی :-

قوڕی کوێ کەم بە سەر خۆما لە (غوربەت)
خەوم نایێ لە داخی موڵك و میللەت
گ : 113

بۆیە ئەم دەقەی دوایی بە پێی مەنتیق گونجاوترە لە چاو دەقەکەی پێشوو ..

10 ـ نووسەر لە هێنانەوەی ئەم دێرە شیعرەی خوارەوەی پشتی بە دەقی چاپی سێیەمی دیوانەکەی حاجی بەستووە بە بێ ئەوەی حیسابێك بۆ زمانی ئەدەبیی حاجی شاعیری سەدەی نۆزدەهەم بکات و ئەمەش دەقەکەیەتی :-

هەموو زاناو هونەروەرو میرن
زیرەك و ژیرو ئەهلی تەدبیرن
کاروان : 28 ، گ : 100

ئەگەر سەرنجێك بدەینە دەقی ناو (کۆمەڵەی عەبدوڕەحمان سەعید)ی ساڵی 1925 ، بەر لەوەی دەستی تێ وەربدرێ ، بە زمانی ئەدەبیی سەردەمی حاجی نووسراوەو ، بە رای من گەلێ لە دەقی (دیوانەکە)ی راستترە ، چونکە ئەو کات بەو جۆرە نووسراوەو ، ئێمەش دەیهێنینە سەر رێنووسی نوێ :-

هەموو عالیم و هەموو شێخ و میرن
زیرەك و ژیرو ئەهلی تەدبیرن
ع : 50

هەر خوێندەوارێکی کورد ، کەمێك ئاگاداری کاروانی رۆشنبیریی و ئەدەبی کوردی بێ ، ئەو راستییەی لە لا ئاشکرایە وشەی وەکوو (زانا) لە جیاتی (عالم)و (هونەر)و (هونەروەر) و (هونەرمەند) لە جیاتی (فن) و (فنّان) لەم نیوە سەدەیەی دواییدا سەریان هەڵداوە ، دەنا پێشتر هەر (عالم) و (فنّ) و (فنّان) بەکارهاتوون .

بۆیە نا چێتە عەقڵەوە حاجی لە سەدەی نۆزدەهەمدا وشەکانی (زانا)و (هونەروەر) ی بەکارهێنا بێ . بۆیە دەڵێم نە دەبوایە نووسەر وا بە بێ سێ و دوو لێکردن بە دەقی (دیوانەکەی حاجی) رازی بێ و ، دەبوایە بگەڕێتەوە بۆ دەقی کۆنترو راستتر ، بەر لەوەی دەستی گۆڕانکاری بگاتێ .

11 ـ لە ستوونی یەکەمی لاپەرە (28) دا ، نووسەر لە دێرە شیعرێکی حاجی وشەی (کن)ی کردووە بە (لا) ، لەو کاتەی کە گەلێکی وەکو نالی و کوردی ... ئاوەڵفرمانی شوێنیی (کن) یان لە پاڵ (لا) دا بەکار هێناوە . لە کارواندا بەم جۆرەی نووسیوە :-

دان و بەخشینیان لە لا باوە
خوێنی مەیدانیان لە (لا) ئاوە

کەچی لە هەموو سەرچاوە چاپ کراوەکانی شیعرەکەی حاجیدا ، بەم جۆرەی خوارەوە هاتووە :-

دان و بەخشینیان لە لا باوە
خوێنی مەیدانیان لە (کن) ئاوە
ع : 50 ، گ : 100

12 ـ لە ستوونی دووەمی لاپەرە (28) دا ، نووسەر دێرە شیعرێکی حاجی بەم جۆرە نووسیوە کە لە هیچ سەرچاوەیێکیدا بەم شێوەیە نەهاتووە :-

ئایین و مەزاهیب و (رەسائیل)
وا کردیە فیرقەو (قەبائیل)

کەچی راستییەکەی لەلای (عەبدوڕحمان سەعید) و (گیوی موکریانی) دا بەم جۆرەی خوارەوە هاتووەو دەڵێ :-

ئایین و مەزاهیب و (رەسائیل)
وا کردیە فیرقەوو (قەبائیل)
ع : 54 ، گ : 94

چونکە هەڵبەستەکە هەمووی لەسەر کێشی (10) برگەییە ، بەڵام لەلای نووسەر بووە بە (11) برگەیی بە زیاد کردنی (ی) ی کۆتایی شیعرەکەو کاتێك لابرێ هاوکیش دەر دەچێ .

13 ـ لە دوا دێری ستوونی دووەمی لاپەرە (28)ی کارواندا ، نووسەر دێرە شیعریکی حاجی بەم جۆرە نووسیوە ، بێ

ئەوەی پشت بە چ سەرچاوەیێك ببەستێ :ـ

بێگانە (یە) لە تەرجەمەی زمانی
ئەسراری کتێبی خەلْکی (دەزانی)

بەلام بە کەمێك ووردبوونەوە ، هەست دەکەین کێشی شیعرەکە لە چاو ئەوانی‌تر ، برگەیێکی زیادە ، کە دەگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە چاپکراوەکانی دەبینین لە هەردووکیاندا بە جۆرێکی تر هاتووەو دەقی شیعرەکە بەم جۆرەی خوارەوەیە :ـ

بێگانە لە تەرجەمەی زمانی
ئەسراری کتێبی خەلْکی (زانی)
ع : 9 ، گ : 135

دەبینین کێشی شیعرەکە راستبووەوەو لەگەلْ کێشی دێڕەکانی‌تردا دەڕوات ..

14 ـ لە ستوونی یەکەمی لاپەڕە (29) دا ، نووسەر بە پێی بۆچوونی خۆی دێڕە شیعرێکی حاجی گۆڕیوەو بەم جۆرەی لێ کردووە :ـ

ئوستادی خەتن لە ئەم (سێ زمانە)
وەك دێ لە زمانی خۆی (بێگانە)

دەبینین لە نیوە دێڕی یەکەمدا (ئەم سێ زمانە) هاتووە !! لە نیوە دێڕی دووەمیشی ووشەی (بێگانە) پەیدا بووە ، بەلام نازانین چۆن هاتووە ؟ چونکە لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەهاتووەو ، لە هەموویاندا هەر بەم جۆرەی خوارەوە هاتووە :ـ

ئوستادی خەتن لە ئەم سێیانە ،
وەك دێ لە زمانی خۆی نەزانە !
ع : 9 ، گ : 135

مەبەستی حاجی ئەوەیەو دەلْێ : «کورد لە زمانەکانی عارەبی‌و فارسی‌و تورکی‌دا مامۆستایە ، کەچی لە زمانی کوردیی خۆیدا نەزانە !»

15 ـ لە دێڕی پێنجەمی ستوونی یەکەمی هەمان لاپەڕەی (29) دا ، نووسەر دێڕە شیعرێکی حاجی بەم جۆرە نووسیوە :ـ

میللەتی بی کتێب‌و نووسین
غەیری کوردان نییە لە رووی زەمین

بە کەمێك ووردبوونەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ووشەیێکی یەك برگەیی لە نیوە دێڕی یەکەمی پەڕیوەو ، کە دەگەڕێینەوە سەر دەقی سەرچاوەکانی دەبینین بەم جۆرە راست‌و تەواوە نووسراوە :ـ

میللەتی بێ کتێب‌و (بێ) نووسین
غەیری کوردان نییە لە رووی زەمین
ع : 9 ، گ : 135

لەوانەشە پەڕینی ئەم ووشەیەی (بێ) لە هەلەی چاپەوە رووی دابێ‌و لەجێی خۆیدا نووسەر بە ڕاستی نووسی بێ .

16 ـ لە لاپەڕە (29)دا نووسەر دێڕە شیعرێکی حاجی هێناوەتەوەو ، تا رادەیەك پشتی بە چاپی سێیەمی دیوانەکەی بەستووە کە دەلْێ :ـ

کتێب‌و دەفتەرو تاریخ‌و کاغەز
گەر بە کوردی بنووسرایە زەمانی

ئەگەر نیوە دێڕی یەکەم لە سەرچاوەکاندا چ جیاوازییێکی وای تێدا نەبێ ، ئەوا نیوەی دووەمی جیاوازییێکی زۆر سەرەکی تێدایەو ، لەلای مامۆستای نووسەر بەم جۆرە نووسراوە :ـ

(گەر) بە کوردی بنووسرایە زەمانی

دەبینین لە چاپی سێیەمی دیوانەکەی حاجی بەم جۆرە هاتووە :ـ

بە کوردی (گەر) بنووسرایە زەمانی
گ : 71

بەلام بە لای منەوە ئەو دەقەی (رۆژی کورد) لە هەمووی راستترە کە دەلْێ :ـ

کتێب‌و دفترو تاریخ‌و کاغذ
بە کردی گر بنواسرایە زبانی [7] .

ئەگەر ئەم دێڕە شیعرە بە ڕێنووسی ئەمڕۆی زمانی کوردی بنووسین دەبینین بەم جۆرە راست‌و دروستە دەردەچی‌و جێگەی پشت پێ بەستنە :ـ

کتێب‌و دەفتەرو تەئریخ‌و کاغەز
بە کوردی گەر بنووسرایە زبانی

**هەرچەندە ووشەی (زمان)ی ئاخاوتن لە ووشەی (زبان) کوردی ترە ، بەلام بە رای من حاجی بەپێی زمانی ئەدەبیی سەدەی نۆزدەهەم (زبان)ی بەکارهێناوە ،

بۆیه له (رۆژی کورد) یش هەر به (زبان) هاتووه .

17 ـ له لاپەرە (29)دا ، نووسەر دێرە شیعریکی حاجی بەم جۆرەی خوارەوەی خستۆتە ڕوو :ـ

بولغارو سێرب و یونان ، هەم ئەردنی قەرەتاخ
هەر پێنجان به ئەژمار نابن به قەددی بابان

ئەوەی ڕاستی بێ ووشەی (بولغار) هەڵەیەو (بولغار : بولگار) ڕاستەو (سێرب) نی‌یەو (صرب : سیرب) ە که وولاتێکه ئێستا بەشێکه له یوگۆسلافیاو (ئەردنی) نی‌یەو (ئەرمەنی) یه ، چونکه له سەردەمی حاجیدا مەسەلەی (ئەرمەنستان) له ئارادا بوو ، ناوی ئەردن هەر نەبووه تا شەری یەکەمی جیهان و پەیمانی (سایکس ـ بیکۆ) .

بۆیه به قەناعەتی من دەقه ڕاستەکەی بەم جۆرەیه :ـ

بولغارو صیرب و یونان ، هەم ئەرمەنی و قەرەتاغ
هەرپێنجیان به تعداد نابن به قەددی بابان

ع : 54

18 ـ له لاپەرە (31)ی کاروانـدا ، نووسـەر دێرە شیعـریکی حاجی بەم جۆرە نووسیووەو ، وا دیاره تەنیا پشتی به چاپی سێیەمی دیوانەکەی حاجی بەستووەو دەڵێ :ـ

له دەوری کولی باغی شاری کۆیه ،
دوو سەد (مەن) داری زەیتوون به جۆیه

گ : 132

به کەمێك ووردبوونەوەو گەڕانەوه بۆ سەرچاوەی کۆنتر بۆمان دەردەکەوێ ، ووشەی (مەن : باتمـان) که بـۆ کێشان به کاردێ هەڵەیەو ڕاستی‌یەکەی (بن)[6] ە ، که بۆ بنـەدار ، یـان بنـەدرەخت بـەکـاردێ . قـەتیش له کوردستاندا تا ئەمرۆش باو نەبوه داری سووتاندنیش به (مەن و هۆقه) بفرۆشری بەلکوو هەر به بار فرۆشاوه . بۆیه وا ڕاسته پشت به سەرچاوەکەی ( عەبدوڕەحمان سەعید) ببەستین که دەڵێ :ـ

له دوری کولی باغی شاری کویه
دوو صد بن دار زیتونی به جویه

ع : 26

که ئەم دەقەش دێنینه سەر ڕێنووسی نوێی کوردی بەم جۆرەی لێ‌دێ :ـ

له دەووری کوللی باخی شاری کۆیه ،
دوو سەد بن داری زەیتوون به جۆیه

19 ـ دیسانەوه له ستوونی یەکەمی لاپەرە (31)ی کارواندا ، نـووسـەر نمـوونـەیێکی دیکـەی له شیعـری حـاجی هێناوەتەوەو دەڵێ :ـ

له ئێوه کامتان بوو یەك دوو (جاریك)
بکاته کیسەیەك یاخود خەراریك

ئەوەی شیاوی باسه ، له هەموو سـەرچاوەیێکی ئـەم شیعره له جیاتی «جاریك» ووشەی «باریك» هاتـووەو ، مەبەستی حاجیش ئەوەیه بڵێ : «هەر کەسێکی بیەوێ ڕۆنی زەیتوون دەربێنێ ، با یەك دوو (بار) ی لێ بکاته ناو کیسەیەك یان خەراریك و له ناو (کۆل)[7] ی دابنێ و چەند پێ‌لەقـەیێکی لێ بـدات تـا ڕۆنی زەیتـوونی لێ بێتـه خـوارەوه . مـەبـەستی چـۆنیـەتی دەرهێنـانی ڕۆنی زەیتـوونەو ، ڕاستیی دەقی شیعـرەکەی حـاجی بـەم جورەیه :ـ

له ئێوه کامتان بوو یەك دوو بارێك
بکاته کیسەیەك یاخود خەرارێك

ع : 26 ، گ : 133

20 ـ له ستوونی دووەمی لاپەرە (31) ی کارواندا ، نووسەر نمـوونەیێکی دیکـەی له شیعری حـاجی بەم جـۆرەی خوارەوه نووسیوه :ـ

له بەینی میللەتی خۆتان به یاری
بکەن تەجسیمی شاخ و دارو باری

که تەماشای سەرچاوەکانی ئەم دەقه دەکەین دەبینین ووشەی (تەجسیمی) هەڵەیەو مانایێکی گونجاوی لەناو شیعرەکەدا نی‌یه ، بەلکوو له هەموو سەرچـاوەکانـدا ووشەی (تەقسیم) هاتووەو بەم جۆرەی خوارەوەیه :ـ

له بەینی میللەتی خۆتان به یاری
بکەن (تەقسیمی) شاخ و دارو باری

ع : 27 ، گ : 113

جگه لەم تێبینی‌یه سەرەکییانەم ، هەنـدێ سەرنـج و وورده تێ بینی دیکەم له بارەی چەند ناتەواوی و داڵەنگـانی شیعرەکانی حاجی و نووسینەکەی مامۆستا هەیه ، بەلام لەبەر ئەو ئیحتیمالەی که دەشێ هەندێکیان بکەونه ناو بازنەی هەڵەی چاپەوه بۆیه لێیان بێ دەنگ بووم .

ئەو کاتەی کە نووسەریش باسەکەی کردووە بە نو بابەت دەچویە بە ووردی لەسەر خاسیەت و هەل و مەرجەکانی هەر یەک لەو بابەتانەی بنووسیبایە ، ئینجا دەستی کردبایە نموونە هێنانەوە .

لە راستیشدا لە زوربەی بابەتەکانی نموونەکانی پترن لە لێکوینەوەکەی لەو کاتەی کە لە بەرنامەی لێکولینەوەی ئەدەبی ، دەبێ لێدوان و خاسیەت دەربرین و شیکردنەوەی جەوهەری بابەتەکە گەلێ پتر بن لە نموونەکانی .

دوا تێ بینیشم بەرامبەر باسەکەی نووسەر ئەوەیە ، میهرەجانەکەی حاجی قادری کویی لە ئێوارەی روژەکانی 24 و 1971/6/25 دا لە شاری کویە کراوە [10] ، واتا : دوو ئێوارەی خایاندووە . نەک وەکوو ماموستا رەشوانی دەلێ : لە روژانی 22 — 1971/6/24 ئەو میهرەجانە بەردەوام بووە ، ئەو ئێوارەی کە ئەو دەلێ : کوتایی هاتووە ، ئەو ئێوارەیە لە نوێ دەستی پێ کردووە .

خوێندەواری بەرێز ، ئەمە بوو چەند سەرنج و تێبینییەکم بەرامبەر بە باسە ئەدەبییەکەی ماموستا رەشوانی و ، ئاشکارەشم بە هیچ جورێک لە نرخی باسەکەی کەم ناکاتەوەو دای نالەنگێنی و مەبەستیشم لەم نووسینەمدا تەنیا پاراستنی دەقی شیعرەکانی حاجییەو ، دەبا چیتر دەقی جیاوازو شێواوی شیعرەکانی ئەم شاعیرە نەتەوەییە گەورەمان نەکەوێتە بەردەست رەخنەگرو لێکولەرەوەی ئەدەبی کوردی بە ناتەواوی ، لەگەل ئەو پەری رێزمدا بو نووسەرو خوێندەواران .

**پەراوێزو سەرچاوەکان :**


1 ـ حسەین رەشوانی ـ گوڤاری کاروان ـ ژمارە (7) . ل 24 — 31 ، سالی 1983
2 ـ هەمان سەرچاوە ، ل : 26
3 ـ بروانە ـ عەبدورەحمان سەعید ـ کومەلە شیعری حاجی قادری کویی بەغدا 1925 ، ل 7 ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کویی ـ هەولێر 1969 ، چ 3 ، ل : 74 .
4 ـ حسەین رەشوانی ـ گوڤاری کاروان ژمارە (7) سالی 1983 ، ل 26
5 ـ نەسر : نثر ، پەخشان .
6 ـ رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ـ کوری زانیاری کورد ـ بەغدا 1976 ، ل 336
7 ـ روژی کورد ـ بلاوکردنەوەو پیشەکی و لەسەر نووسینی جەمال خەزنەدار بەغدا 1981 ژمارە (2) 26ی تەمووزی 1913 . ل : 28
8 ـ بن ، بنک : بو بنەدارو بنە درەخت بەکاردێ . بروانە گوڤاری روشنبیری نوێ کەریم شارەزا ، بەغدا 1978 ، ژمارە (70)
9 ـ کول : کارگەیێکی بچووکە بو گوشین و دەرهێنانی دوشاوو سرکەو رونی زەیتوون
10 ـ گوڤاری هەولێری ژمارە (2) سالی (2) 1971 ، ل 44 .



**پێزانی ئالیخانی**

**● دهوک ●**


**پەیڤەک : ـ**

ئەگەر بەرێ خو بدەینە بەرپەرێن توورێ کوردێن ئەرمەنستانا سوڤیەت دێ بومە دیار بیت توورێ وان یێ لسەر شەنگستێن توورێ فولکلورێ کوردی هاتی یە دانان ، ژ چیروک و داستانا بەرە ـ بەرە هەتا شیاین پلا روشەنبیری و هونەرییا کوردی نوی ساخکەن دناڤ ئەرمەنستان سوڤیەت دا .

بێ گومان کوردێن سوڤیەت پێش شورەشا ئوکتوبەرێدا گەلەک دهەژارو بێ بها بون ، بەلی پشتی شورەش ب سەرکەڤتی کوردێن قەفقاس هەولدا مینا هەمی نەتەوێن دی کەلەپوری مللەتی پێش بێخن . هەلبەت لسالا (1920)[1] ێ یێکەمین ژمارە ژروژناما (ریاتازە) دەرێخست ، (1925) ێ «55»[2] پێنجی وپێنج خاندنگەه ل هەرێما قەفقاس و ئازربیجان ڤەکرن ، پشتی ڤێ سالێ کونگرەک گرێدا «76» هەڤتێ وشەش کەس پشکدار بون بابەتێ سەرەکێ نەهێلانا نەخوێندنێ بو ، ل «8 — 14» ێ تیرمەها سالا (1934) ێ کونگرەکا بەرفرەهتر گرێدا «90» نوت کەس پشکدار بون . زوربەی مللەت و دراوسێێن سوڤیەت پشکداری کر ، بازێرێ یەریڤانێ .

( یێکەمین بەرهەمی کوردێن سوڤیەت کەشکولەک بو ل سالا (1932) ێ ژبن چاپێ دەرکەت )[3] . هەر ژنیڤا یەکێ یاچاخێ بیستێ هەتا نهو گەلەک تورەڤان ـ بوێژ ـ سەرێ خوێ ل پەیڤا کوردی راکری ، پێنڤیسێ خوێی تیژکری ژوان تورەڤانا : عەرەبێ شەمو ، قاچاخێ مراد ، وەزیرێ نادر ، د . حاجییێ جندی ، ئەمینێ عەبدال ، ئوردیخانێ جەلیل ، جەلیلێ جەلیل ، کوردوییڤ ، سیامەندوڤ ، ... هـ . د . بەلی ستێرا ژهەمیا گەشتر د ئاسمانێ هونەرو توورێ کوردیدا ماموستایێ مەزن عەرەبێ شەمویە .

**عەرەبێ شەمو : ـ**

عەرەبێ شەمو ب بەرهەمترین و ب ناڤ و دەنگ ترین نڤیسەڤانێ کوردێ سوڤیێتە ، هەروەسا یێکەمین پسپورو دانەرێ رومانا ـ چیروکا درێژا ـ کوردییە ل گشت ڤولاچێن کوردستانا مەزن .

# شەمۆ



عەرەبێ شەمۆ چیایەکەو ژ چیایێ [ ئەلەگەز ][4] بلندترە ، ستێرەکەو ژ ستێرا گەلاڤێژێ روهن و گەشترە ، هەروەسا کەلایەکە دناڤ تورەڤانێن کورداو سوڤیەتیێ دا، نەمازە بێ شیای پەیڤا کوردی بکەت خۆدیك «ئاوێنە»[5] و دانیتە بەرچاڤێن جیهانێ . هەتا جیهانا سوڤیەتیو ئەوروپی بەهایێ ملەتێ کوردو پەیڤا رەسەنا کوردی بزانن .

ئەڤە لایەکو ژ لایەکێ دیڤە جهێ شانازی یەکا مەزنە بو گشت نڤیسەڤانو روناکبیرێن کوردێن سوڤیەت بتایبەتی بو عەرەبێ شەمۆی چنکی د دویرن ژ دلێ کوردستانێ ئو ئەڤ هەولەو ئەڤ بایەخەو پویتەدایە ب نڤشو دیروكو ب هێزئێخستنا کتێبخانا کوردیو ساخکرنا بیروباوەرێن وەلاتپارێزیێ .

## ع ـ شەمۆکی یە ؟

ناڤێ وی عەرەبە کورێ ( شێخ شەمۆیە )[6] کورێ شێخ شامیلە . بزمانی روسی دبێژنێ : ( عەرەب شەمویێڤیچ شامیلوڤ )[7] ، ژ بنەمالەکا شێخێن کوردێن بناڤودەنگێن یەزیدی نە . نڤیسەڤانێ مە ل سالا (1895) ێ ل گوندێ سوسز هەرێما قارس ل کوردستانا تورکیا یێ هاتی یە دنیایێ . هەر ژ بچویکاتی مروڤەکێ زفت وهشیارو زانا بو ، بگەوهەری داریتی بو ، هێش ژیێ وی نەگەهشتی یە بیست سالیێ هەست ب سەربەستی یێو وەلاتپاریزیێ دکر ئو دنێرا ڤان ملەتێن گەهشتیێ نە هیڤیو ئارمانجێن خو کا ل چ ئاستن .. ئو ملەتێ کورد ل چ ئاستە .

لەورا گەلەك مەست ب ژارییا ڤێ ملەتی دکر ئو هەولدا هندەك ژ ئەگەرێن داکەتنا ملەتێ کورد نەهێلیتن ، رێکێن راسترو روهنتر .. بدەت بەرچاڤ ، هەلبەت ل سالا (1917) ێ ل روسی بو ، بدەستێ دەولەتا قەیسەرییا روسی هاتەگرتنو کرە د زیندانێ دا ـ ژبەر بارێ رامیاری . بەلێ هێشتا یێ بچویك بو لەورا دەستویردا ، پشتی دەستویردانێ برێکەڤت بو باژێرێ ( سناڤروپول ) ل باکورێ قەفقاس .

سالا (1918) ێ لناڤ ـ کومونستێن ـ قەفقاسدا ماو ئو بەرە بەرە گەوهەرێ خو ئاشکرا کرو تێگەهشتنا خو دانا بەرچاڤ ، هەر د وێ سالێدا ، بو ئەندامێ پارتا ( بولشەویك ) .

ل ڤێرە بوێژێ مە یێکەمین کورد بو شەرەفا ئەندامەتی یا ڤێ پارتێ وەرگرتی .. نەمازە چاڤ ب ( لینینو کروڤی ) کەت ، ئو هەست ب کارو کریارو بیروباوەرێن وا کرن .

- سالا (1920 — 1924) ێ لموسکو خاندنا ئاموژگایا روژهەلات ب دویماهیك ئینا .
- سالا (1924) ێ ژڤریڤە باژێرێ (یەریڤانێ) بو نوینەرێ کومیتا ناڤنجیا پارتا (بولشەویکا ئەرمەنستانێ) ل هەرێما کوردێن یەکێتییا سوڤیەت .
- سالا (1932)[*] ێ چو باژێرێ لینینگراد بو شاگردێ بەشێ دکتورایێ ل ئاموژگایا دویروکا ئەکادیمیا زانستی یاسوڤیەتی بەلێ ژبەر چەند ئەگەرا ب دویماهیك نەئینا ، ئو ژڤریڤە بو باژێرێ (یەریڤانێ)[8] .ئو لوێرێ ما هەتا سالا (1937) ێ .
- سالا (1937)[9] ێ خو ئامادەکر بو ناما دکتورایێ پێشکێشکەت . بەلێ نەهێلا بخوینیتو رابون هنارتە وەلاتێ « سیبیریا » ، پشتی (20) سالێن رەبەق جارەکا دی ژڤریڤە بو (یەریڤانێ) چو ناڤ رێزا پارتێ ، بەلێ ل سالا (1946) ێ دا ل وەلاتێ ( سیبیریا ) ژن ئیناو هەر لوێرێ بو بابێ سێ کچا : ـ [ آ ] ـ ڤێرا ـ ل سالا (1946) ێ هاتە دونیایێ ، [ ب ] ـ ئاسێ ـ ل سالا (1952) ێ ، [ ج ] ـ زینێ ـ ل سالا (1954) ێ .

عەرەبێ شەمۆ گەلەك بارگرانو خەمخورێ وەلاتێ خو بو : لەورا گەلەك ژیانەکا پرێشو سەختو ب ئازار دیت ، نەمازە بووی دیار بو کو باشترین رێك بو سەربەستکرنا ملەتێ ژارو ژێردەست ( بیروباوەرێن کومونیزمی نە )[10] . هەلبەت بدروستی لسەر وان بیروباوەرا چو ئو پویتەپێکر .. ئوبو خو کرنە خویم ـ شەنگستە ـ ژبلی وێ چەندێ کو چەند نامێلکەکێن رامیاری نڤیسین بو هشیارکرنا ملەتێ کورد . هەتا سالا (1978) ێ ل یەکێتییا سوڤیەت چو بەر دلوڤانی یا خودێ مەزن ، ئەڤ جیهانەب جهـ هێلا . راستە نڤیسەڤانێ مە بارکرو چو بەلێ نامریت ... چنکی پسپورو فاماو وەلاتپارێزو زاناو دلسوزێن مینا

سولتان ( عەرەبێ شەمۆ ) هەرێ لناڤ جیهانا دلێن کورێن ملەتیدا ساخنو قەد نامرن ..!!.

**چەند بابەتێن نڤیسەڤانی[11]: ـ**

**ع ـ شەمۆ « EREBE SEMO »**

1 — لناڤ کوردا ـ لناما کوردەکێ پارتی روژناما ( زاریا ڤوستوکا ) ، تفلیس 7 ی نیسانا (1924) ێ ، ژمارە 553 بپ — 4 —

2 — لناڤ یەزیدییان ( زاریا ڤوستوکا ) ، 4 ی حزیرانا (1924) ێ ز ، ژمارە 602 بپ ـ 3 ـ .

3 — کارێ پارتێ لناڤ یەزیدییا ، چاڤپێکەڤتنەك دگەل موستەشارێ لیژنا ناڤنجیا پارتا ( کو مونیستی ) ئەرمەنستان ، عەرەبی شەمو ( زاریا ڤوستوکا ) ، 25 ی خزیرانا (1924) ێ ز .

4 — گوندێن یەزیدییا ل ئەرمەنستانێ ( زاریا ڤوستوکا ) ، 8 ی نیسانا (1925) ێ ژمارە 845 بپ ـ 4 ـ

5 — گوندێن یەزیدییا « راپورتەك بو پلێنومییا پارتێ » ـ ( زاریا ڤوستوکا ) ، 21 ێ حزیرانا (1925) ێ

6 — گوندێن کوردێن یەزیدییا ( زاریا ڤوستوکا ) 9 ی تیرمەها سالا (1925) ێ ژمارە (930) بپ 4

7 — ل گشتییا کوردستانا ( زاریا ڤوستوکا ) ، 12 ی ئیلونا (1925) ێز « نیازاوی د کوردستانا گشتدا ، هەرێما کوردێن ئازربێجان ، لاچین ، کەلبەجار » 5 ، کو دبێژنە وێ کوردستان .

8 — یەزیدیێن کوچەر : ( نامەیەك ل ئەرمەنستا نێ ) ـ ( زاریا ڤوستوکا ) ، 15 ێ چریا دوویێیا (1926) ێ ز .

9 — ئەنجامێ کونگیرا کوردا ( زاریا ڤوستوکا ) ، 11 ی خزیرانا (1926) ێ بابەتێ وێ کونگیرێ ( کوردێن ئەرمەنستانێ ) بەستبو ب بارێ کشتوکالی ، کومەلایەتی ، روشنبیری ، ئەلفبا نڤیسا کوردی . مینا ئەز تێدگەهم نیازا شامیلوڤی لسەر لینیینێن ئەرمەنستانێ گرێدای (76) کەسا پشکداری تێداکربو ئو دەرگەهێ سەرەکیو هەلبژارتی لسەر نەهێلانا نەخوێندنێ بوو .

10 — هاڤینە هەوارێن ئەگمان ( زاریا ڤوستوکا ) ، 16 ی مایسا (1926) ێ ژمارە 1179 بپ 3 .

11 — داشناكو کوردو بەرەیتانیا ، ( زاریا ڤوستوکا ) ، 10 ی تیرمەها (1928) ێ ژمارە 158 (1824) بپ 2

12 — ئەلفبای کوردی ب تیپێن لاتینی ( زاریا ڤوستوکا[12] ) ، 21 ی تیرمەها سالا (1928) ێز .

13 — نڤێسینو ئەدەبێ کوردی ، (1929) ێ ب زمانێ ئەرمەنی .

14 — [ ئەلفبای کوردی ] یێ تازە سالا (1929) ێ ب زمانێ ئەرمەنی .

15 — کوردێ قەفقاس ، ل گوڤارا ( شورەشو خویندەواری ) . موسکو ژمارە = 15 — 16 = سالا (1930) ێ بپ [ 86 — 89 ] .

16 — ژیانا لینین (1930) ێ .

17 — کولخوزو سود بو جوتیاران ـ (1930) ێ .

18 — دویروکا شورەشا ئوکتوبەرێ ـ (1931) ێ

19 — لێکولین دخویندەوارییا کوردادا ، (زاریا ڤوستو کا ) ، 11 ی ئاغستوس (1933) ێ . ئەڤ لێکولینە پێك دهات بو گشت خویندەوارو لدویڤچویین ئاموژگایا نەتەوا .. ب سەروکاتییا عەرەبێ شەموێ ، لهەرێما کوردێن ئازربیجان ، گورجستان ، ئەرمەنستان بو گەهشتنا

ب پێکخستنا کوردا ل وەلاتێ سوڤیەتی .

20 — بابەت لسەر ئیزافە د زمانێ کوردیدا [ گوڤارا شورەش و نوسین ] ژمارە (1) سالا (1933) ێ بپ 51 ـ 56 هاریکاری د گەل کوردوییڤ و تسوکەرمان کرو نڤیسی .

21 — د بابەتێ مەسەلا تیپا دەنگدارا(!) د زمانێ کوردیدا ، چەماندنا ( شورەش ونوسین ) موسکو ـ لینینگراد بەشێ (1) ـ (1933) ێ بپ 179 — 180 ب هاریکارییا تسوکەرمان نڤیسی .

22 — مەسەلا نێرومێ د زمانێ کوردیدا.دگوڤارا بەریدا بپ 160 — 178 ب هاریکاری دگەل کوردوییڤ و تسوکەرمانی نڤیسی .

23 — بابەتەك لسەر دەرەبەگا دناڤ ملەتێ کوردادا . کومکرینێ ( مەسەلا مێژویا کومەلێ پێش کاپیتالیزم ) لینینگراد 1934 ، ژمارە (9 — 10) بپ 111 — 134 .

**چەند بەرهەمێن ع ـ شەموی : ـ**

1 — **شڤانێ کورد** : ـ یێکەمین بەرهەمێ نڤیسەڤانییە نەمازە ئەڤ رومانە سروشتییا دویروکا ژیانا ملەتێ کورد دگریت .. ئو د ڤێ رومانێدا پەسنا ژیانا ملەتێ کورد دکەت دبەری شورەشا ئوکتوبەرێدا . کانێ چەند ژیانەکا سەخت و تاری و ب نالەباری و ب هەژاری داعویرایە ـ دیتییە ـ . ل سالا (1930) ێ ب زمانێ کوردی بەلاڤکر .

2 — **کوردێ ئەلەگەز** : ـ (1936) ێ . ئەڤ رومانە ـ بەرهەمە لسەر وێ ژیانا سەخت و درا ملەتێ کورد رابوراندی و کێشایی دبن سیبەرا کەڤنە پەرستادا ئو هەتا بەرێوا دانیە ئەلەگەز ـ ئەرمەنستانا سوڤیەت نەمازە هەولدانا بو پەیدابونا شارەزاو پسپورێ کورد .

3 — **کوچاکێ درەڤین** : ـ یێکەمین چیروکا سەر شانوییە .. بوێژێ مە ل سالا (1931) ێ نڤیسای ، د ڤێ چیروکێدا هێرشێ دبەتە ـ دەست ددەتە وێ پەردا پاشڤەمایا پویچ یانکو هزروبیرێن کەڤنە پەرست دپێت و دهەلینیت لسەر زاروکێ کوردێ هەژار .

4 — **رەبەن ـ هەژار ـ** : ـ (1930) ێ . چیروکەکا سەرشانوییە ـ مسرح ـ هەروەسا یێکە ژ بەرهەمێن بناڤێن عەرەبێ شەمو .

5 — **دمدم** : ـ (1966) ێ . ئەڤ رومانە گەلەکا بناڤودەنگە ، یاهاتیە نڤیسین لدویڤ چیروك و سەرهاتی و رویدان دویروکا قەلا دمدمی .

6 — **بەربانگ** : ـ (1957)[13] ێ . ئەڤ رومانە بەرپەرەکێ ژ ژیانا ملەتێ کورد دیاردکەت . یاگرێدایە ب بیروباوەرێن سوشیالستیڤە .

7 — **ژینا بەختەوەر** : ـ (1959) ێ . ئەڤ رومانە بەرهەمە ، دپەیڤیت لسەر ژیانا کوردێن تورکیا .. ئو ئەو زولم و زورداریيا کورد .. ناچارکرین و ئاخا باب وباپیرا ب جەهێلاین ، ئو بەرێ خو داینە وەلاتەکێ دویر ژکوردستانێ مینا ئەرمەنستانا سوڤیەت . هەروەسا دیار دکەتی کاچەوا شورەشا ئوکتوبەرێ دەستێ خودا یێ ژ زورداریێ رزگارکرن .

8 — **کوردێ ئەرمەنستان** : ـ (1961) ێ سیناریویە بو سینەمایێ .

9 — **حەکایەتا کوردێ ناڤ خەلك** : ـ (1967) ێ .

10 — **کومکرینێ بەرهەمێ ع ـ شەموی** : ـ (1969) ێ .

11 — **گورانی و حیکایەتا کوردی** : ـ موسکو (1969)[14] ێ

مخابن هەر ژ سالا (1970 — 1978) شامیلوڤ ل مە بەرزەبوی چ بەرهەمێن وی بدەست مە نەکەتن یاخویایە نڤیسەڤانێ مە دەست نەدا هێلاینە ئو نهو ـ نوکە ـ مشە بەرهەمێن بڕ بها نڤیسانە .

یاهەژییە بێژین ژبلی ڤان دەرگەهێن مە دیارکرین گەلەك

پویته یادایه بچویکا چنکی گەلەك یاریێن ساخ کرین و نفیسانیەڤە مینا[15] : ـ

1 — کاروانێ خوێ ـ karwane xiwe .

2 — شیر شیرانێ ـ siv sivane .

3 — گوله ـ gule .

4 — تاتول ـ tatul .

5 — تەپانێ ـ tepane .

6 — غاردان ـ dan ، د .

**ژێدەرو پەیڤێن گران : ـ**

1 — رۆژمێری پیرەمێرد ـ 1982 ـ نەریمان سەرنوسەرێ ڤێ رۆژنامێ ع ـ شەمۆی بو شمس کردستان ـ ژمارە [45 ، 46] 1977 ، بپ 7 .

2 — گوڤارا توتن ـ ژمارە (1 ، 2) سالا 1969 ، بپ 67 ، 52 مارف خەزنەدار .

3 — ژێدەرێ بەرێ .

4 — ئەلەگەز .. چیایەکێ کورد ئاکنجی‌یە ، دکەڤیتە باشوری رۆژئاڤایێ یەریڤانێ ، زوربەی کوردێن ئەرمەنستانا سوڤیەت دکەڤنە رەخ و روێن ڤی چیایی .

5 — هندی هند !! بەرهەمێن ع ـ شەمو دپر بها نە هەمی گرێ داینە ب ئارمانج و دویرۆکا ملەتێ کوردڤە ، هەتا باهراپتر گوهرینە ڤان زمانا : ـ روسی ،گورجی ، ئەرمەنی ، ئاسوری ، ئنگلیزی ، فەرەنسی ، ئازربیجانی ، ئالەمانی ، عەرەبی ، .... د . ژبلی وێ چەندێ کو وی ژی ئەڤ زمانە دزانین : ـ روسی ، ترکی،یونانی ، ئاسوری ، ئەرمەنی .

6 — [شەمۆ] کورتی‌یا ناڤێ (شمس الدین) ە ژێدەرێ بەرێ .

7 — ژێدەرێ بەرێ .

* دگوڤارا [ شمس کردستان ] ژمارە 45 ، 46 سالا 1977 بپ (7) دبێژیت : شامیلوڤی ل سالا (1934) ێ ناما دکتورایێ ئینا ل لینینگراد .

8 — یەریڤان : بێگومان دوێ جهێ کوردێن ئەرمەنستانا سوڤیەت لێ دئاکنجی ، مەزنترین ئاڤەدانی‌یا وێ هەرێمێ گوندێ ئەلەگەزە ل زوزانا ئەلەگەزێ ، بەلێ مەزنترین جهێ کولتوریێ ( رەوشەبنیری و رۆژنامە نفیسین و خویندنێ ) بازێرێ یەریڤانێ‌یە .

9 — رۆژی کوردستان : ژ (6) بەرپەرێ (37 — 39) ، سالا 1973 .

10 — ژێدەرێ بەرێ .

11 — ژێدەرێ بەرێ .

12 — عەرەبێ شەمو ل سالا 1929 یێکەمین ئەلفبایا کوردی ل سەر خویمێن تیپێن لاتینی دانا ئو دگەل ـ مارا کولوف ـ بو ڤێ ئەلفبایێ نفشتوکەك دانا : ـ ( خوخوهێن بونا خاندنا نفیسارا کرمانجی ) .

* ـ رۆمانا ژینا بەختەوەر 1959 گوهەری زمانێ روسی چاپا یێکێ ب روسی 1965 ، چاپا دووێ 1971 چاپا سێیێ 1974 ، شمس کردستان ـ ژمارە [45 — 46] سالا 1977 ، جودت بلال .

13 — مع الاکراد : تومابوا ـ ترجمة آواز زنگنه ـ 1975 ص 152 — 154 .

* ـ د کتێبا (مع الاکراد) ، تومابوا دبێژیت رومانا شفانی کورد ل سالا 1935 بەلاڤ کر ، بەلێ یالەنگە ، بەلکی ل سالا (1930) ێ ب زمانێ کوردی ، (1931) ێ ب زمانێ روسی ، (1957) ێ ب زمانێ گورجی هاتە چاپ کرن .

14 — کومەلە تێکستی فولکلوری کوردی ـ پروفیسور ـ ق ـ کوردوییف ، وەرگێرانا سەر رێنوسێ کوردی : شوکور مستەفا ، ئەنوەر قادر محمد .

دبێژیت : ـ کتێبا ( ستران و حیکایەتا کوردی ) : ع ـ مورادوف ، مارگرێت رودینکو ، قەناتێ کوردو ، عەرەبێ شەمو هەڤ پشك ل موسکو چاپ کر .

15 — مع الاکراد : المصدر السابق ـ ص 84 .

16 — خویم : شەنگستە ، بنچینە .

بوێژ : نفیسەڤان ، ئەدیب .

زفت : چست ، پەیت ، چەلەنگ .

پسپور : فاما ، شارەزا ، کادر .

غاردان : کرنە غار ، ع ـ (السباق)

زاریا فوستوکا : رۆژنامەکە ـ ئانکو (فجرالشرق) ـ ئەلندا رۆژهەلات .

تێبینی : ـ هەمی ژێدەرێن مە دبێژن سالا (1895) ێ هاتی‌یە دنیایێ بەلێ دگوڤارا [ شمس کردستان ] العدد = 45 — 46 سنة 1977 ، ص (6) دا گوتارەکا بەلاڤکری ب ناڤێ [ بمناسبة الذکری الثمانین لمیلاد الروائي الکردي عرب شمو ] دبێژیت : ل 23 کانوینا دووێ (1897) ێ ل قەزا قارس یێ هاتی‌یە دنیایێ .

# «شەهسوارێ «ئیجابی»
# دچـــیـرۆکـــێ دا

عبدالرحمن نقشبندی

( بدەست کاریڤە ژگوڤارا - الثقافە الاجنبیة -
ژمارە (1) سالا (1980) یٚ وەرگیرایە )

* روژناما ( لیترا تورنایا گازیتا ) - ( روژناما ئەدەبی ) یاکو تورەڤانیٚت سوڤییت دئیننەدەر ، چڤـاتەك گـریٚدا لســەر عەگیدیٚ و شەهسواریێ دچیٚروکیٚدا . یانی ئـەو مروڤیٚ چیٚروکڤان یـان چیٚروکنڤیس گـرییا چیـروکا خـو لسەر ددانیت و دڤیٚ جڤاتیٚدا لسەر هندیٚ هاتە ئاخفتن کو کانیٚ چەوا هەر چیٚروکەك پیٚدڤی دو ( شخصية ) تانە ، یێ باش ( ئیجابی ) و یێ خراب ( سلبی ) .

دڤیٚ جڤـاتیٚدا چـەنـد نڤیسـەڤـانـەکـیٚن بنـاڤ ودەنـگ پشکداربون ژبو دیارکرن و خویاکرنا ڤیٚ چەندیٚ ، وەکی هەردو هوزانڤانیٚن بناڤ ودەنگ ( رسـول حمزاتـوف ) و ( یفتشینکو ) و رومان نڤیس ( ئانار ) و چەند نڤیسەڤانیٚن دی .
لبەراهیێ رەخنەگریٚ بناڤ و دەنگ بەرپسیاریٚ مەتحەڤا ( پوشکین ) یٚ و نڤیسەریٚ کتیٚبا ( ئـەدەب و شورەش ) ( یوری ئەندرییف ) دەست بئاخڤتنیٚ کرو گوت :

* مروڤیٚ ( ئیجابی ) دچیٚروکیٚدا ئەو مروڤە یێ کاریٚ خو براستی و دروستی بکەت و ئەو کاریٚ ددەنەڤیٚ بنەجهـو ژدل بکەت و مروڤیٚ ( سلبی ) یان یێ ( ئەخلاقیەت ) لنك نەبیت ، ئەوە کو کاریٚ خـو براستی و دروستی و بنـەجهـ نەکەت . ئەڤ هزرو بیرە ئەویٚن ( ئەندرییف ) یٚ دیارکرین دژی یان بەروڤاژی وان هزرو بیرانە ئەویٚن هەتا نهو لسەر مروڤیٚ ( ئیجابی وسلبی ) دچیٚـروکیٚدا دهاتنــە گوتن . ژبەرکو بەری نهو وەسا یادیاربو کو مروڤیٚ ( ئیجـابی ) دچیٚروکیٚدا ئەو مروڤە یێ زیرەك یێ کو دشیٚت وان شولا بکەت ییٚن کو مروڤیٚ ( ئیعتیادی ) نەشیٚت بکەت . بکورتی ، لدویڤ هــزرو بیــریٚن ( ئــەنــدرییف ) یٚ . مــروڤیٚ ( ئیجابی ) ئەوە کاریٚ خو یێ روژانە براستی و دروستی بکەت یانی مروڤیٚ ( ئیعتیادی ) .
هەرچەندە ئەڤ هزرو باوەریە لسەر مروڤیٚ ( ئیجابی ) دچیٚروکیٚدا تشتەکیٚ پیٚـدڤی یە ژبـو بلندکـرن و پالدانـا مروڤی کو ئیٚدی کاریٚ خو براستی و دروستی بکەت ، لیٚ دیارکرنا ڤان هزرو باوەریا بڤی رەنگی بو سویچا رەخنەو پشتگیریا وان تورەڤانا ئەویٚن جڤات بوین .

* تورەڤانیٚ ئەرمەنی ( سیمونیان ) یٚ بگەرمی پشتگیریـا ( ئەندرییف ) یٚ کرو گوت : کاریٚ خارو سارو نەژدل دڤیٚت ئەدەب رویت و رسوا بکەت ، چنکو لبەر چاڤیٚن مەو لژییی مە ، گوهرینیٚت مەزن ییٚن دژیانا جڤاکیٚدا هـاتینەکـرن و هەمی لویٚ باوەریێ بون کو نەهیٚلانا چەنـد سنگەبـەرو ئالوزییٚت ئابوری و ( ئەخلاقی ) دیٚ بنە سویچا گوهرینا ژینا ( روحی وسایکولوجی ) یامروڤی ، لیٚ بەروڤـاژی ، نەکو هەر نەهاتنە گوهرین ، بەلکی ئالوزتر لیٚهاتن . بناسین ڤیٚ چەندیٚ ژی هەچکو ( سیمونیان ) دبیٚژیت ، ئەوە کو ئەو گوهرینیٚت جڤاکی و ئابوری و هەمی هاڤلییٚت مروڤایینیٚ

هـاتینەکـرن ژ لایێ بیرکـارییڤە لگـەل ئێك نـاگونجـێن و هەڤکویف ئێك نابن .

* رەخنەگرێ ئازربێجانی ( کارابیف ) ی بگەرمی رەخنە ل ( ئـەندرییف ) ی گـرت ، لسەر وان هـزرو بیرا ئـەوێن دیارکرین ژبو مروڤێ ( ئیجابی ) دچیروکێ داو گوت : بهـایێ ( روحی و ئـەخـلاقی ) یێ ملله‌تێ مـە ( ملله‌تێ سوفییێت ) مروف بویەو دێ هەر مروڤی بیت و رەخنە دڤێ چارەیا ( جـەوهەر ) ێ مـروڤی و شوینـا وی وجڤاتێـدا بکەت و دڤێ رەخنە کریارێت مروڤی یێن ( ئەخلاف ) ی و ( حەقیقی ) هەلکولیت ، نەکو کانێ چەوا کەسب و کارێ خو دکەت ، یانی دڤێت رەخنە ( حەقیقة ) تا مروڤی و ئەو هزرو بیرێن هەلدگریت دیارو خویا کەت ، نەکو شولێ وی .

* لێ ( ئەنینسك ) ێ رەخنەگر رەخنە لڤان هـزرو باوەریـا هەمیا گرت و گوت :
گەلە جارا مروف دکەڤیتە داڤا هندەك تشتا ئەوبخو بتنێ نەشێت خو ژێ رزگارکەت ئان بەرامبەری وی راوستیت و گوت :
نـابیت هـوین مـروڤی وەکی کت ـ تـاك ( شـخص ) گونەهبارکەن ، گەلە روید انێت مەزن یێن بوین هێشتا ئەز نەبویم ئان هێشتا ئەز دزکێ دەیکا خودا . ئەز نهو دێ چ بێـژم بـەرامبـەر وان رویـدانـاو من وەکی ـ کت ـ چ بەرپسیاری ( مسؤولیةت ) هەیە !! ( ئەنینسکی ) ڤێدا چوو گوت : دابەرێخوبدەینە پیشا ( مهنه ) مـروڤی یان هەچکو ( ئەندرییف ) ی گوتی کارو کەسبێن وی ، ئاخفتنا ( ئەندرییف ) ی دلی مە ڤەکرو ئەز دژی ئاخفتنا وی نینم ، لێ هزرا خو بکەن ، گەلۆ ( مسؤولیة ) مروڤی هەر لسەر هندێیە کـو مروڤی کـارێ خو ـ شـولی خو ـ بـڕاستێ و دروستی بکەت ؟
ئەزبخو وەسا یێ هوی بویم و هزرا خو دکەم کو کارکرن ، تشتەکێ راست و دروستە نەکو ژبەر بناس و سـویچەکـا ( ئەخلاق ) ی ، لێ راست و دروستە ژبەر پێدڤیاتیێ و هند . ئەم بباشی کاردکەین ژبـو هندێ دا بخـۆین ، چ گەلۆ چ تێکەلی ( ئەخلاق ) ی دگەل ڤێ چەندێ هەیە ؟
ئەز دزانم بوچی ( ئەندرییف ) ی بگەرمی لسەر کـارێ مروڤی ئاخفت ، چنکو ـ کار ـ سەروکانیا ( معانات ) ێیەو ژیان لسەر مە دسەپینیت ئەم ژێرا باخڤین . ژبەر هندێ دا درێکا ( ئەخلاق ) یەتێدا هاریکاریا ئێکودو بکەین . لێ من کـارکرنـا راست و دروست و ( ئەخـلاق ) هەردو پێکڤـە دجهگیرن د رەوشتێ مروڤی داو ئەڤە بەسە کو ئێکی ژوان نـەدەینە بێی دی یـان لێك نـەگرهـرین و ئێکی ژ یێ دی نەئینینە دەر . دڤێ مروڤی ( ئەخلاق ) یەت هەبیت نەکو ـ « ژبەر » ـ بێی پەیڤا « ژبەر » (بسبب ) و ئـەم نابینـە خودان ( ئەخلاف ) تاکو نەبێژین مە ( ئەخلاق ) ێ هەی نـەکو ژبـەر چ ، بێی سویـچ ، بێی بناس ، بێی بـەلگـە ( دلیـل ) . دیسا ( ئـەنینسکی ) گـوت : ئـەدەب لبن سیبەرا هەڤچاخیا ( المصاصر ) خو دزێت و پەیدا دبیت ، نەکو ژبەر هندێ نفیسەڤان دبێژیت : دەمێ هندێ یێ هاتی کو ئالوزییێت ( ئەخلاق ) ی دیارکەین یانی پەیدابون و زانا ئەدەبی نەلدویف بانگێ نفیسەڤانایە ، بەلکی لدویف وی باریە ( ظرف ) ئەوێ ژینا هەڤچەرخ دسەپینیت .
هەر مروڤەك ـ هەرئێك ژمە ـ دەمێ چاڤێن خو دڤێ ژینێ دا ڤـەدکەت ، ژسـەراژنوی دڤێ دسـت پێبکـەت ئالوزیـا چارەسەرکەت ، یانی ژچونەیێ دەست پێ بکەت و نەشێت هەتا دویماهیێ چارەکەت و ئالوزیا نەهێلیت و مروف هندە هندێ دشێت .

* رەخنەگرا ژن ( کیدرینا ) یێ هزرا جڤاتێ بو ( واقع ) ێ جیهانێ و هەڤرکیا چین و تەخێت جڤـاکی راکێشاو لسـەر بزاڤا سەربخویا ملله‌تان ئـاخفت و گوت : ژبـەر کو ئـەم نـەشێین ژڤـان تشتا بـدویرکـەڤین و خـو ژشـوینـا وان ڤەدەرکەین ، ژبەر ڤێ چەندێ ( ئەخلاق ) یەتێ تێکەلیەکا موکم یادگەل ( ئایدولوجیة ) تێ هەی . یاپێدڤییە دەمێ دەست نیشان کرن و خویاکرنا ( ئـەخلاقیـة ) تا مـروڤی دکەین ، دڤێ ئەم ( موقف ) ێ مروڤی و هزرو بیرێن وی بزانین ، یێن کو ژبو دبزڤیت . ماپێدڤییە ئەم لسـەر وێ رەخنا ئەدەبی باخڤین یاکو تێکەلی دگەل مروڤی هەی !، دگەل خاندەڤانی و نفیسـەڤانی هـەی !، ئەو رەخنـا کو دەستێ خاندەڤانی دگریت و دگەل خو دبەت ، نەکو هەما کریارێت باش بو رێزدکەت و ( کیدرینا ) یێ رەخنە لهندەك

نفیسەڤانێن سوڤیێت گرت ، لسەر هـزرو بیرێن وان بـو مەسەلا ( ئەخلاق ) یـەتیو بناسـین نەزانینـا وان کره نەزانینو ئالوزیا هزرو بیرێن وان ێن ( ئایـدیولوجی ) و گوت : ئەڤ نفیسەڤانە هندەك جارا دگەهنە وێ پەیشکێ کو ئێدی پشتگیریا دەسەلاتداریو تێهناتیو برسیاتیـا ( تەیمورلەنگی ) بو داگیرکرنێ بکەن ، ئـان پشتگیریـا ( قیم ) بێت دەرەبەگاتیێ بکەن .

* ( ئەنانشینکوف ) ێ نفیسەڤـان پشتگیریـا وێ باوەریێ دکەت یاکو دبێریت : هەمی گاڤا ئەدەب یێ لدویف هندێ گـەریایو یستـوییێ خوڤـە یـاگـرتی کـو شـەهسـواریێ ( ئیجابی ) دروست کەت . لێ دروست بونا شەهسواریێ ( ئیجابی ) لسەر گاڤێ - دەمی ( وختی ) راوستیایـە ، وەکی ( ئەخلاق ) یەتیو نفیسەڤان چێروکا نفیسەڤانەکێ سوڤیێت یێ هەڤچەرخ دکەتە نموونەو دبێژیت ئـەڤ چێروکە لسەر ژینا پیرەمێرەکییە ژیێ وی نێزیکی هەفتێ سالانەو هەمی کەسبو کارێن وی بخودانکرنا چێلەکێو گولکەکیو چەند پەزەکاو هندە تەیرانە ، نفیسەڤان پرسیار دکـەت گەلو چـەوا دێ ئەم ڤی شـەهسواری بهـاکەین هـەلسەنگـرینین یـانی ئـەڤ پیـرەمێـره شـەهسـواریێ چێـروکەکێیـە ، چەوا دێ ( تقیم ) کـەین ؟ گەلو ئـەو شەهسوارەکێ ( ئیجابی ) یە یان ( سلبی ) ؟ نفیسەڤان بخو بەرسڤا پرسیارا خو ددەتەڤەو دبێژیت : بەری پانزده بیست سالا جوتیارەکی ئەڤ تشتە هەمی هەبان تشتەکێ نەدجهێ خودابـوو دابیتە مـروڤەکێ ( سلبی ) . پـاشی دبێژیت : گەلو ئەم دکارین بێژین ئەڤ جوتیارێ پیرەمێر خو دوەستینیت ژبو قازانجێ ( فایدەی ) ؟ نـەخێ وەنینە ، ئـەڤ مەسـەلە گەلە ئـالوزتـره ژهنـدێ هـەچکـو ئـەم هزردکەینو تێدگەهین .

دیسا ( ئەنانشینکوڤا ) وێ گوتنێ ڤـەدگێریتـەڤە یـاکو دبێژیت : دەمێ نهو پێدڤی پەیدابونا شەهسوارەکییە کو ( ئەخلاق ) یەتا وی گەهشتبیتە گوپیتکا .

لێ دڤێ بزاتین ئەڤ شەهسوارێ هوسـا چەنـدێ ئالوزه یێبگرێیەو رێکا پەیداکرنا وی چەندا ئالوزەو دیتنا وی نێزیکبون ژێ برێکێن ( تەقلیدی ) و کەڤن گەلەك گرانەوه وەستیان پێدڤێت .

دیسا ( ئەنانشینکوف ) ێ هزرو باوەریێن خو دەربرینو گوت : گوهرینا ژینێ یابەردەوامو پێدڤیاتیێن ئابوری ێن بوینە بناس کو ئێدی نەهێلن شەهسواردنەدەبیدا ، وەکی شـەهسـواریێ چێـروکـا ( والفـولاذ سقینـاه ) رابیتو روینیتو دیسا دبێژیت : شەهسواریێ هەڤچەرخ بێخش لدویڤ تـورو رەوشتێت بەریخـو دچیت ئـەوێن سـالێن بیستیو سیهێ شیاییێن رەنگێ ژینێ بگوهرن . لێ نهو هندە پێـدڤیاتیـێن نوی یـێن بەرامبـەر وی ێن پـەیـدابـوینو راوستیاین کو پێدڤی چارەسەرکرنەکا هویرو نـەرمە ژبـو چارەکرنا رویدانێن ژینێ .

ئەڤە کیلکا تێکەهشتنا مەیە بو شەهسواریێ چێروکێ .

* ئاخفتن بو یا هوزانڤانێ بناڤودەنگ ( رسول همزاتوف ) ی . هوزانڤانی نمونەك ئینا ژبو دیارکرنا هزرو بیرێن خو ێن ئەدەبیو لسەر سترانبێژێن وەلاتێ خو پەیڤیو گوت : سترانبێژێ داغستانی بەری سترانا خو بێژیت پرسیارا گوهداران دکەت کانێ چ سترانەك دڤێتو داخازدکەن ، لسەر ڤیانێو نەڤیانێ ، ئان دلخوشیێو دلنەخوشیێ گەلە جارا بەرسڤا وی ددەنو دبێژنێ : بلا سترانا تەلسەر ڤیانێ بیت لێ نەڤیان ژی تێدا هەبیت ، بلا لسەر نەڤیانێ بیت لێ بلا ڤیان ژی تێدا هەبیت ، بلا لسەر دلنەخوشیێ بیت لێ دڤێت دلی مە پێ خوش ببیت ، بلا لسەر دلخوشیێ بیت لێ دڤێ دلنەخوشی ژی تێدا هەبیت . براستی نینەو نـابیت پەخشـانەك بهێتـە نفیسـین بێی کـو دلخـوشیو دلنەخوشی تێدا نەبیت .

( همـزاتـوف ) دبێـژیت . شـەهسـواریێ ئـەدەبی ێی هـەڤچەرخ دڤێ یی راست بیتو یی یێ پێبـاوەرکری بیتو دسەر هەمی حالارا دڤێ شەهسواریێ هوزانێ یان هەچکو دبێژنێ شەهسواریێ هوزانێ یان هەچکو دبێژنێ شەهسواریێ هوزانێ یان هەچکو دبێـژنێ شەهسـواریێ سترانێو براستی ئەڤ شەهسوارە هوزانڤان بخویە ، دڤێ یێ راستو پێباوەرکری بیت . یانی یێ بباوە ربیت . دا بیرا خو راستگویا ( پوشکین ) یو ( نیکـراسوف ) یو ( محمـود ) یو ( یـسنـین ) وێ ( سـتـالسکـی ) و ( مـایکوڤسکی ) بینـین دهوزانـێن واندا مروف بڤیـانو نەڤیانا وان دحەسییت ، لێ نهو چێدبیت مـروف نفیسینا

لاوەکی بخوینیت و نەزانیت کانێ وی چ دڤێت و ژبو چ هزرو بیرێن ( ئەخلاق ) ی دبزڤیت و چ تشتە وی دئارینیت ، لێ خانـدەڤـان گـەلە ببـاشی بخـەم سـاریێ و درەوێت وی دحەسێت و .

* هوزانڤان ( یفتشینکو ) پشکداریێ دئاخفتنێ دا دکەت و دبێژیت :

مان و جهگیربونا سەرمایـەداریێ لسەر هـەلگرتن و بـونا تشتی یە بوخو (الملکیه الفردیه ) ، نەکو لسەر ( ئەخلاقیة ) تێ یە ، هەرچەندە رژێما سەرمایەداریێ سەرڤە خو بدیموکراتیەتێ دئینتەدەر لێ براستی ئـەڤ چەنـدە لنك نینـەو دیسـا ئـەو خـو وەسـا نیشـاددەت کـو دژی ( ئـەخلاقیـة ) تێ یە ( اللاخـلاقیە ) ، لێ بـراستی ئەو یاوەسا نینەو ژێ ناترسیت و دگەل ئێك دوژمن نینن .

لێ مان و جهگیربونا سوشیالستێی لسـەر ( ئەخـلاقیة ) تێ یە ، کو لدویماهیێ دێ شێتە هەلگرتن و بونا تشتی بوخو - و بەروڤاژی سەرمایـەداریێ سوشیـالستێی هەرگـاڤ دوژمنداری یا دگەل ( نە ئـەخلاقیـة ) تێ هەیو بـزاڤا سوشیالستێی و شەرەنیخا وێ شەرەنیخا ( ئەخلاق ) یە دژی - بون و هەبونا تشتا بوخو - .

( یفتشینکو ) دبێژیت : دەمێ ئاخفتن لسەر نەبونا تشتا دهێت - سامانێ ئابوری - هەمی کاربەدەستێن ئـابوری گونەهبارکەن ، ژبـەر هندێ دڤێ دەمێ ئـاخڤتن لسەر نەبونا ( روحی ) دهێت د ڤێ کاربـەدەستێن ( روحی ) گونەهبارکەن و هوزانڤان دەورێ ئـەدەبێ سوشیـالستی خویاو بەلی دکەت ، پاشی تێك چون و ئالوزیا ئەدەبێ وەلاتێ خو دیاردکەت و بناسا دکەتە ( تخصص ) دەندە دەرگەهو کولاناداو دبێژیت : ئەدەب ئەو ( تخصصە ) یێ کو دژی هـەمی ( تخصصە ) کێ یـەو ( یفتشینکو ) لسـەر ڤێ چەندێ نمونەکی - لسەر گرتنا تورڤـانێت سوڤێیت بـو کولانەکا ئەدەبی بتنێ - گرتنا بابەتەکی بتنێ - دبێژیت :

گەلە جاران ئەدەبی دێ کەنە پشك پشك - پارچە پارچە - کەن ، دێ بێژن ئەدەبێ گوندی ، ئەدەبێ باژێری ، ئان ئەدەبێ قوتابیان ، وەکی لەشێ مروڤی پارچە پارچە کەن و لەش بخو یێ پێکڤە گرێدایەو ژێکڤە نابیت . ژبو هندێ کو نوژدار بزانیت کانێ پارچەکا لەشی - جهەکێ لەشی - چیەو چ ئێش هەیە دڤێ شەهرەزایی دهەمی لەشیدا هەبیت ، وەسـا ژێ نڤیسەڤـان وەکی وی نوژداریـە یێ درێنتە نەساخەکی ، هەکە شەهرەزایی دپارچەکا لەشی بتنێدا هەبیت دێ گەلە تشت ژێ چن نـزانیت . ژبەر هنـدێ سـەرکەڤتن دهنـدە کولانـا بتنێدا دێ بیتـە سکـرەك دنـاڤیەرا مـەو زانینـا گشتیدا و ئـەڤ ( تخصصـە ) وەدکـەت کو ئـەم ئێدی نـەشێـین بـدروستی و رەوان ڤەژەنینا ( واقـع ) ی دیارکـەین و هوزانڤـان ژئەدەبێ سوڤێیتی نمونـەکی بو مـە دئینیت و دبێژیت : خـاندنـا ( ژینـاکلیم سـامغـین ) ی یـاکـو ( گـورکی ) نڤیسی و ( رێکاژانا ) یا ( الیکسی تولستوی ) و ( الدون الهادء ) یا ( شولوخـوف ) ی ، ئەڤ نڤیسینـێن دێرین و مـەزن ئاخفتنا مە بنەجەدکەن لسەر نڤیسینا گشتی کو هەمی لاو کوژیا دگریت ، لێ نهو ئەم بارێ گشتی پارچەپارچە دکەین و ژهندێ درەڤین کو ڤی بـارێ گشتی بگڤێشین و دهـەمی کولانـەکا ویدا بچـین و هـەر ژبـەر هنـدێ - بەرفرهەیا نڤیسینێ - ( غابرییل غارسیە مارکیز ) بو ئێك ژمـەزنترین نڤیسـەڤانـێن نهو . بچـویك کرنـا هـزرا نڤیسـەڤانی و تـەنگـاتیـا هـزرو بیـرێن وی دکێشیتـە بچویك بون و تەنگاتیا شوینا وی یا ( ئەخلاق ) ی و دڤێ ئەم ژبیر نەکەین کو نڤیسەڤان بخو شەهسوارێ نڤسینێن خویە دگەل وان شەهسوارا ئەوێن ئەو دنڤیسینێن خودا ددانیت و خیرا پویتە پێدانا نڤیسەڤانی - کانێ پویتەی بچ ددەت و چ تشتـەك لنـك وی کـارەکێ سـەرەکیـە - ( ئەخلاقیة ) تا وی دەست نیشان دکەت و خاندەڤـان پویتە نادەتە وی نڤیسەڤانی ئەوێ خیرا نڤیسینا وی یا بـەرفرهـە نەبیت و پـویتەی نـەدەتە وان تشتـا ئەوێن خاندەڤان پویتە پێ ددەت و هەر هونەرەك نەشێت شوینا خو پێلیت و دێرین بیت هەکە ( ئەخلاق ) یەتا وی بەرەو نەمان ئان کێم بون بیت . چنکو ( ئەخلاق ) هونەرەکێ ( روحی ) یە یێ مەزن و ( یەفتشینکو ) پێـدا دچیت و بیرهاتنا سالێن بەراهیێ ژ شورەشا وەلاتێ خو دکەت و داخـازێ ژ نڤیسەڤـانا دکـەت کو ( نـەتەوایـەتی یـا شورەشگێر ) بەرزە نەکەن و بجارەکێ هەمی تشتەکی ژبیرا خو نەبە نەڤە ، هـەر ژ سابـوینێ و هەتـا چەکێ

( ئوتوم ) ی جنكو هەر ئەوە ( ئەخلاق ) یەتا شورەشگێڕ ، دڤێ نڤیسەڤان برسییێ هەڤالینا مروڤاییێنی بیت ، برسییێ پاشە روژێ بیت ، چنكو هەر تشتەكێ باش و تازەو بكێرهاتی مروڤێ برسی ێی دروست كری .

* پشتی هینكێ رومان نڤیسێ ئازربێجانی ( ئانار ) ی دەست بئاخڤتنەكا رەوان كر لسەر ئاخڤتنێت ( یفتشینكو ) ی‌و لبەراهیێ دلخوشیا خو دیاركر لسەر وان ئاخڤتنا ئەوێن هاتینە گوتن ـ لویێ جڤاتێ ـ پاشی گوت :
ئاواو رەنكێن ژینێ یێن نەوەكی ئێك دڤێ دنڤیسینێ‌دا ڤەژەنین‌و دەنگێ خو هەبیت ، داكو ببیتە تشتەكێ مەزن‌و خوش‌و بلەزەت‌و بكێرهاتی ، پاشی گوت :
مخابن بو وێ بزاڤێ ئەوا دهێتەكرن د ئەدەبی‌دا نەخاسمە د رەخنێ‌دا ژبو كورت‌رن‌و دسەدڕاچونا ( حقیقة ) ی‌و ئاواو رەنگێن ژینێ .
هندەك نڤیسەڤان وەسا هزرا خو دكەن كو نەبون ئان نەگەهشتنا وی بو هەمی ( حقیقة ) ێ كێماتی‌و ئالوزیە د نڤیسینێ‌دا ژبەر هندێ ژبیرا خو دبەنەڤە ئان دسەڕا دچن . لێ بەری هەمی تشتەكی ئەدەب ژبەر هندێ ێی خوشە چنكو پرسیارا دكەت‌و لدویڤ ( حقیقة ) ێ دگەڕێت ـ خاندەڤانی پالددەت كو هزرێن خو بكەت‌و پرسیار بو بهێن ـ پاشی دبێژیت گەلە جارا ئەم ( وەزیفێن ) ئەدەبی ژبیر دكەین ئان بپشت گوهێ خوشە دهاڤێژین‌و ( وەزیفێ ) وی ێی سەرەكی ددانین بخودان‌كرنە ـ ماتی‌ژی‌كرنە ـ پەروەردەیە ـ و دیسا ئەم ژنڤیسەڤانا داخاز دكەین كو دڤێ شەهسوارێ ( ئیجابی ) دنڤیسینێن خودا پەیداكەن ، راستە ئەز دگەل ڤێ چەندێ مە لێ ئەڤە بتنێ كارێ سەرەكی ێی نڤیسەڤانی نینەو ئاخفتنا وی نڤیسەڤانی یالبیرا من هەكو گوتی : بێژنە من كانێ شەهسوارێ ( ئیجابی ) دتاپلوییێ ( لوحة ) ( سپێدە د بویشێ كاژادا ) ێی ( شیشكین ) ێ نەخشەكێش . پاشی نڤیسەڤان دبێژیت : دەمێ ئەز گوهێ خو درەمە ئاوازێن ( گاجیبیكوڤ ) ی ئان هوزانێن ( لیرمنتوڤ ) ی دخوینم ئەز هزرا خو دشەهسوارێ ( ئیجابی ) دا ناكەم‌و ئەز هزرا خو دهندێ‌دا ناكەم كو ئەو ێی ماتی‌ژمن‌دكەن ـ پەروەردە ـ ، دسەر هندێ‌ڕاو لدویماهیێ ئەو من پەروەردەدكەن‌و هەمی تشتەكێ باش‌و جان لنك من پەیدادكەن لێ برەنگەكێ نەپەنی‌و بەرزەو لسەرخو . ژبەر هندێ ئەز دگەل داخازا رەخنەگرا نینم ـ ئەو داخازا رەخنەگر ژ نڤیسەڤانا دكەن لسەر پێدڤیاتیا بونا شەهسوارێ ( ئیجابی ) دنڤیسینێن وان‌دا ـ . دیسا گوت : یامن گوتی وەنەبیت كو دەورێ ئەدەبی ێی جڤاكی كێم بكەت‌و گوت : ئەز دكەل بزاڤا وان تورڤانانم یاكو دهێتەكرن ژبو بلندكرن‌و ساخ‌كرنا بارێ ( ئەخلاق ) ی‌و وێ بزاڤێ ئەوا دهێتەكرن دژی دوژمنێن ( ئەخلاقیەتا ) سوشیالستی‌و مخابن بوهش‌بونا رەخنەگرا لسەر هندەك نڤیسینێن ئەدەبی یێن رەخنەگر یێن گەلە باش بمهانا هندێ كو نڤیسەرێن وێ رەخنێ بافرۆنە دهندەك بارێ ( سلبی ) دا یانی هندەك رەخنەگرێن هەی هندەك نڤیسینا ناهەلسەنگرینن ژبەركو بارێ ( سلبی ) یێ ژینێ گەلە مەزن دكەن ـ رامانا ـ رەخنێ ـ لڤێرێ ئەو نینە كێم‌و كورتیا ـ لێ‌بگریت ـ بەلكی رامان ژی بهاكرنا نڤیسینێ‌یە ـ

* لدویماهیێ تورەڤانێ ئازربێجانی ( مامیدڤ ) ی پشكداری دئاخڤتنێ‌دا كرو رازیبونا خو دیاركر لسەر هزرو باوەرێن ( یفتشینكوی ) كو دبێژیت : دڤی نڤیسەڤانی هزرەكا بەرفرەه هەبیت كو هەمی كولان‌و كوژی‌و بابەتێن ژینێ بگریت‌و پشت‌نەگرتنا ( مامیدڤ ) ی لسەر هندێ بو كو ئاخڤتن لسەر ڤێ چەندێ بساناهی‌یە لێ بكارئینانا وێ گەلەك ئالوزو گرانەو ڤێ گرناهیێ خویاو دیاردكەت دەمێ دبێژیت : گەلەك ژنڤیسەڤانێن مە ـ یێن‌وان ـ ژگوندا یێن هاتین‌و خاندن‌و هوی‌بونا وان لباژێرا بویەو ژچینەكا جڤاكی پێڤەتر نانیاسن ، ئان دشێن بێژین ـ ئاخڤتن یاوی‌یە ـ ئەو دكارن بخوشپا ژینێ بحەسێن‌و تێدا بژین لێ نكارن بژانا نەتەویی بحەسێن ، ئەوا كو ئەم لسەر ئاخڤتین‌و ( مامیدوڤ ) ێی لسەر وێ باوەرێی كو گەهشتنا مروڤی بو زانینەكا بەرفرەه ـ گشتی ـ لدویڤ هندێ دهێت پشتی زانینا مە بو پارچێن ژینا مروڤی ـ زانینا مروڤی بو وان پارچا ئەوێن جیهان ژێ پێكهاتی‌و ژینا مروڤی بخو یا ( زاتی ) ـ ئەڤە پەیسكا بەراهییی‌یە بو زانینەكا كویرو دویر .

دیوانی کاروان

# شاری سولەیمانی

شارێکی دڵگیر پڕ نرخ و جوانی
شاری هەڵەتەو شاری قوربانی
کانیی زیرەکیو زمان ڕەوانی
هاوتایە نەبووە بۆ سولەیمانی
هەزارو حەوسەد لەگەڵ هەشتاو چوار
مێژووی میلادە کە بوّت بوو بە شار
شەپۆلی عەشام هوروژمی یەکجار
بۆ دامەن گوێژە شاری یادگار
قەڵاچوالانی کۆچ کردە سەیوان
بە ئەمری پاشا ئیبراهیم بابان
لە دەستو پێوەند لە ئاغا لە شوان
لە شێخو مەلا لە کوردو گۆران
دێ بچووکەکەی بە ناو مەڵکەندي
بووو بە گەڕەکێ نەما بە گوندی
ڕوو لە برەوو بەرزو بڵندی
پڕ جافو بەگو بە هەمەوەندی
تەپولکەی دەبوی زەمانی تورکان
بۆ بە عرووسیو دیوانی بابان
ڕاستە شەقامو بازاڕو دووکان
مزگەوتو ئاشو حەمامو پڕ خان
لە خواری دەبۆ لە دامەن قەلا
بۆ نوێژو تاعەت بۆ بانگو سەلا
پاشا مزگەوتی گەورەی بینا نا
بناغەی عیلمو مەلای بۆ هێنا
لە دیوی قسنی پیرمەسووری جوان
مزگەوتو مالی کرد حاجیئەحان
ئەو پیرمەسوورەی نەزری بۆ داوە
بەردی نیازی توند پێوە ناوە
خانووی مەڵکەندی نزمو بڵاوە
دڕکەزی پەرژین چوار دەوری داوە
ژێرخانی درێژ ناوی ئاگردان
بە کلاوڕۆژنە دووکەڵی سەربان
شوێن ڕمبازیو سوارچاکيی مەیدان
دەمەی ئێوارە بەر گردی سەیوان
خۆ پوورەبەگی باخی شیرینە
بۆ سەیرو سەفا خۆشو ڕەنگینە

ئەگریجە شۆڕی پیشەی ببینە
تەشي ڕستنو کلاو چنینە
قەرسیلی سەوزی جوانی بەدیمەن
بەو قاوەخانەی دەشتی سەرچیمەن
پیاوانی گەڕەك پێش زەردەپەڕین
چوار مەشقی ئەدوون لەو دنیاو لە دین
ڕوو کەرە ناوچەی کڵیسەی )گاوران
گوولاو گرتنە پیشەو کاریان
جامانە ڕەشە لە مەیدانی کار
بۆ پێکهێنانی خرێنەو خەرار
قوڵ کە بە قوڵما بچینە سەرگوڵ
خانووی هەژاران چوار ئەترافی چوڵ
دەرگەزێن خەڵقي بە دیواخانە
بازرگان ئەشراف عەبا بەشانە
خانوو دوو نهۆمهەیوان سێدەری
سەکۆ لە حەوشە باخچە لەوبەری
خواجانشینی بەرقاپی دیارە
خۆ نیشان ئەدا شوێن پارە دارە
جێ نوێژو تاعەت بۆ نزیكو دوور
مەولانا خالید خانەقای مەشهوور
گەڕەکی هۆڵێ لە قەراغ شارن
قاترچی سەپان ڕەنجبەر هەژارن
حەوشیان بچووکە تووی تیا ڕوواوە
سەربانی ماڵیان بە چیغ گیراوە
لە شیوی قازی بۆ هۆمەرمەندان
تێپەڕکە چوویتە سەر کاني دۆمان
کەلەپاچەکان کۆڵانی باریك
ڕیخو زیخ هەموو ناخۆشوتاریك
گەڕەك پێچاوپێچ بەردەڵانو لێژ
دیواری نزمو گۆیسوانەی درێژ
لە ئاشەگواوي بۆ ماستفرۆشان
ئەگەیتە ناوچەی کۆڵانی کەلان
ژووررووی سەرچیمەن قەزازەکانە
پڕ لە کەلاوەو شوێنی وێرانە
لە دەشتی سەعەی بلە ئێواران
کەوشەكو سێباز گەنجو منالان

داخزیی بەرەو شیوی جوولەکان
کەنشتەی خواجا لە شوێنێکی پان
زەرەنگەر پیشەو عەتاري فێرن
کەنجی بێ موویان بە ڕۆژ کوڵگێڕن
سەرشەقام ناوچەی کانی‌و کاریزە
پڕ لە مزگەوت‌و پیاوی بە ڕیزە
لە مزگەوتەکەی ڕەسوولی ئاغال
کەتێپەرت کرد چوارباخی کەم ماڵ
چوارباخ خانوویان نزم‌و یەك نهۆم
دەرگای حەوشەیان کلیل‌وکلۆم
جێ نزرگەی وەیس لە قوڵی ئەودیو
پشت دەباخانە هەموو چەم‌و شیو
ڕووکە سەرچاوەی خوری کانێسکان
پانی‌بەرز لەپێ پرە ئێواران
ئەگریجە خاوو نەرم‌و چاو بە کل
دەست بە سەتڵەوە ئەڕۆن شل‌وملً
پەنجەی سوخمە سەوز خورەی شیر دۆشین
مالات لە حەوشەی چەپەر وپەرژین
با لە شێخاندا پشیوویە بدەین
لەدەف‌و زیکرا سەرێ دەربخەین
شێخ‌جافر شوێن سۆفی‌و دەروێشە
پڕ لە ڕیش پان‌و خەڵقی بێ‌ئیشە
لە کاریزەکەی ئەحمەد زەنگەنە
ژن گۆزە بە شان دەست‌و پێ خەنە
بۆ شەڕە سەگیش دەشتی پەستەك سوور
بە دەوریا کەوش ڕەش فەقیانە ئەستوور
خان‌و ناوبازاڕ ناوەندی شارە
ئەسحابە سپی لای چەپی دیارە
سەرچاوەکانی باخ‌و شینایی
وا لە گونجەکەی حەسەن بەغدایی
شەخسە فەقیرە لە گۆیژە دیارە
لەوێوە ئەڕوا بۆ مامە یارە
زیافەتی کفتە لە سابونکەران
پیشەی گەڕەکە سەر لە ئێواران
سەرکاریز چۆنە چۆن دانراوە

بە ناو کاریزی دایکی پاشاوە
جێگە هەڵبەرکێی بەگلەرو ئاغا
دەشتە پانەکەی ئەحمەی ساغا
بۆ حەسانەوەی کاروانی ڕێ دوور
حەوشی گەورەیە وحەوشی پەستەك‌سوور
چوارشەمەی بەهار بەزم‌و گەرانە
داری شێخەباس شوێنی سەیرانە
لە شوێنی خۆیدا گوریس رائەخەن
دوو ژن تیهەڵکێش دیلانێ ئەکەن
بە متوموروو بە بەرو بەرموور
گیرفانی شانەو ئاوێنەو کلتوور
بە کەوشی سوورو سەرو پێچی سەر
گیرفانی شانەو ئاوێنەو کلتوور
بە کەوشی سوورو سەرو پێچی سەر
کەوای شیرداغ‌و شەیتان‌بێز لەبەر
لە درزی قاپی ژن وێستاوە دوور
کە ڕەت بوو پیاوێ مل ئەباتە ژوور
شەماڵەی بەخت شەو لای ژن باوە
لە سووچی کۆڵان خۆیان مات داوە
پشکۆ ومقاشێ لە گەڵ جامە ئاو
ترسی دەرئەکەن منالی تۆقاو
شەخس‌و مووفەرك‌و نوشتە ڕەوایە
حاجی مامۆستا دووعای گیرایە
کشتەکی مەچەك بۆ لەرزو تایە
مەلاش بە سەریا دەم بە دووعایە
بە قوچکەی ساوا دوو کووژەکەی شین
بۆ پاریز گاری لە شەوەی لەعین
بەقامیش‌و د وێت مەلا بە باشی
نووسیویە نەورۆز چوار دەوری کاشی
منالی حوجرە ترسی فەلاقان
بە سایەو حوونجە دەور ئەکەن قورئان
خەتەنە سووران یاپراخ لێنانی
ڕەش‌بەڵەك شایی زورناڵیدانی
کەوشەکی فەقێ شیعرو گۆرانی
پیشەتە پێشرەو ئەی سولەیمانی



خۆشم‌ویستی و خۆشت ویستم
لە دنیادا هەرتۆم هەبووی
هەوەڵ وەرزی دڵداریمان
بەرهەمێکی یەک بە دە بووی
وەرزی دووەم گەڕایەوە
ڕێژەن نەما ، خەرمان نەما
وەکوو داماوی ئەم شارە
کەوتمە شوێن خۆزگەو تەما !

● ❋ ●

خۆزگە ڕۆژێک نەهاتیە لام
دەستت نەخستە سەر دڵم
وەکوو پەپوولەی لانەواز
ئەتپشکنی گوڵ بە گوڵم
جا ئەتزانی چەند بە تەمام
لەناو دڵما بتگرمەوە
ئەگەر بە گیانی پاکیش بێ
بۆ ئەبەدی بتکرمەوە

● ❋ ●

لە لای عاشق زۆر ڕەوایە ،
بۆ ئەوینی هەرچی بکا
لەو ڕۆژەوەی مەی خۆش‌بووە
هەزار هەزار شووشە شکا
جا من بۆ جورعەی چاوی تۆ ،
شووشەی دڵم ڕاگرتبێ
سابا دنیا سەرەو ژێر بێ
ئەگەر نۆرەم ڕابووردبێ !

● ❋ ●

وەرزی سێهەم کە هاتیەوە
با بەهاری تەڕو بڕ بێ
جامە شەرابی دەستی تۆ
خەست خەست هەتا لێوی پڕ بێ
لە گوزەرما نیستێک بکە ،
بڕوانە چەند پەرێشانم
لەبێ شەرابی دەستی تۆ
هەر خەریکی خەم کێشانم

● ❋ ●

خۆزگە شەرم ئەیگرتیت و
لەبەر دەمما وەکوو جامێ
لەسەر پەرەی دەم و لێوت
ئەبووی بە پێکی هەر کامێ
من بە چیەو ڕازی خۆشت
کامی نەوینم مەست ئەبێ
جامێ نەبم بە مەی گێرو
کلیلی تۆم بەدەست ئەبێ !

● ❋ ●

ئەو کلیلەم بۆ گەنجینەت
لە ئەزەلدا دابراوم
من ئەو مۆمەم لە ڕێگەتا
لەگەڵ بوونتا هەڵکراوم
ئای لەو ڕۆژەی ئەتکەمەوە
چرای خۆمت تیا هەڵ ئەکەم
بۆ ئاواتە وێڵەکانم
وەکوو دەلیل دووکەڵ ئەکەم

● ❋ ●

وەرزی چوارەم بێنە گۆڕێ
هەموو شتێ لەجێدا بێ
تانەو لۆمەی دەورو بەریش
پێڵاوێک بێ لەپێدا بێ
تۆ گەییوی و من عەزرەتی
ماوەی ئارام ئەبڕێتەوە
ئەو پێکەی وا لە دەستمانا
نەیخوێنەوە ئەڕژێتەوە !

● ❋ ●

ئای لەم عومرە بێ کامەمدا
ئازارو سوێ چووە ناخم
مەینەت ئەگەر شاخ بڕوێنێ
من جەنگەڵی هەزار شاخم
ڕۆژگار دیواری لەعنەتیت
با بڕووخێ لە ڕێگەما
باخەوانەکانم بێنە دی
ئازاد ببن لە جێگەما

● ❋ ●

خەڵکینە من ترسم هەیە
لە نەهاتی ی بێ ماچ و مەی
داوا بکەن لە خوای ئەوین
نەکەی شاعیر بی بەش بکەی
درژوارە لام زۆر دژوارە
شیعر بی ماچ و بادەبێ
شیعر ناڵای تین و تەنوور
پەلاسێکی زۆر سادە بێ !

● ❋ ●

سەری تاڵێکم وەرگرە
با هەڵکرێمە سەر ناوت
بڕژێمە سەر سینەو مەمت
وەک شەپۆلی قژی خاوت
کەس نی یە جێت بگرێتەوە
بەلام درەنگە بمگەری
با بەرهەمی وەرزی گەیین
بە ناکامی هەڵ نەوەری

● ❋ ●

قوربان قوربان قوربانتم[1]
هەتا گیانم لە بەردابێ
بەستەی ئەوین نابڕیتەوە
هەتا عیشقم لە سەردابێ
بۆمن بێ عیشقی مەرگێکە
هەڵسانەوەی لەدوا نی یە
ئەڵێن جەفا بۆ یار جوانە
بەمەرگی تۆ هیچ وانی یە !

«1» لە گۆرانی یەکی هونەرمەند شەوکەت ڕەشید وەرگیراوە

شەهید

هیڤی دار هروری

« دیاری‌یە بو شەهیدین مەهابادی »

ڤێ پەیڤینی ..
دگەل من نەکەن
نەبێژنە من .. ڤینێ پێلە
هەردوو دەستا ..
.. ژێ داهێلە
یا ژ خویە .. ئەز ناهێلم
چەندین ئەڤینی یا خەج و سیامەندا ..
.. لبیرا من بیت
چەندین شایی و بەهارا من ..
.. تازی یا بەردەرێ من بیت
چەندین هەژاریا وەلاتێ ..
... برینا سەر دلی من بیت
ل من سوزە .. ئەز نەهێلم
ڤی دلی پڕ کول و برین
بو بکەم خەلات
بەلکو رێڤنگەکێ دلمای
یان زارویەکێ باب نەمای
دگوریدا .. بێژیتە من
هو شەهیدو ...
روژەکا نوی
... ب سەر وەلاتیدا هەلات
بسەردا هەلات :

## لە ژمارەی داهاتووماندا

1 ـ لە یادی نەمراندا :
أ ـ فایلێك دەربارەی خوالێخۆشبوو صادق بهاء الدين نووسینی ئەم برادەرانەی تێدا دەبێ :
(عبدالکريم فندی ، سلام مەنمی ، کريم شارەزا ، احمد عبدالله ، مسعود کتانی ، مصطفی کتانی ، دوکتۆر عزالدين مصطفی ، دوکتۆر بدرخان سندی ، جميل جميل بهاءالدين) کە نووسینەکانیان ئەو وتارانەن لە چلەیدا خوێندرانەوە . لەگەڵ شیعرێکی کاك عبدالرحمن مزووری و نووسینێکی خوالێخۆشبوو خۆی .
ب ـ وتارێکی کاك ئۆرخانی غالب دەربارەی موفتی پێنجوینی .
2 ـ فایلێك دەربارەی هەڵسەنگاندنی چوار شانۆگەری :
أ ـ راستی‌یەکە مرد — رزگار کريم
ب ـ ماڵەی سەر گردەکە — حيدر عبدالرحمن
جـ ـ لاس و خەزال — مغديد حاجی
د ـ سەلەی نانکەر — فاروق رفيق
3 ـ بابەتی هەڵبژاردەی کاروان : داستانی بەردە قارەمان / چیرۆکێکی شیعری‌یە / شێرکۆ بێکەس .
4 ـ رەچەڵەکەکانی مرۆڤ / فەرهاد پیربال .
5 ـ چێژی مۆسیقا / انور قەرەداغی .
6 ـ کورتەیەك دەربارەی لورو لورستان / یوسف رؤوف
7 ـ گرفتی ئاو / ئەندازیار حەمە قادر .

# کە ئەهاتی ٥٥٥

کە ئەهاتی ، وام ئەزانی
پەژارەو خەم
نە زۆر ، نەکەم
وەکوو گرەی ئاگرێکی بڵێسەدار
باخی خۆشی دلنیایی
دەروونی تۆی ئەناسیوە

* * *

کە ئەهاتی ، وام ئەزانی
چاوی بزەو پێکەنینە ساکارەکەت
وەکوو ئەستێرەی گەلاوێژ
لە خۆشی‌و گەشە بەولاوە
لە ورشەو پرشە بەولاوە
هێشتا فرمێسکی نەدیوە

* * *

کە ئەهاتی ، وام ئەزانی
شەپۆلی جم‌و جوولەکەت
لە دەریای بە خۆ نازینا
رۆژێ لە رۆژانی تەمەن
وەك بەفرێکی بێ‌گەردو پاك
لە سەر کێوی :
دڵشکان‌و
پەشیمانی‌و
نا ئومێدی‌و
بێ ئارامی
نە باریوە

کە ئەهاتی ، وام ئەزانی
پەپوولەیت‌و
بە شوێن گوڵ‌و هەلالەدا
دێیت‌و دەچی‌و
بۆنی هەرە خۆشی ژیان
تێر ئەمژی‌و ئەچنیتەوە

* * *

کەچی داخەکەی داخانم
ئەمجارەیان
پێچەوانەی جاری جاران
بەو چیرۆکە دلتەزێن‌و
بە سەرهاتە خەماویەت
وەك مامۆستا
هاتی تەختە سرت هێنا
چی نوسرابوو
لە سەر تەختەی هەست‌و هۆشم
دەربارەی کامەرانی ی تۆ
هەر هەموویت کوژانەوە

* * *

ئەمە وابوو
بەلام ئاخۆ تۆماری ژین
دەفتەری تەمەنی مرۆڤ
تەنها یەك دوو لاپەرەیەو
ئەبڕێتەوە ؟
مرۆڤ چی‌یە ؟ :
حەزو خولیاو ئارەزووە
تیشکی ئێستەو رابوردووە
کانی ی هەستێکی ریدووە
گەربیەوی

باڵدارێکی سەرکەوتووە
دەریایەکە
سەدان شەپۆلی نەبەزی‌و
نەسرەوتن‌و یاخی بوونی
بۆ گەوهەری کامەرانی
بۆ ئەو ژینەی
شیاوی ناوی مرۆڤ‌و
دوا رۆژی رووناك‌و گەشە
گرتۆتە خۆی

* * *

دە تۆش وەرە ، بە گوێم بکەو
بەسەر درکی رێی ژیانا
هەتاکوو سەر هەنگاو بنێ
وەك مرۆڤێکی بێ پەروا
هیچ مەترسە ، هیچ سل مەکە
وەك کۆتری
بەرە بەرەو ئەو باخچەیەی
گوڵی رەنگاو رەنگی لێیە :
خۆشەویستی
دلنیایی
ئارامی زۆر
خەونی سەوز
کەسایەتی
ئەبێ من‌و تۆ بزانین
گوڵی باخچەی ـ ئەگەرهەبێ ـ
کامەرانین
سامانی چلکن‌و پلکن
هەر پێشکەشی ژەنگ‌و ژارکە
وەکوو کردت
چۆنت ئەوێ وەها بژی
بە شانازی ، بەسەر بەرزی



((Souvenir))

**پێشکەش کردنێکی سەرپێیی**

چونکە لێ تێ گەیشتنی هۆنراوی وەرگێڕاو وەك لێ تێ گەیشتنی هۆنراوەکە بە زمانە بنەڕەتی یەکەی خۆی سووك و ئاسان نی یە ، بۆیە بە پێویستی دەزانم خوێنەرانی بەڕێز ئەم پێشکەش کردنە بخوێننەوە بەر لەوەی یەکسەر هەڵبکونە سەر هەڵبەستەکە خۆی . جا . لێرەدا چەند بنتکێك هەن کە دەمەوێ روونیان بکەمەوە 1 – ناساندنی بەویژ . 2 – ئەو سەردەمەی کە بویژی تیٰدا ژیاوە لە فرەنسە 3 – کورتە شی کردنەوەیەکی هەڵبەستەکە .

**1 – ئەلفرێد دی مووسێ کێ یە ؟**

یەکێکە لە بوێژە هەرە گەورەکانی سەردەمی ڕۆمانتیکی فـرەنسە . لە سالی 1810 دا ، لەپاریس ، لە بنەماڵەیەکی خانەدانەوە لەدایك بووەو لە ساڵی 1857 دا هەر لەوێ سەری ناوەتەوە .

ئەلفرێد ، هەر لە منداڵی یەوە سرووشتێکی مێلانکۆلیك و سەنتیمەنتالی لێوە بەدی کراوە ، وە لە تەمەنی چواردە ساڵی دا یەکەم هۆنراوەی پێشکەش بە دایکی کردوە .

ئەلفرێد ، لاوێکی شۆخ و شەنگ و حەیزانی ژیانی سرووشت بووە هەڵرژاندنی هەست و خوستی بەڕاستی دڵ و دەروونی مرۆڤی کردوتە ئامانجی ژیانی . کەواتە « سرووشت و دەروون » بوونەتە ئایدیۆلۆژی ئەلفرێد دی مووسێ ، ئەگەر بتوانین وشەی ئایدیۆلۆژی لێرەدا بەکار بێنین .

جوانی ی و خۆشەویستی ، کە دوو خەسیەتی هەرە دیاری سرووشت و دەروونن ، بوونەتە بابەتی هەموو هەڵبەست و ڕۆمانەکانی دی مووسێ . بۆیە ، بە درێژایی ژیانی کورتی هەر بەدوای ئەڤینی دا گەڕاوە .

بەلام ڕۆمانتیکاتی دی مووسێ بە ئاشکرایی لەوەوە بەدیار دەکەوێ کە ئەو بەدوا گەڕانەکەی پتر لا مەبەس بووە تا گەیشتن بە ئامانج . تەنانەت کە گەیشتووتە ئامانج وەنەبێ خۆی بە بەختیار بزانێ ، چونکە ئا لێرەدا ـ بەبیرو بینینی خۆی ـ دەهاتەوە سەر ریالیتە ( واقع ) و خۆیشی بڕوای بە ریالیزم هەرنەبوو . کەچی کە ئەو « ئێستە » یە بەسەر دەچوو دەبووە رابردوو ، ئیتر نۆستالگیا ( غەریبی ) دای دەگرت و هەستی ناسکی بەو پەر تەکانەوە خۆی دەردەبری و جوانترین و بە سۆزترین شیعری گۆرانی و لاواندنەوەی لێوە هەڵدە قولا .

دی مووسێ خۆشی ی لەوەوە وەردەگرت کە بگری بەسەر وێرانەی دڵداری دا . دڵی بەوە دەکرایەوە کە فرمێسك ببارێنێ بۆ کۆنە یار ، بەسەر کاولە هەوار ، بۆ یادی دێرین بەیارو هەوارەوە . ئەم چوارینەی خوارەوە ڕاستی ئەو پنتکەمان زۆر بە ئاشکرا بۆ ڕوون دەکاتەوە :

هەموو هەناوم دەسووتێ بۆ تۆ
قەت نەمدەزانی ئازاری برین
هێندە ناخۆش بێ و شەوو ڕۆژ بەسۆ
کەچی کونە برین ـ ئەوەندە شیرین

واتا . دی مووسێ کۆنە برینی پتر لاخۆش بووە نەك برینی گەرم و نوو : دەسلێکبەردان و جودایی پتر کاری تێ کردووە نەك پێکگەیشتن و تیری ئەڤین گەرماو گەرم کەواتە . شاعیرە ڕۆمانتیکەکان بەگشتی . ئەلفرێد دی مووسێ ش بەتایبەتی ، عاشقی ڕابردوو بوون . لای دی مووسێ « یارێکم هەبوو » زۆر خۆشتر بووە لە « یارێکم هەیە » .

بەیی ی ڕەخنەگران ، ئالفرێد دی مووسێ ، جاروبار وشەی وای بەکار هیناوە کە چ جێگایەکی ـ وەك دەڵێن ـ « فیت » ی نەبووە لەناو هەڵبەستەکەداو تەنانەت تارادەیەکیش « بێ مانا » بووە . بەلام هەموویان لەسەر ئەوە رێکن کە ئەم شاعیرە ، بەبێ هیچ گومانێك ، ڕاستگۆو ئەمین بووە لەدەربڕینی هەستی دەروونی کۆمەڵی سەردەمی ڕومانتیزم لە فرەنسە .

**2 – دی مووسێ و سەردەمی ڕۆمانتیزم لە فرەنسە**

ئەو گاڤەی کە ئەلفرێد دی مووسێ ی تێدا دەژیا ( 1810 — 1857 ) بە سەردەمەی ڕۆمانتیزم ناسراوە . واتا شێوازی ڕۆمانتیك ببوە رێبازی هەموو جۆرە بزووتنەوەیەکی بیرکردنەوە

: سەنتیمەنتالیزم خۆی لەناو هەموو بابەتەکانی بیرکردنەوەدا دەنو اند ـ هۆنراوەی ڕۆمانتیك ، ڕۆمانی ڕۆمانتیك ، موزیکەی ڕۆمانتیك ، شانۆگەری‌ی ڕۆمانتیك ، ڕەسمو هەیکەل تاشی‌ی ڕۆمانتیكو هەموو بابەتەکانی فیلۆسۆفیا .

ئەو ماوەیە ، لە ئەورووپادا بەگشتی ، لەپاش دامرکانەوەی شۆڕشی فرەنسەیی (1789) بەچەند ساڵێك دەستی پێکرد لە ولاتانی ئەورووپادا یەکە یەکە ، ئەم چەشنە ڕێڕەوە ، چ زوو چ درەنگ ، خۆی پیشاندا . سا ، چ وەك وەلامدانەوەیەکی بەتوندی سەردەمی کلاسیکی پێش خۆی بوو ، چ وەك بەگژداهاتنەوەیەکی بەرکی ئەو ڕووداوە ئاڵۆزو پاڵۆزانە بوو کە شۆڕشی فرەنسەیی لەگەڵ خۆیدا هانی .

هەرچی چۆنێکی‌بێ ، با لەباسەکەی خۆمان دوور نەکەوینەوە ئەلفرێد دی مووسێ کە هاتە دنیاو چاوی کرایەوە ، ڕۆمانتیزمو سەنتیمەنتالیزم لەو پەڕی گەشانەوەدا بوون . ئەمیش وەك ڤیکتۆر هیگۆی زاوای ، وەك لامارتین ، وەك دی ڤینی‌ی ، وەك جۆرج ساندی دولبەری ، سرووشتانە ، هەر کەوتە سەر ئەو ڕێڕەوە . هەرچەندە کە ژمارەیەك لەوانەی باسمان کردن‌و هەندێکی تریش کە ناومان نەهێناون بەرە بەرە ، کەمو زۆر ، پشتیان لە ڕۆمانتیزم کردو کەوتنە ناو دنیای فیلۆسۆفیاو تەنگو چەڵەمەی ژیانی کۆمەلایەتی وەك لامارتین‌و جۆرج ساند ، بۆ نمونە . بەلام هەڵبەست بێژی ئێمە کۆڵی‌نەداو هەتا دوا هەناسەی هەر بە مەشخەڵ هەڵگری ڕۆمانتیزم مایەوەو نەیاری‌ی لەگەڵ هەموو جۆرە ڕێبازەکی نوێ‌دا دەکردو سەنتیمەنتالیزمی نۆستالگیکی وەك مەلۆتکەی ناو لانکێ دەپاراستو بەرەنگاری هەموو ئەو بیرو بینینە نوێ‌یانە دەبوو کە خەریکی پردانی کۆرپەکەی بوون . هەر لەبەر ئەوەشە کە پیاو دەتوانێ نووسینەکانی دی مووسێ بکاتە دوو بەش . بەشی یەکەمیان (1829 — 1835) لە پاشاندا مێلانکۆلیاکەی بەجاری لێ تیر دەبێ‌و تەشەنە هەڵدێنێ بەجۆرێ کە ڕوو دەکاتە هەڵبەستی سەردولکانە (eleqy) و هەستی زۆر لەجاران ناسکترو بەجۆش‌و سۆزتر دەبێ . دی مووسێ زۆر سەخڵەت‌و دڵتەنگ دەبێ بەوانەی کە بیری ئەویان بە خەیالاوی‌و فانتازی‌و بەدوای کلاوی بابردوو کەوتن دەزانی . ئەمیش ، نەبەزانە ، دەستی بەڕەخنە گرتن‌و هێرش بردنە سەریان دەکا . هەر لەبەر ئەوەش بوو کە خەلکی بە نوێنەری بەراستی‌ی‌و ئەمینی ڕۆمانتیزمیان دەزانی .

لە هەڵبەستی « یاد .. » دا ـ کە پاش تۆزێکی کە دەیخوێننەوە ـ دی مووسێ ڕەخنەکەی بە « دانتێ » ـ شاعیری هەرە گەورەی ئیتالیایی ـ وەدەست پێ‌دەکا ، هەرچەندە کە « دانتێ » چەند صەد ساڵێك پێش خۆی ژیاوە . بەلام ئەم ، کە دیارە خۆی بەدەرویشی دانتێ دادەنێ‌و تەنانەت ناوی « خوای خەم » ی لێناوە ، هێشتا لە هەندێ لە هەڵبەستەکانی ـ یان چاکترە بلێین بیرو باوەڕەکانی ـ ئەو بە گازاندەیەو دڵی لە دانتێ سارد بۆتەوە کە دەڵێ :

دانتێ ! چۆن دەڵێی لێی تاڵتر نی‌یە
بیرەوەری خۆش لە ڕۆژی بەغەم
کێ فێری کردی ؟ ئەم قسە چی‌یە !
بۆچ سووکی دەکەی ڕۆژی بەماتەم ؟

لێرەدا ، دی مووسێ گلەیی لە دانتێ دەکا کە چۆن بیرەوەری کۆن لە ڕۆژێك‌دا کە پیاو دڵی تێ‌دا تەنگە ، بەشتێکی وا تاڵ‌و ناخۆش دادەنێ ! بیروباوەڕی دی‌مووسێ ئەوەیە کە چاکترین دەرمانی دڵپەستی‌و ڕۆژی تەنگانە ئەوەیە کە پیاو دانیشێ‌و یادی .. کۆن بێنێتەوە بەر چاوی خۆی ، واتا نۆستالگیا .

بەکورتی ! لە ساڵەکانی دوایی ژیانی‌دا ، وا دەردەکەوێ دی‌مووسێ لە زۆران‌بازیەکی ناو گیانی خۆی‌دا ژیابێ . لەلایەك پاراستنی ڕێبازی سەنتیمەنتالیزم ؛ لە لایەکیش توانج‌و پەلاری بەرەی ناحەزان . بەلام ئەو ، وەك باسمان کرد ، کۆڵی نەداو لە لایەك بێشکەی غەمگینی دەلاواندەوە ؛ لە لایەکیش بەرهەڵستی ئەو باوبارانەی دەکرد کە بە تەمابوون هێلانۆکەی لێ تێك بدەن‌و خانوویکی لەجێ‌دا بۆ درووست بکەن .

ئەم زۆرانی‌یەی ناو دەروونی هەستیاری ئێمە ، بە جوانترین وێنە لە هەڵبەستی « یاد .. » یان « بیرەوەری .. » دا وەدەر دەکەوێ .

**3 — لێکدانەوەیەکی کورتی هەڵبەستی « یاد .. »**

ئەم هەڵبەستە یەکێکە لەسەردولکە هەرە خۆشەکانی شاعیر . لە ساڵی 1841 دا نووسیویەتی واتا لەگەڵ دەسپێکردنی لەسەرەخۆی کۆتایی سەردەمی ڕۆمانتیزم‌و بەرزبوونەوەی دەنگو هەرا دژی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بە تایبەتی لە لایەن

ریالیستەکانەوە ( واقعي ) . دیمووسێ ئەم هەڵبەستەی کردووە بە سێ بەش . بەشی یەکەمیان بریتی‌یە لە نۆستالگیای شاعیر بۆ کاولە جێژوانان و ئەو جێ و بالینگانەی کە لەکاتی خۆیدا دڵداری تێدا کردوون . زۆر بە وردی وەسفی ئەو کۆنە هەوارانە دەکات و هەمووی کۆ دەکاتەوە لەناو یەك تاکە وشە کە ناوی دەنێ « گۆڕ » یان « گلکۆ » . لەبەر ئەمە ، مرۆ ئەگەر هاتوو بێ ئاگا ئەم هەڵبەستەی خوێندەوە ، وا دەزانێ دیمووسێ بەراستی باسی گۆڕێکی راستەقینەی خۆشەویستێکی دەکات . بەلام نا .. مەبەسی ئەو گۆڕی بەراستی نی‌یە ، بەڵکو هەموو ئەو جێیانەن کە خۆشی ویستوون و تێیاندا رابواردووە بە تایبەتی سرووشت و ژیانی لادێ ؛ ئێستاکە بوونەتە یادگار ، تەنها تاکە سەردانەك یان تەنانەت بیر لێکردنەوەیەك ژێیەکانی دڵی دەلەرێننەوەو ئاگر لە هەناوی بەردەدەن . ئەوەی کە بۆی ماوەتەوە تەنها ئەو یادگارانەن کە لە کەلێنی دۆڵ و دارستان و رووبارو هەردو تەلانان بۆنیان دەکا . بە بیری خۆی هەر ئەمیان « راستی » یەو « هەیە » ، هەر ئەمیشیان مانەوەی بۆ هەیە . ئەوی‌تر ، واتا « ئێستە » و « داهاتوو » ، یەکەمیان تەنها چاوتروکاندنێکە کە نە بە « کات » نە بە « رۆژگار » دەژمێردرێ ؛ دووەمیشیان هێشتا هەر نەناسراوەو نەزانراوەو پشتی پێ نابەسترێ . کەواتە ئەو دوو هەنگاوەی رۆژگار ـ ئێستەو داهاتوو ـ نابێ پیاو هیچ حیسابەکیان بۆ بکا . بەمجۆرە ، بۆ رۆمانتیکەکان ، تاکە هەنگاوەك کە رۆژگار نابێ‌و راستبێ‌و هەبێ‌و هەتا هەتایەش هەر بمێنێتەوە هەر « رابردوو » ەو هیچی‌تر . بەلام رابردوو بریتی‌یە لە یاد ، ئەگەر رێیەك هەبێ بتگەرێنێتەوە دواوە بۆ باوەشی گەرمی رابردوو تەنها یادو خەیاڵ و نۆستالگیایە ، بۆیە ئەمانە تێکەڵ بە خوێنی دیمووسێ ببوون بە چەشنێك کە خۆی دەسنیشانی کردوە :

دەبا بە سەرما بکەوتە خوارێ
قورسایی ئاسمان پانم کاتەوە
چۆن خنکاو دەگرێ توند شەپکەدارێ
هێز نی‌یە من لە .. یاد جیاکاتەوە

دیمووسێ بڕوای بە گۆڕین نی‌یە سا چ گۆڕینی سرووشت چ گۆڕینی کۆمەڵ ؛ ڕکی زۆری لە هەموو شتێکی نوێیە . لەو سەردەمەشدا ڕووداوی سیاسی گەورە گەورەو خێرا خێرا بەسەر فرەنسەدا دەهاتن ـ لە ئیمپەراتۆراتی‌یەوە بۆ کۆمار وە لە کۆمارەوە دووبارە بۆ ئیمپەراتۆراتی ـ کە هەمووشی پاشماوەی هەراو هۆریاکانی ناپۆلیۆن بوو . هەڵبەتا ، ئەو رووداوانە گۆڕانەکی گەورەی کۆمەلایەتیشیان لەگەڵ خۆدا هێنا کە ئەمیشیان بووە سەرچاوەی بزووتنەوەیەکی بیری نوێ و فیلۆسۆفیك .

لەبەشی دووەمدا ، بوێژ دەست بەرەخنەگرتن دەکا لەو کەسانەی هەوڵی لەناوبردنی هەستی خەیالاوی مرۆڤ دەدەن . جگە لە دانتێ ، کە باسمان کرد ، هاوچەرخەکانی بە جۆرێك دەشواتەوە کە دەیگەیێنێتە رادەی گاڵتە بە ئەقڵ کردنیان . لە پاشاندا بەزەیی بەجۆری بیرکردنەوەیاندا دێ :

زۆر دوورن لەمن هەستی ناشیرین
زۆر دوورن لەمن بیری بێ مانا
بەلام بێ بەشان لە یادی دێرین
بێ بەشیشن لە .. خۆشی‌ی زەمانە

دیمووسێ باوەڕێکی یەکجار بەهێزی بە جۆری بیرکردنەوەی خۆی هەیە ، لەوە دڵنیایە کە ئەوانەی بەردی تێ دەگرن ، رۆژێك لە رۆژان پەشێمان دەبنەوە لە کاتێکدا کە پەشێمانی دادیان نادا :

بەلام کە هۆشتان هاتەوە سەرخۆ
دەپاڕێنەوە لە قاپی‌ی ئاسمانی‌ی
ئەوسا بێ بەبێ دەیچێنن وەك تۆ
فرمێسکی گیانی .. پڕ پەشێمانی

بەشی سێیەمی «یاد ...» دووبارە بەسەر دولکەیەکی زۆر بە سۆزو کوڵ دەست پێ دەکات . لێرەدا وەسفی ناشتنی کۆنە یارێك و گۆڕە تەنگو تاریکەکەی دەکات بە شێوازێك کە پیاو وا دەزانێ ئەمە مردن و ناشتنێکی بەراستی‌یە ، کەچی راستی‌یەکەی تەنها فانتازیایەو هیچی تر . دیمووسێ ، دلە ناسك و هەسینارەکەی بە تیری ئەڤینی‌ی نووسەرو شاعیری وەك خۆی رۆمانتیك ، جۆرج ساند ، دووبەدەر ببوو . جۆرج ساندیشی ماوەیەك حەزی لەو دەکرد . بەلام ئەو کچە شۆخ و شەنگە نۆزێ بە «کەیفچی» ناوی دەرکردبوو ، زوو زوو دۆست و

یاری دەگۆڕی ؛ جگە لەوەش ڕووداوە سیاسی یەکانی باسمان کردن کاریان تێ کردبووو بیرو باوەڕی دیموکراتیك و چاکردنی باری کۆمەڵ گەرایان لە مێشکی دا داکوتابوو بە جۆرێك کە ڕۆمانتیزمەکەی خەریك بوو ڕەنگ بداتەوە .

سروشتانە ، ئەم گۆڕانەی جۆرج ساند بەرەواژبوو لەگەڵ گیانی نەبەزی ئەلفرید دی مووسێ . جا ئەو گۆڕە تەنگ و تاریکەی بە وردی باسی دەکا هەر ئەو دەسلێکبەردان و جیابوونەوەی ـ بە لەش و بە گیان ـ ی خۆی و جۆرج ساندە .

لەپاش ئەو لاواندنەوەیە ، دی مووسێ ئیتر دنیای لەبەر چاودا تاریك دەبێ و لەبەر چاوی دەکەوێ . بەم جۆرە ، بەشی هەرە دوایی «یاد ...» بریتی یە لە هەناسە ساردبوونەوەو بێ باکی یەکی تەواو لە ژیان و تەنانەت لە داموودەزگای خالق ، هەرچەندە کە دیارە زۆر بە ئاشکرایی ناوێرێ دەری بڕێ .

«یاد ...» ، بە پێی ڕەخنەگرانی لیتەراتوور ، بە کارێکی مام ناوەنجی ـ نەك زۆرباش ـی ئەلفرێد دی مووسێ دا دەندرێ .

یەکەم : چوونکە بۆنی شێوازی سەردولکاوی ی لامارتینانەی لێوە دێ ، دوەم ، هەروەك باسمان کرد ، : ژمارەیەك لە وشەی بێ مانای تێدایە کە چ جێگایەکی وایان نی یە لە شیعرەکەدا یان پڕ بە پێستی خۆی نین . لەوانەیە ئەگەر دی مووسێ خۆی بمابا بیتوانیبا پێمان بسەلمێنی بۆچی ! بەلام پیاو دەبێ لێرەدا قەناعەتی خۆی بەوە بێنێ کە «المعنی في بطن الشاعر»ە . زنجیرەی هەڵبەستەکانی «شەوان ...» گوایا بە چاکترین کاری ئەدەبی ی دی مووسێ دادەندرێن .

لە کۆتایی دا دەمەوی دوو قسان لە بارەی گۆڕینی ئەم هەڵبەستە بە هەڵبەستی سەروادار نەك بە هەڵبەستی سەربەست بۆ سەر زمانی کوردی بکەم :

بە بینینی من ، پیاو کە هۆنراو وەردەگێڕێتە سەر زمانی خۆی ، مەبەس هەر ئەوەنی یە ماناکەی بگۆڕێ . ئەمە کارێکی زۆر گران نی یە بۆ وەرگێڕ چونکە بە ئاسانی دەتوانێ بی پەخشێنێ . هۆنراو بریتی یە لە ماناو کێش و موزیکەو سەرواو شێواز . تەنها وەرگێڕانی ئەو هەموو شتانە پێکەوە لە توانایەتی ئەتموسفیرەکی ڕەسەن بداتە هەڵبەستەکە . ئەگەر لەمانە هەر یەکەکیان کەمتەرخەم کرا ، ئەوا نابێتە وەرگێڕانەکی بەراستی و بەچێژ ، چونکە خوێنەری زمانی دووەم ئاشنایی یەکی تەواو لەگەڵ شاعیری زمانی یەکەمدا پەیدا ناکات . لەپاشاندا ، وەرگێرانی پەخشانی ی چونکە نەبەستراوەتەوە بە سەروا ، لەوانەیە (دەڵێم لەوانەیە) وەرگێڕ وشە بە وشە بیگۆڕێتە سەر زمانی خۆی کە ئەمەش شتێکی ڕاست نی یە . زۆر وشە هەن لە زمانێکدا کە هەمان مانا نادەنەوە لە زمانێکی دی . لێرەدا خوێنەر سەری لێ دەشێوێ و بزر دەبێ و ئیتر چێژ لە هەڵبەستەکە وەرناگرێ . بەلام وەرگێرانی هەڵبەست لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر ، بێ گومان ، دوورت دەخاتەوە لە گۆڕینی وشە بە وشە . چونکە خۆبەستنەوە بە سەروا ئازادی ی گەڕانت دەڕاتێ بە دوای وشەیەکی گونجاو لە زمانەکەی خۆتدا کە هەمان مانا بداتەوە نەك هەر خۆت ببەستیتەوە بەو وشەیە کە شاعیر لە زمانی خۆیدا بەکاری هێناوە کەچی دوور نی یە ماناکەت لێ تێك بدات لە زمانی خۆتدا . بۆ نمونە ، بۆیژی بە ناوبانگی ئینگلیز ، فیتزگێرالد کە بەشێك لە چوارینەکانی عومەر خەیامی (75 چوارین) گۆڕیوەتە سەر زمانی خۆی وەهەر لەوەوە زۆربەی بۆیژە ئەوروپایی یەکانیش گۆڕیویانەتە سەر زمانەکانی خۆیان ، ئاشکرایە کە وەستایی یەکی تەواوی نواندوە لەو کارەدا کە جێگای شانازی قسە پێکەرانی زمانی فارسیشن . بەلام تۆ وەرە بەراوردی وەرگێرانی فیتزگێرالد یان ئەوەی أحمد الصافي النجفي ـ شاعیری عیراقی ی ناودار ـ کە بە پێی شارەزایانی زمانی فارسی باشترین وەرگێرانی خەیامە بۆ عەرەبی ؛ دەڵێم وەرە بەراوردی ئەمانە بکە لەگەڵ زمانی خەیامدا ، دەبینی زۆر جار وشەی وایان هاوێشتۆتە ناو شیعرەکانیان کە زۆر دوورن لە وشەکانی شیعرە ڕەسەنەکە بەلام لە زمانی خۆیاندا هەمان مانا دەگرنەوەو خوێنەری ئینگلیزو عەرەب پانۆرامایەکی تەواوی ماناو موزیکەو شێوازی هەڵبەستە ڕەسەنەکەی دەخرێتە بەرچاو .

جا لەبەر ئەمە دووپاتی دەکەمەوە هۆنراو ، ئەگەر لە تواناداوبوو ، با هەر بە هۆنراو وەربگێڕدرێ . تا چ ڕادەیەك ئەتموسفێرە ڕەسەنەکە دەپارێزرێ لە زمانی دووەمدا ، ئەوە دەمێنێتەوە سەر توانای هونەری ی و ئەدەبی ی وەرگێڕ .

زۆرمان دەزانین کە زۆربەی بۆیژانی ئەوروپایی هەڵبەستەکانیان بەم شێوەی خوارەوە دەهۆننەوە : abab

واتا سەرواى یەکەم دێڕ لەگەڵ هی سێیەمدا و هی دووەمیش لەگەڵ هی چوارەمدا یەکدی دەگرنەوە .

لەم هەڵبەستەشدا «یاد ...» دیمووسێ هەروا رۆیشتوە . تەنها لەچەند چوارینەك نەبێ کە لەمەی لاداوەو هەر چوار دێڕ یان سێیانی چوارینەکەی بە هەمان سەروا کۆتایی پێهێناوە . منیش ، هەر لەبەر ئەو شتانەی لەسەرەوە باسم کردن ، ئەوەیشم رەچاو کردووە بۆ ئەوەی موزیکەی چوارینەکان ناساز نەبێ و بتوانم تا رادەیەك ببمە ئاوێنەیەکی بەراستی ی ئەلفرێد دیمووسێ بۆ خوێنەری کورد . گوتم «تا رادەیەك» ، بەڵێ ! چونکە وەرگێرانی هەڵبەست یەکسەر لە زمانە بنەرەتی یەکەیەوە بۆ سەر زمانی خۆت ، رەنگە هێشتان ئەو چێژو بۆنەی لێوە بێت کە لە زمانە بنەرەتی یەکەدا هەن . بەلام ئەگەر وەرگێران بە رێگای دوو ، سێ زمانانەوە کرا ، ئەوە ئاشکرایە وردە وردە لەهەر زمانێکدا تۆزێك لەو بۆن و چێژەی لێ دەبێتەوەو تا دەگا بە دوا قۆناغ دەبینین کەمی پێوە ماوەتەوەو ناتوانێ ببێتە ئاوێنەیەکی بێگەردی بۆیژو هەڵبەستە بنەرەتی یەکە . جا هەر چەندە کە لێرەدا باوەرم بە تینە تا رادەیەك لەمەدا سەرکەوتوو بم ، بەلام دەبێ دووپات و سێپات بکرێتەوە کە وەرگێران ، با ئەو پەری پسپۆری و وەستایی شی تێدا کرابێ ، هەر کۆپیەیەو کۆپیەش ئۆریگینال نی یە .

**عومەر دزەیی**

**هەولێر/ شەوی 1983/2/15**

# یـــاد

دوێنێ ئارەزووی گریانم دەکرد
تەزووی پیا دەهات دڵەی نامراد
هەرکە بیری تۆو سەردانم دەکرد :
هەوارگەی پیرۆز ، کۆنە گلکۆی یاد

پێی ناوێ دەستم بگرن ، خزمینە !
پێم پیشان مەدەن ئەو رێی لەبەرمە
چونکە خووێکی کۆن و شیرینە
کە دەمبا بۆ وێ و رێ پیشاندەرمە

سەیری ئەو گردو هەردو بەیارە
سەیری ئەو زیخەی بەر پێلی زیوین[1]
سەیری بزنە رێی ناو شاخ و دارە
جێی دەس لەملانەو قسەو پێکەنین

سەیری ئەو سەروەی بەرزو سەوز پۆش
سەیری دەربەندی پێچاو پێچی سەخت[2]
خەم خۆری من بوون ، بەلای لایەی خۆش
رۆژانی ئەوسام پڕ دەبوون لە بەخت

کۆمەڵە مەلی فریوی ئاسمان
دەستم دامێنتان دەچن بۆ کوێندەر
دەچنە هەوارگەی یاری خان و مان ؟
چاوەڕێم دەبن .. دەمبەنە وێندەر ؟

لێی گەڕێن برژێ ئەشکی شیرینم
کە هەڵدەقوڵێ لە دڵەی پڕ برین
لەسەر برژانگما ، باتیر ببینم[3]
ئەو پەردە جوانەی یادەکەی دێرین

من پەشیمان نیم لەوەی کە بووە
ئەو دارستانە خۆش و هێمنە
بۆنی دڵداری مەی هەڵگرتووە[4]
خۆشی لە داران ، خۆشیش لە منە

ئاخ دەبا بگریم ! خۆشیم گریانە
کرنووش دەبەم بۆت کۆنە گۆری چۆڵ
سەیری هەر لایێ دەکەی ژیانە
بەلام لەسەر تۆ شین نابن گیاو گۆڵ

سەیری سێبەری داران دەکەی تۆ
جارجار دەبیرێ تیشکی مانگەشەو
بەلام لە ئاسۆ کە هەڵدێ رووی تۆ
رۆژەو هەموو شت رادەبن لەخەو

ئەوجا لەو زەوییەی تەڕی پاش باران
بە تیشکت دەردێن هەزار بۆنی خۆش
ئەوساش دلداریی‌یە کۆنەکەی جاران
لە گیانما دەردێ ، ئای کە چەند بەجۆش !

چیان بەسەر هات ناخۆشی‌ی ژیان
کە پیریان کردم ، پشتم بوو چەماو
تۆخەی پیرە دۆڵ ، دۆستەکەی هاوگیان
کەتۆ دەبینم .. دەمکەیتەوە لاو

هۆ هێزی ڕۆژگار ! سالانی خۆشڕەو
ئێوەن لابەری گریان و مەینەت
بەلام بەزەیی دەتان کا لە خەو[*]
گوڵی ژاکاومان ڕانامالن قەت

هەموو هەناوم دەسووتێ بۆ تۆ
قەت نەمدەزانی ئازاری برین
هێندە ناخۆش بێ و شەوو ڕۆژ بەسۆ
کەچی کۆنە برین ئەوەندە شیرین

زۆر دوورن لەمن هەستی ناشیرین
زۆر دوورن لەمن بیری بێ مانا
بەلام بێ بەشان لە یادی دێرین
بێ بەشیشن لە .. خۆشی‌ی زەمانە

دانتێ ! چۆن دەڵێی لێی تالتر نی‌یە[*]
بیرەوەری خۆش لە ڕۆژی بە غەم
کێ فیری کردی ؟ ئەم قسە چی‌یە ؟
بۆچ سووکی دەکەی ڕۆژی بە ماتەم ؟

چۆن لەبیرت چوو ڕووناکی هەیە
لە دوای ڕووناکیش تاریکی دادێ
لەتۆ قەت نایێ ئەم چەند قسەیە
خۆت کە خوای خەمیت ، چۆن بەبیرتا دێ ؟

ئای خۆشە ! تروسکەی تاکە مەشخەڵێك
ئەم کفرەت چۆن کرد ! بەو خوایە تاکە :
لای‌من یادێکی کۆن و خۆش گەلێك
خۆشترە لە گشت خۆشی‌ی ئێستاکە

ئەی ئەو بەدبەختەی تروسکێ دەبینێ
لەبن سووتووی گەرم کە خۆی لەناوە
پڕ دەداتە گڕ ، واق وڕ دەمێنێ
چاوی لە مۆڵەق وا ڕاوەستاوە !

گیان خنکاو لەناو ڕابردووی بێ بن
خەو بینین بەو ئاوێنە شکاوە
پێی دەڵێی کابرا ! گوێ بدەرە من
ئەم شادی یە سادەت شێتی‌ی تەواوە

بە پەری شۆخت «فرانسواز» بێژە[*]
ئەم قسانە کە بە کەلك مە نایێ
بابۆت بلێ ئەو بەندە درێژە
چیرۆکی ماچی هەتا هەتایێ

مرۆ بۆچ ئەوها بیر دەکاتەوە
قەت ناچێ بەلای ڕاستی‌ی و ڕیاڵتە[*]
خۆشی‌ی و ناخۆشی‌ی لێك ناکاتەوە
ئەی بۆمن گومان لێی ناکەم مالتە !

ئێوە چۆن دەژین ، خەلکی بەستە زمان
بە خەندەو ستران ، هەنگاوی پان پان
ئاسمانی جوان و دنیای دوو زمان
بێزارتان ناکەن ، قەت نالێن ئامان !

باشە ، چارەنووس گەر هات لە ناکاو
ئێوەی ڕاپێچا بەلای هەیکەلێ
هەیکەلی عەشقی ، ئاخ ! لەبیر کراو
خۆ پەشێمانی‌ی ناوداتێ هەلێ

ئەوسا دەزانن ژیان خەونێکە
تەمەنی هێندەی بلقی سەر ئاوە
چونکە سەرابەو سەراب هەینێکە
نامێنێ کە پیاو دەیگاتە لاوە

هەی بەد بەختینە ! ئەو بلقی ئاوە
کە گیانی ئێوەی تێدا سڕ بووە
ئاسن نەرم دەکا ئەو تروروکەی چاوە[9]
خۆ پەشیمانی گەلێك لە دووە

گیانی تەزیوتان بەزەوی بەسترا
لەناو خاك و خوێن هەر دەخۆن خەمان
شەوتان بێ ئومێد ، ڕۆژتان بێ چرا
هەر ئەوەیە کە پێی دەڵێن ـ نەمان !

بەڵام کە هۆشتان هاتەوە سەرخۆ
دەپارێنەوە لە قاپی ئاسمانی
ئەوسا بێ بەبێ دەیچێنن وەك تۆ[10]
فرمێسکی گیانی پڕ پەشیمانی

بەڵێ ! کۆتایی گشت شت نەمانە
دنیا خەونێکە ، کەم لەبەر چاوە
شادیش وەك پووشێ کە بەدەستمانە
لەپڕ بایێ دێ و دەیبا بەولاوە

بەڵێ ! بەڵێن و ماچی یەکەم جار
کە پێکدی دەدەن دووگراوی کەم ژیاو[11]
لەبەر زەرگەلای هەڵوەریوی دار
لەسەر گابەردی لەتۆز وەرداو

شایەتی عەشقی ئەو دوو گراوە
ئاسمانێکە کە لە گۆڕانە
لەگەڵ ئەستێرەی کە بە حەواوە
چاو دەتروکێنن بۆ ئەو کۆڕانە

هەموو شت مردوو لەسەر رووی ئەرزا ـ
گوڵ ، مەل ، زیندەوەر ، کانی‌یەکەی جاران
کەڕووی ئەوانی تێدا دەلە رزا
ئێستا نەکانیاو .. نە وێنەی یاران

ئەوسا لەسەر ئەو هەوارگەی کاوڵ
چنگێ دادەرنن لەو خوڵ و خاکە
دەس بۆ دەس دەچێ و دەناڵێ لەمل
گیانیان لە مردن گەلێ بێ باکە

ژیران پێم دەڵێن ـ ئای کە بێ‌هۆشی !
شاعیران دەڵێن ـ بەخوا دڵخۆشی !
کە ترست لە ورەی باو خورەی ئاوە
ئەم خوشەویستی‌یەت لە کوێ هێناوە ؟

من زۆر شتی دیم لەژێر خۆر دیوە
نەك هەر گەڵای‌دار ، نەك هەر ڕەنگی گوڵ
نەك هەر کەڤ زێ کە هەروەك زیوە
نەك جریوەی مەل ، نەك دەنگی بولبول

چاوانم فێربووی هەزار شین و زار
ڕەشتر لەمەرگی جولیێتی نازدار
ڕەشتر لەو ژەهرەی کە لە شەوی تار
هەڵی دەقوراند ڕۆمیۆ بەیەك جار

. .

من بەچاوی خۆم بینیم تاکە یار
شۆڕ دەکریتەوە ناو گۆڕێکی ڕەش
گۆڕێکی تاریك ، تێی‌دا مشك و مار
ئەو لەشە نەرمەی دەگرنە باوەش[12]

لە هێلانەی دڵ ، بەشەوی تاری
دەمان هەژاند ئەو بێشکەی دڵداری
ئەوە بوو ژیان ! ئەوەبوو جیهان !
بەڵام هەزار داخ ! ڕۆیی یەکجاری

بەڵێ ! جوانکەو جوان ، جوانتر لە جاران[13]
وەك جاری جاران چاو پڕشنگاوی
لێوی نیو کراوەی دەنگی دەباران
کەمێکیش مەیلەو زەردە خەناوی

بەڵام ، نەدەنگ ، نە ، ئەو قسە خۆشانە
نە ئەو نیگایەی تێکەڵ بەهی من
دڵەی بەو پڕ بووم بە دوای ئەو جوانە
دەگەڕا بەناو ئەو دەریای بێ بن

چەند خۆشە ئێستا ، بام ئاوێزانت !
دەستێ بەرم بۆ سینەی ساردو سڕ
تا پێم بگوتبای ـ کوانێ پەیمانت ،
بێوەفا ! بۆچی جێت هێشتم لەپڕ ؟

نا .. نا ، وابزانم ژنێکی بێناو
ئەو نیگاو دەنگەی لەگەڵ خۆیا برد
منیش هەیکەلی ساردم لە پێناو
ئەوەوە بەرداو ڕووم لە ئاسمان کرد

ئێ باشە ئەمە .. بۆچ دەبێ وابێ !
دوا دەسلێکبەردان لە جوانی بێگیان
ئیتر بێباکم .. هەرچی دێ بابێ
من کە دڵداریم زۆر کرد لە ژیان

دەبا بەسەرما بکەوتە خوارێ ،
قورسایی ئاسمان پانم کاتەوە
چۆن خنکاو دەگرێ توند شەپکە دارێ
هێز نییە من لە .. یاد جیاکاتەوە

لام مەبەس نییە ، ئیتر جوانیی
مرۆڤایەتی گاڵتە بازارە
گوێم لەوە نییە ئاسمان بەیانی
مردووان زیندوو دەکا دووبارە

یەك دوا وشە .. بێژم ـ لەم جێیە
سەردەمێك مەست بووم من بە دڵداری
من ئەم خەزێنە بە نرخەم پێیە
دەیبەم بۆ ئاسمان .. بۆ خوا بە دیاری

**سەرچاوە**

1 ـ بەفرەنسی : C.A. FUSIL

ALFRED DE MUSSET

PAGES CHOISIES

LAROUSSE, PARIS 1934

2 ـ بە ئینگلیزی :

DOROTHY HILLYERS

A SHORT HISTORY OF ENGLISH LITERATURE

3 ـ بە ئەڵەمانی :

JOHANNES VON GUENTHER LYRIK AUS ALLER WELT ULSTEIN , BERLIN 1958

4 ـ فارسیو عەرەبی :
کتاب رباعیات حکیم ابو الفتح غیاث الدین ابراهیم خیام نیشابوری
شرکت سهامی تحریر إیران ـ برادران کاشانی

**پەراوێزەکان :**

1 ـ پێل : شەپۆڵ
2 ـ لێرەدا مەبەس دەربەندی «فرانشار»ە کە دەکەوێتە ناو دارستانی فۆنتانبلۆ .
3 ـ مەبەس فرمێسکی خوێەتی کە یادی جارانی لێوە بەدی دەکا .
4 ـ مەی : نێمەی .
5 ـ دەتانکا لە خەو : لە خەوتان دەکا ، بە ئاگاتان دێنێ .
6 ـ دانتێ : دیمووسێ لێرەدا قسەکانی ئاراستەی شاعیری هەرە گەورەی ئیتالیایی ـ دانتێ ـ دەکا .
7 ـ دیارە لێرەدا قسەکانی «فرانسواز» وەبیر دانتێ دێنێتەوە کە بە پێچەوانەی ئەو ئامۆژگارییانەن وا دانتێ لێرەدا دەیانکات .
8 ـ ڕیالتە ، ڕیالیتە : واقع
9 ـ ترووکە چاوێك : لەحزەیەك «غمضة عین» .
10 ـ تۆ : تۆو
11 ـ گراو : یار
12 ـ ئەمە باسی دەسلێکبەردانی خۆیو جورج ساندە ، نەك باسی مردووێکی بەراستی ؛ خۆی جورج ساند زۆر پاش دیمووسێ مردووە .
13 ـ جوانکە : لاو ، شاعیر لێرەدا بەردەوامە لە وەسف کردنی مردنی دولبەرە شۆخەکەی جۆرج ساند ، بەلام ڕاستییەکەی تەنها مەرگی ئەڤینییە نەك مەرگی گیانو لەش .

# پاژنێکی شاردراوە

جیهانی
میرۆك

●

**نووسینی : اسماعیل رسول**

●

دەی‌نواڕی‌یە ئاوێنە خڕە زلەکە ، کە لەسەر مێزێکی ساجی ڕەنگ قاوەیی چەسپێندرابوو ، هەر وەکو یەکەم جار بێ ، خۆی تێدا ببینێ ... قژە زەردە زێڕینەکەی ، بەسەر شانیدا شۆڕ ببوونەوە ، هێدی هێدی شانەی دەکردو دەستە سپی‌و نەرموڵەکانی بەسەردا دا دەخشاند . جار بە جاریش قامکێکی ئەو قژەی لە لووتە بچکۆلانەکەی نزیك دەکردەوەو وەك دەستە ڕێحانێك ، بۆنی دەکرد . چاو برکێی لەگەڵ چاوە ڕەنگ هەنگوینی‌یەکەی دەکرد ، کە بە ئاشکرا ، تیشکی خواستی دیدەنی ئەوی لێ دەهاتەدەر . لەپڕ هەڵساو چاوێکی بە کراسە ڕەنگ وەنەوشەیی‌یەکەی‌دا خشاند ، کە بە جوانترین شێوە ، ئادگاری لەشە شۆخ‌و شەنگەکەی دەرخستبوو ... جووت مەمکە خڕە قیتەکەی‌و سینگە نەرموڵەکەی ، کە وەك بەفری کوێستان بریسقەی دەدایەوە . ملوانکەیەکی زێڕین لە گەردنە بلووریەکەی شۆڕببۆوە ، کە قورئانێکی زێڕینی بچووکی پێوە لکابوو . دەست‌و پەنجەکانی ، بازنی زێڕو ئەنگوستیلەی بە یاقووت‌و مەرجانی سوور ، ڕازابوونەوە . زەردەخەنەیەك بەسەر لێوەکانیدا داگەڕا . لە ئاوێنەکەدا ددانە سپی‌و ووردیلەکانی وەك ڕستەیەکی مرواری دیاربوو . ڕەنگی دوو لێوەکانی وەك دەنکی هەنار سوور داگەڕابوون . روومەتی بەم‌لاو ئەولادا وەرچەرخاند ، نواڕی‌یە جووت گوارە زێڕەکەی دووبارە بزەیەکی دلڕفێنی ، ڕوخساری گەشاندەوە .. «باش دیارە» . ئەم گوارەیەی هەر بۆ ڕۆژی ئاهەنگ گێڕان‌و کەیف‌و خۆشی بەکارهێناوە ، جگە لەوەش هیچ کاتێ وەك ئیمڕۆ خۆی بەم شێوەیە نەڕازاندۆتەوە . هەر بە ئاسایی‌و ساکاری بردوویەتە سەر ، جل‌و بەرگێکی ئاسایی‌و دەم‌و چاوێکی بێ ئارایش لە دەستە خوشکەکانی جیاوازی دەکردەوە .

ئەوەی شانازی پێوە دەکرد ، عەبا ڕەشە نوێ‌یەکەی بوو ، باڵا شۆخ‌و شەنگی‌یەکەی پێ دەشاردەوە ، ئەو کاتە لە خۆی دەکردەوە ، کە هەردوو پێ‌یە بچکۆلە شاردراوەکانی لە جووتە قوندەرەیەکی ڕەشی پاژنە نزم دەینایە حەوشی قوتابخانەکە لوولی دەداو بە پەلە بەرەو ژووری مامۆستایان دەڕۆیشت لەوێ بە داریەوەی دەکرد . لەگەڵ ئەو ڕواڵەتە ساکاری‌یەشی ، لە وانی‌تر جوانتر دەهاتە بەرچاو . چەندین جار چرپە چرپی ئەوانی بەرگوێی دەکەوت :

- لەگەڵ ئەو هەموو جوانیەشی مێردێکی دەست ناکەوێ .
- ئاخ ئەگەر وا جوان دەبووم دڵی دەیان پیاوم دادەپلۆساند .
- ئەگەر (منی) ئەو جوانی‌یەی دەبوو ، قەت مێردە نەفرەت لێکراوەکەی جێی نەدەهێشت !! خۆی لەو چرپە چرپە گێل دەکردو بەبێ دەنگی بە رووبان دا پێدەکەنی‌و لە هەراو هۆریای منداڵە ووردەکانی قوتابخانەدا خۆی بزر دەکرد . لە ژوورەکەی‌دا بەرەو گرمەگرم‌و تەقەتەقەکەوە دەرچوو ، وای زانی ئەوان هاتن ، بەلام برا بچکۆلەکەی دی خەریکی دروست کردنی عارەبانەیەکی بچووکی داربوو . چووە ژووری چێشت لێنان دایك‌و خوشکە گەورە بە مێردەکەی ، خەریکی دروست کردنی قاڵبە کێکێك‌بوو ! قاپ‌و قاچاغ‌و پەرداغ‌و پاکەتی جگەرەو چوکلێت‌و شووشەی شەربەت‌و گەڵی کەڵ‌و پەلی تریش تێیدا پەرش‌و بڵاو بووبوونەوە . بۆنی هێل‌و بخوورو قاوەی سوورکراوەش هەموو لایەکی داگرتبوو . چەند مریشکێکی کوڵاو ، پارچە پارچە کرابوو ، ئاخێندرابووە ئامانێکی زلەوە . سەبەتێکی پڕ سەموون‌و تەشتێکی پڕ سەوزە چەند قاپ‌و فەخفووری‌یەکی پڕ تەماتەو مێوەجات ، بەم‌لاو ئەولادا ڕیز کرابوون . چاوێکی بە گشت لایەك داگێڕا ، ویستی بزانێ هیچ کەم‌و کوڕیەك ماوە ؟ .

میوانەکانی ئیمڕۆیان تایبەتین (عایدە) خان بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی‌و (خالیدە)ی کچی ، لەوانەیە چەند ئافرەتێکی خوییشیان لەگەڵ دابین «... دەبێ بە دروستی پێشوازی بکرێن» . هەر تەنها بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی نی‌یە یا وەك کچی خۆی خۆشی دەوێ ، بەڵکو ئافرەتێکی بەڕێزە لە بنەماڵەیەکی خانەدانە . خاوەن ماڵ‌و سامان‌و سەروەتن . پیاوەکانیان لەسەردەمی حوکمی پاشایەتی لە دەزگاکانی دەولەت‌دا پایەی بەرزیان هەبووە چەندین جار حیکایەتی ئەو ڕۆژگارانەی لەدەم بیستووە . بەڵگەی ڕاستی قسەکانیشی ، ئۆتومبێلە مار سیدسە شینەکەیانە کە تا ئێستاش شوفێرە کۆنەکەیان لایان سەری سپی کردووە .

- دایە هەموو شتێکتان بە باشی سازداوە ؟ ...

- ئەی کچم نابینی ؟ ! . بۆ عەشیرەتێك خواردنمان ئامادە کردووە . هیچ مەترسە ، وام کردوە روومان سپیبێ و خۆشمان پیشان دەین کە ئێمەش خانەدانین . ئەی باپیرەت ، خوای لێخۆش بێ ، خاوەنی زەوی و باغ و باخچەو مەرو مالات نەبوو ؟ . گەورەی گوندەکەی نەبوو من خۆم لە رەچەلەکی ناسراوترین هۆزنیم ؟ .

بەلام چ لە باوکە نەفرەت لێکراوەکەت بکەم ؟ هەمووی نەچواند ؟ بەدوو ژنی مێرد مردوو تەلاق دراو نەکەوت ؟ ئیشی هەر ئەوەبوو ، یەکێکی تەلاق داوەو ئەوی تری مارە دەکرد ، تا گەیاندییە یازدە ژن .... دەگ هەردوو چاوەکانی کوێر بێ و بە ئیفلیجی ببینم . دایە کاتی ئەو قسانەیە ؟ ئەوە دەیەم جارە حیکایەتی باوکمم بۆ دەگێریەوە .. ئێ بەس نییە ؟

- کچم بۆ لۆمەم دەکەی ؟ . لە رۆژێکی وادا نەدەبوایە ئەویش لێرە بایە ؟ .

رۆژی خوازبێنیتە لەوانەشە پاش چەند رۆژێ مارەت ببڕن و بە بووکیش بچی . ئەی کێ پێشوازی پیاوان بکات ؟ . چییان پێ بلێین ؟ بێ باوکە ؟ !

- کێشەکە هەر ئەوەنییە

- ئەی چی یە ؟

هەناسەیەکی قوولی هەلکێشا لە دلی خۆیدا گوتی «لە مە گەلێ قوولترو ئالۆزترە !»

بە دەنگێکی بەرزیش ووتی :-

- ئەوەی پێویستە ، بەرێزەوە پێشەوازیان بکەین ، خۆ دەزانی تا چ رادەی منی خۆش دەوێ .

- رۆلە ئەوە دەزانم چ پێویست دەکا بیخەیتەوە یادم ؟

ئەوە لەبەرچی وا دواکەوتن ؟ ! بۆ سعات چەندە ؟

- نزیکی پێنجی پاش نیوەرۆیە .. لەسەر هاتنن .

لەوانەشە بەرێگاوە بن .

پاش ماوەیەکی کورت ، زەنگی مال دەنگی دایەوە ، بە غاردان بۆ دەرگا کردنەوە چوون . (عایدە)خان لە ئوتومومبێلەکەی هاتە خوارێ ، بەدوای ئەوەدا ، کچەکەی و دوو ئافرەتی دیکەش . هاتنە ژووری و بەگەرمی پێشەوازی کران . چوونە هۆلەکە ، بە پاك و تەمیسی هاتە بەرچاویان لەسەر قەنەفە دار ساجەکەدا دانیشتن ، هێشتا هەر نوێ دیاربوو .

عایدەخان چاوێکی بە هۆلەکەدا خشاند ، سرنجی دایە گولدانەکەی سەر مێزە قاوەیی یەکەی نێوەند ژوورەکە ، چەپکە گولێکی خرابووە ناو ، دوو ئافرەتەکەش جارێ سەیری چوار تەپلەکە فۆرمیکاکەی ، روو رەنگاو رەنگەکانیان دەکرد کە لەبەر دەم قەنەفەکەدا رێز کرابوون ، جارێکی تریش دەیان نواڕی یە تەلەفزیۆنە رەش و سپی یەکەی سەر کۆمێدی یەی ساجەکە ، خالیدەی کچیشی گوێی لە ئاوازی گۆرانی یەکی عارەبی رادەگرت کە لەرادیۆ کارەبایی یە زلە کۆنەکەی سەر مێزێك بەرز دەبۆوە .

عایدەخان جگەرەییەکی داگیرساند ، سەرنجێکی دایە مافوورە رەنگاو رەنگەکەی ژێر پای ، لەبەر خۆیەوە ووتی دەبوایە قوندەرەکەم داکەنم مخابنە واپیس بکرێ .

ویستی دایبکەنێ . ژنەی خاوەن مال چریکاندی «بە خوا نابێ دایکەنی»

ئەویش لەبەر دەمیان دانیشت ، نایابترین جلی هەبوو ، کردبوویە بەر . سەرنجیان دەدایە قژە رەنگ قاوەییەکەی کە زۆربەی داوەکانی سپی هەلگەرابوون ، کرابوون بەچەند کەزی یەك ، بەسەر شانەکانیدا ، بۆ سەر سینگی شۆر ببوونەوە . چاروگەیەکی تەنکی شینی ئاسمانی ، بەسەریدا دابوو ، دەم و چاوە خرپنەکەی وەك تۆپە بەفرێکی سپی بە رەنگێکی ئال ، جوان کرابوو ، هیچ لۆچێکی تێدا بەدی نە دەکرا . سەریان سورما ، چۆن لەم تەمەنەدا ، کە لە پەنجا سال زیاترە ، وا جوان و دل رفێنە ؟

چاوە ووردیلە شینەکانی تیبرین ، بریسقەی رێزو روو خۆشی لێ دەهاتنە دەر سەرنجی دایە پرچە بەرەش بۆیاغ کراوەکەی (عایدە)خان و دەم و چاوە لاوازو زەرد هەلگەراوەکەی ، کە شەقلی تەمەنێکی درێژی پێوە بوو سەر سوورمان دایگرت «گەیشتوتە ئەو تەمەنەو هێشتا (تەقاعود) نەکراوە ؟ !» . چاوەروانی دەکرد ، ئەو قسەیەی بۆی هاتووە بە خێرایی دەری بەرێنی . دەشزانی ، ئافرەتان چ پێویستە لە هەلوێستی وادا بیلێن ... خوازبێنی کەرەکان ، چۆن بە بەژنو بالای دەزگیران هەلدەدەن و جۆری رەوشتی وای بۆ دروست دەکەن ، مەگەر لە مەتەلە ئەفسوونیەکاندا هەبێ . ئەوەشی لەبیرە ، کە دایکی کچەش لەم مەیدانەدا لەوان بێ بەهرەتر نییە . ئەویش کە (بلقیس) ی کچی بە شوودا ، بە هەمان کار هەلسا . ئێستاش ئامادەیە لەوە زیاتر بکا . بەلام لە سەرەتادا دەبێ خوازبێنیکەر دەست بە قسە بکا . قاوە دابەش کرا . دووبارە سەرنجی دایە خانووی بەرێوەبەر . دوو چاوە لێلەکانی لە روخساری شلێری کچی رادەماو ئادگارە جوانەکانی دەپشکنیەوە ، وەکو ، یەکەمجار ببینی ! . کچە لەرزێکی

بە تەنیدا داهات ، دڵی دایە کوتە کوت . رووبەتە ئاڵەکەی زەرد هەڵگەڕاو پەشۆکاوی‌و دوو دڵی نەخشەی بەسەردا کێشا .
- بۆ لام دانانیشی بووکە جوانەکەم ؟ چەند بە ئاواتی ئەوەبووم کوڕێکم هەبوایە ، بۆ ئەوم بخواستبای ؟ بەلام (نبیل) یش وەك کوڕم وایە . هەر لەو ڕۆژەی ئەمری خوای کرد ، بردمە لای خۆم ، هەرمنیش گەورەم کردووە .
ئەی پلکیش وەك دایك نی‌یە ؟
دایکە لەکەیف خۆشیا ، پێکەنین دایگرت . لەگەڵ خۆیدا گوتی ئەوە دەستی پێ‌کرد ، لە زاری هاتەدەر» . شەرم شلێری داگرت ، عارەقەی بەنێو چەوانی‌دا هاتە خوار لەپڕ هەڵساو بزەیەکی خەمباری لەسەر لێوانیدا دەرکەوت :
- لێم ببوورە عایدەخان . دەبێ یارمەتی (بلقیس)ی خوشکم بدەم .
تەنهایەو هەموو شتێکی بێ ساز نادرێ .
- ئەو بار گرانی‌یەی بۆچی‌یە ؟ خۆ ئێمە غەریب نین ؟ خۆمان بە خاوەن ماڵ دەزانین .
کە ژوورەکەی جێ‌هێشت ، چاوەکانی خاتووی بەرێوەبەر بەدوای‌دا دەروێشتن ، هەستێشی بەوەکرد ، کە دەرچوونەکەی بیانوو بوو . بەلام وای لێکدایەوە «کچی ئێمە مانان ، کە باسی مێرد کردنی لەگەڵ بکرێ بە تایبەتی لەبەردەم دایك‌و باوك‌و کەس‌و کاری ، شەرم دای دەگرێ» .
ئاوڕی لە دایکە دایەوە :
- وابزانم دایکی شلێر ، لات ڕوونە بۆ چ مەبەستێ هاتووین ناشمەوێ درێژە بە قسەکانم بدەم . شلێر وەك کچم وایە . خۆت دەزانی تا چ ڕادەیەك لام ئازیزە . شەش ساڵ زیاترە زۆربەی کاتی لەگەڵ مندا دەباتە سەر . پێویست ناکا ، ڕەوشتە جوان‌و باشەکانی ، بۆم بژمێری . من خۆم هەموو شتێکی لەبار دەزانم . هەرچی دەرحەقی ئەو بیلێم کەمە . هەر لەبەر ئەوەشە کردوومە بە یارمەتی دەری خۆم . گشت ئەرکەکانی بەرێوەبردنی قوتابخانەکەم خستۆتە سەر ئەستۆی ئەو . لای من لە زێر بە نرخترە بۆیێ هاتووم لێتانی بسەنم . دەیکەم بە مۆمێك ماڵێکی نوێی پێ ڕووناك دەکەمەوە .
دەی خەمە گلێنەی چاوم‌و لە (خالید)ەی کچم ئازیزتر دەبێ . قسەکەی پچڕی ، پەرداخە شەربەتێکی لەدەست (بلقیس) وەرگرت ، فرێکی لێدا ، بە تێڕوانینێکی سووچێکی چاوی ، سەرنجێکی دایە ڕوخسارە گەشاوی‌یەکەی دایکەکە . دڵخۆشی پێوە دی ... «وا دیارە قسەکانم جێگای خۆی گرت» ... بە ڕۆخی زمانەکەی لێوەکانی لستەوەو بە پارچە کلینیکسێك دەمی سڕی‌یەوە ! بە نەرمی کۆکی‌و گەرووی پاك کردەوە . جگەرەیەکی دیکەی پێکرد ، قومێکی درێژی لێداو ، دووکەڵەکەی بەبا داو هێڵەکانی لە بۆشایی هۆڵەکەدا پێچی خواردەوە دووبارە کەوتە قسەکردن :
- با بێمە سەر (نبیل)ی کوڕی خوشکم ، نموونەیەکی پیاوەتی جوامێری‌یە . چەند ساڵێکە ئەفسەری سوپایە ، بە چالاکی خۆی گەیشتە ڕوتبەی سەرۆك‌و تانجێکیان لەسەر شان بەست ، تا ئێستاش جێی ڕەزامەندی گەورەکانیەتی‌و شانازی پێوە دەکەن . جگە لەوەش پیاوێکی ماڵداری کەرە هەر لە ئێستاوە خانووە تازە دروست کراوەکەی بە نرخترین کەل‌و پەلی ، ڕازاندۆتەوە . هەر شتێك بە خەیاڵی ژندا بێت کرییوویەتی . ماڵەکە تەواوەو چاوەڕوانی بووکێك دەکات ، پڕی بکاتەوە .
چوکلێتێکی خستە دەم‌و کەوتە لستنەوەی‌و مژینی ، فنجانە قاوەکەی بۆیان هێنابوو ڕشتی‌یە دەمی‌و بەیەك قوم هەڵی لووشی . مژێکی لە جگەرەکەی دەستی‌دا ، کەوتەوە قسەکردن ، هیچ ڕەوشتێکی چاك نەما ، کە لەوکاتە بە خەیاڵیدا هاتبێ بە (نبیل)ی کوڕە خوشکەکەیەوە ئەلکێنی جار بەجاریش دووپاتی کردەوە : «وا تێنەگەی ئەوە دەڵێم ، لەبەر ئەوەی من پلکیم ، ئەم ڕەوشتانەی ئەولای هەموو کەسێ دیارە» دوو ئافرەتەکەی لەگەڵی‌دا هاتبوون گەڵی یارمەتی‌یان داو ، کەم تەرخەمی‌یان نەکرد بۆ بیرخستنەوەی بەهەر ڕەوشتێکی جوان کە بە خەیاڵی عائدەخاندا نەهاتبێت . دایکەکە بەبێ سێ‌و دوو ، ڕەزامەندی خۆی دەربڕی :
- عایدەخان من باوەڕم بە قسەکانت هەیە ، لەوەش دڵنیام کە لە کچی خۆتت زیاتر خۆش دەوێ .
نەبیلیش وەکو کوڕم وایە ، بۆ ئێمەش سەربەرزی‌یە تێکەڵی بنەماڵێکی خانەدانی وەك ئێوە ببین .
بەلقیس بەغاردان بەرەو دەنگی چەند هەڵ هەڵەیەکی تیژەوە ، بۆ هۆڵەکە هات کەیف خۆشی دایگرت‌و ئەویش دایە هەڵ هەڵەلێدان .
بە پەلە بۆ مەتبەقەکە گەڕایەوەو شلێری خستە ئامێزی‌و ماچی کرد :
- شلێر ... شلێر ، خوشکە پیرۆزت‌بێ .. زووکە ، بە خێرایی بچۆ دەستی عایدەخان ماچ بکە . ئەویش توی ویست ... ئای بۆ وا پەشۆکاوی ؟ ! ...چیتە ؟ ! خەمبار دیاری ،

لەبەرچی ؟ ! دەی خوشکە برۆ ناز مەکە بزانە ئەمرۆ خۆشترین ڕۆژگارە لە تەمەنی کچدا .

بە دەروونێکی شڵەژاو ، چەند شەقاوێکی بەسستی نا ، بەرەو هۆڵەکە چوو . عایدەخان وەك منداڵ خستی یە باوەشی ، بە ماچ ڕوومەتی داگرت ، زەردەخەنەیەك لچەکانی لێك کردەوەو چەند ددانێکی زەرد هەڵگەڕاوی دەرخست

– وەرە ... وەرە لام بووکە جوانەکەم : لە تەنیشت خۆیەوە دایناو ، دەستی خستە سەر شانی :

– ئەگەر گوێی لەم هەواڵە دەبێ گومانم لەوە نیە لە خۆشیانا باڵ دەگری ماوەیەکە خەون بەو ڕۆژەوە دەبینی . هەر لەو ڕۆژەی چاوی پێت کەوت هیچ قسەیەکی پێ ی نەما هەر باسی تۆ نەبێ .

ڕۆژ نی یە پێم نەڵێ «پەلەکەی دەچی بۆ خوازبێنی شلێر ؟» نازانی تا چ ڕادەیێ توی خۆش دەوێ ... کچم پیرۆزتان بێ ، بە خۆشی ببەیتە سەر ، خاوەن دە کوڕو دە کچ بن . ئافرەتەکان دووبارە دایانە هەل هەلە لێدان ، ئەوانیش ماچیان کردو تێر پێکەنین بەلام شلێر خۆی بێ دەنگ کردو مات داما ، نیشانەی دوو دڵی و خەمباری و خەفەتێکی ڕەش ، نەخشەی لەسەر ڕوخساریدا کێشا ، نەیزانی وەلامی چی بداتەوەو بڵێ چی ی ؟ ... نهێنی یەکی سامناك لە قوولایی ناخیدا ، خۆی شاردوتەوە ، لەو ماڵە کەس پێ ی نازانی هەر خۆی نەبێ .

ئەوانی تر ، کاتێکی خۆشیان بردە سەر ، دلخۆشی هەموویانی داگرت . خواردەمەنی و شیرینی و مێوەجات ، پێشکەشیان کرا . ڕێککەوتن لەسەر نیشان و مارەیی و کاتی گواستنەوەی . زیکەی هەل هەلە لێدان و قاقای پێکەنین ، تێکەڵی یەك بوون ، کرایە بەزم و هەڵلا ، منداڵی دراو سێکانیان ڕژانە کۆڵانەکەو لەبەردەم ماڵیان کۆمەڵیان بەست . ئافرەتەکانیش لە پەنجەرەو دەرگا نیوە کراوەکانیان ، سەریان هێنابووە دەرێ و سەیریان دەکرد . بەم جۆرە عایدەخان بەرێ کرا . کە سواری ئۆتومبێلەکەی بوو لەگەل کچەکەی و دوو ئافرەتەکە ، دەستە لۆچاوی یەکەی هەژاندەوەو خواحافیزی لێکردن . شلێریش ، بە پێچەوانە خو شکی و دایکی ، بە تێڕوانینێکی خەمباری بە ڕێی کردن و یەکسەر بۆ ژوورەکەی چوو دەرگای لەسەر خۆی گاڵەدا خۆی هاویشتە سەر قەریوڵەکەی ، بەکوڵ گریا .. «دەبوایە ، پیشەکی بەرێیانم بکردایەو خۆم نەخستبایە گێژاوی ئەو خەیاڵە خاوە . بۆ ... بۆ ئەوەم نەکرد ؟ ! ... خۆی وەرگێڕایە سەر گازی پشتی ، دەستەکانی خستە ژێر سەری ، چاوەکانی بە ساپیتەی ژوورەکەوە هەڵواسی ، نگوومی دەریای خەفەتێکی ڕەش بوو . جاری یەکەم نی یە ، کەیف خۆشی دەداتە خۆی ، دەچێتە ئاسمانێکی بێگەردی پڕ لەدڵخۆشی ، خۆی هەر دەخەڵەتێنی و لەبیر خۆی دەباتەوە ، کە هیچ جۆرە شوورەیی و ئابڕۆ چوونێك ، بەرەنگاری نەهاتووە .. خەیاڵێکە بە درێژایی چەندین ساڵانی تەمەنی ، لە مێشکیدا دەخولێتەوە ، تاڵترین ئازارو ئەشکەنجەی ساڵانی بەسەر چوویی ، پێ دەچێژی . هەر لەکاتی منالی یەوەو تا ئێستا ، خەوی بەو ڕۆژە دەدی ، بە پەنجە نەرمۆڵەکانی پارچە قوماشێکی سپی دە نەخشاند ، دەیکرد بە رووکەشی دۆشەکی سیسەمە بچکۆلەکەی ، کە خۆی لەدار دروستی کردبوو .

دوو بووکە شووشەی لەسەر ، دەخستە پاڵ یەك و تێ ی ڕادەما .

... ڕۆژێك دێ ، ئەویش سیسەمێکی ڕازاوەی لەوە جوانتری هەبێ ، لاوێکی بالا بەرزی وەك شەنگەبی لەپالیدا ڕاکشێ و بازووەکانی لە ملدا بە ئالێنی ، ئاوات و ئەو خەونە ئەفسووناوی یانە ، بهێنیتە جێ ، کە لە دڵی هەر کچێکی عاشق و دڵدار خۆی دەشارێتەوە ... جاری یەکەمیش نی یە ئەم دڵخۆشیی یەی وەك هەڵم دەفڕێ ... دەبێتە تازیەو ئازارێکی شاردراوە ... دەبێتە خەم و فرمێسك ، ڕوومەتی پێ دەشواتەوە . نەیزانی چۆن ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە دووبارە خۆی کوتایەوە مێشکی ، باش نایەتەوە یادی ، کە ئەو ڕووداوە ، لە کاتی خۆیدا ، هەستێکی شیرینی یا تاڵی خستنە دڵ ، دڵخۆشکەرەوە بوو یا بە ئازار ؟ ! ... هەلوێستێك بوو مێشکی لە جوولانەوە ڕاگرت ، جڵەوی سۆزی پێ ڕانەگیرا ... بوورایەوە ، کەوتە گۆمی خەونێکی خۆش ، وەك تێنووی لە بیابانێکی ووشکدا بادەی بەتامی نۆشی ... لێوەکانی بە لێویەوە نووساندبوو ، دەیان ماچی لە گەردن و سینە بەفرینیەکەی دەکرد . مەمکە تورتو خڕەکەی دەخستە ناو لەپی و دەمی پێوە دەناو وەك منالێکی شیرە خۆر دەی مژی . نووزەیەکی لێوەهات «بەسیەتی کامەران ... بەسیەتی خۆشەویستەکەم ، دەرەنگ داهات» ... هیندەی چاونووقاندنێکی پێ نەچوو ، ئازارێکی تیژ جوستەی بڕی ، دەنگێکی سامناك لە گوێچکەکانی زرنگەی کرد ، وەك گلەپەی ئاگر بیگرێ چریکاندی «ئای کامەران چیت کرد ، چیت کرد ، خۆ کوشتمت ؟ !» . وەلامی لە گوێچکەکانی دەنگی دایەوە :–

- نەترسی ، ئەو دلداریەمان قەت ناکوژم ، نای کەمە جوستەیەکی خوێن لێتکاوی ، فرێدراوی چۆڵێکی تاریك ... دەتخوازم ، هیچ نەترسی گوێت لێمە ؟ لە خەونە خۆشەکەی ، بە تۆقیونی راپەڕی . وەك کار مامزێکی تۆقێندراو رمێکی کوشندەی پێکەوت و لە خوێنا گەوزی .. ئێستاش و پاش تێپەربوونی ئەو هەموو ساڵە دوورو درێژانە ، ئەم دەنگە لە گوێچکەکانی دەزرنگێتەوە ،لە هیچ نەترسی ئەو دلداریەت قەت ناکوژم ...، بەلام خەیالێکی خاوە ، ئاواتێکی بێ ئەنجامە ، چەندین ساڵە خۆی پێوە هەلواسیوە ... تۆ بلێی خاوەنی ئەو دەنگە بە هانایەوە بێ و پەیمانەکەی خۆی بباتە سەر ؟ ! . دایکەو بەلقیسی کچی ماوەیەك بوو لە هۆڵەکەدا ، چاوەڕوانیان دەکرد ، کە دوا کەوت ، بە پەلە بەرەو ژوورەکەیەوە چوون ، لە دەرگا داخراوەکەیاندا :ـ بیکەرەوە بۆ دەرگا لەسەر خۆت دا دەخەی ؟ کە دەرگاکەی کردەوەو چاویان پێکەوت ، تۆقین دایانی گرت .

- کچم بۆ دەگریی ، خۆتۆ منال نی تا لەشوو کردن بترسێی ؟ !

خوشکە لەلەهەلی دایێ :

- چاوت لێنییە ، کچان چۆن ماوەی خوازبێنی رادەبوێرن ، کەیف خۆشی دەمو چاوییان دەگەشێنێتەوە ؟ دەست دەخەینە دەستی یەکترو بە شەقامو بیشانگاو باخچە گشتییەکاندا دەگەڕێن ، بە یەکەوە کەلو پەلی مالی نوێیان هەلدەبژێرن ... دەی خوشکە وەرە دەرێ ، پێکەنە ، ئەو مەترسییەت لەدل دەرهێنە ! .

- ئاخر بۆم ناکرێ .

- لەبەرچی ؟ ... ئەوە شت بەدل نییە ؟ ! چییەتی ؟ پیاوێکی زۆر چاکە . هەر کچێك ئاواتیەتی شووی پێبکا ، ئەم قسانە چییە کچم ؟ ...

من دلنیام لەگەلیان بەختەوەر دەبی .

- دایە لێم ببوورە ناتوانم

- بۆچی یاری منالانە ؟ ئەوە حەفتەیەکە ئێمە خەریکین ، بۆ ئەم رۆژە خۆمان ئامادە دەکەین ...نا ...نا ،لەو پەیمانەی پێم داون پەشیمان نابمەوە ، هەموو شتێ براوەتەوە . چییان پێ بلێم ؟ ! ... چی بە خەلکەکە بلێم ؟ ئەوان چیمان پێ دەلێن ؟ ! .

- چی دەلێن با بلێن .

- کچم عەقل بێنە سەرت ، جاری یەکەم نییە ، دەمانخەیە ئەو گێژاوەیە ، مەمانکە بە بنیشتی زاران چاویشت دەرێ دەبێ هەر شووی پێبکەی تێ دەگەی ؟ . کچە بە دەنگێکی تیژ قیژاندی :

- من شوو ناکەم چیتر لەسەری مەڕۆن .

- منیش پێت دەلێم ، ئەگەر هۆشت نەهێنییە سەرت حاشات لێ دەکەم .

تا مردن چاوم بە چاوت ناکەوێ وامزانی کچێکم بوو مرد . توورەیی دەمو چاوی داگرت و گلینەی هەردوو چاوەکانی تەنگ بوونەوە ، پڕوشکی ئاگرینی لێ دەردەپەڕین . کەوتە قسەکردن :ـ

دەمێکە گومانم لێ دەکردی لەگەل خومدا لێکم دەدایەوە دەبێ لەبەرچی بێ شوو ناکا ؟ ! :ـ بەلام ئێستا لام روونە ، ئاشکرایە ، شتێك لەبن سەری هەیەو لەمنی دەشارییەوە : کوا لە کوێیە ؟ ! بۆ نایەتە پێش ؟ چاوەڕوانی چی دەکا ؟ خەمباری نەخشەی بەسەر روخساری بەلقیس دا کێشاوە لە دایکی نزیك بووەو بە پارانەوە بۆ دەرەوەی راکێشا :

- دایەگیان لێی گەڕێ تا سارد دەبێتەوە من قسەی لەگەل دەکەم لەوانەیە رازی ببێ گەڕایەوە ژوورەکە ، بەگەرمی شلێری خوشکی خستە ئامێزی و ماچی کردو لێی پارایەوە :

- خوشکە تکات لێدەکەین ئەوە مەکە ، لەکە مەخە سەرمان ... کابرا چییەتی لەوە باشترت بۆنابی چاوەڕوانی چی دەکەی ؟ ئەو هەلە لەدەست خۆت مەدەو بەرژەوەندی خۆت بزانە .

- بۆ خاتری خوا لێم گەڕێن ، تکاتان لێ دەکەم ، لەبەرتان دەپاڕیمەوە ئاخر تێبگەن بۆ من شوو ناکەم ، پیاوە هیچ عەیبی نییە ، خۆم ئەوە دەزانم .. بەلام تێبگەن ناتوانم شووی پێبکەم من بۆ شووکردن دەست نادەم ئەوا چەندین ساڵە ئاوات و خەونە جوانەکانم گۆڕ کردووە ، چیتر بەم خەیاڵە خاوەوە خۆم هەلناوە شێنم چی پێ بلێم ؟ .. پاکانەی چی بۆ بکەم ؟ ... ئەبی ئەگەر ئەو رازەی چەندین ساڵە لە دلمدا شاردومەتەوە ، دەرکەوت کە دەبێتە چ ئابرو چوونێك ؟ ! ... لێی بپاڕێمەوە ؟ قوندەرەکانی ماچ بکەم ؟ تا سترم بکا . بشمرم ئەوە ناکەم .

سەری بە سینگی خوشکییەوە نا تێنی گریانێکی بە کوڵ هەموو لەشی هەژاندەوەو دایە چریکاندن :

- وازم لێبێنن ... لێم گەڕێن ئاخر ناتوانم ، نا ، ئێوە بۆ تێ ناگەن ؟ ! .

# ناڵەی دەروون

**«پێشکەشە بە گەلی کوردی تێکۆشەرمان لە ئێران»**

پەنا دیواری خانووەکەیان شانی پێ دادابوو ، ورگی پێ بەرەلا کردبوو ، قەڵ دووکەڵی جگەرەکەی بەرەو ئاسمان ئەنارد ... پەژارەو پێشخواردنەوە دەستیان لە بیناقاقەی توند کردبوو چەکوشکاریان لە کەللەی سەریا ئەکرد ، گیانێکی بە جگەرەکەی بوو بۆیە پەیتا پەیتا مژی پێوە ئەنا :

- ئەڵێی سپلی لاورگێن ! ئەوی کەڵك بێ تیامانا بەدی ناکرێ .. هەروەك ئاژەڵ بەم ڕۆژگارە ئەخوێن و ئەخەوین و خەفەت بەبا ئەدەین .

توندتر بە لوولەی جگەرەکەیاو لێی ئەنەوی !

- قوڕ بەسەر وەچەکانمان ، ئەتر سم ئەوانیش وەك ئێمە وەیشمەی ژیان ریشەکێشیان بکات .

پەنگی دووکەڵ ئەو ناوەی تەنیبۆوە ، کانیاوی چاوەکانی شەستەباران بوو لە ریشە سپییەکەیدا جۆگەلەی هەڵبەستبوو :

- خەمی ئەم دنیایە لەسەر دڵما تۆپەڵەی کردووە ، رووناکی خۆشی خۆیان لێ تۆرانووم .

باقە جگەرەیەکی تری رەوانەی سووتاندن کرد ، جگەرەی دووەمی ئەگەیاندەوە بە یەکەم ، دووکەڵی ئەمیشیانی فریای ئەوی تریان ئەخست .. کەوتەوە باسکە مەلە ، بەسەر هەورازو نشێودا کشا . چیاو شیوو دۆڵی ئەو ناوەی پەی کرد .. هەنگاوەکانی شانیان لە شەماڵ توند ئەکرد ، زۆر ڕۆیشت ، هێزو هەناسەی کەوتنە هاوار :

- هەر ئەبێ هەواڵێك ، دەنگێ ، باسێ ، سۆراخێکی ئەو ناوەم دەستگیر بێ .. لە دامێنی ئەو شوێنەی کە بۆ یەکەمجار سێیەکانی بایان تێزابوو ، مەلاشووی تیا هەڵدرابووەوە ، ئالەویدا وێستەیەکی کرد .. دەستێکی بە چاوەکانیا هێنا .

- ئەترسم چاوەکانم راستیم لێ بشارنەوە ، ئەی وانی‌یە ، ئەمە هەر ئەو شوێنەیە بست بە بستی ئەناسمەوە ، تاشەبەردەکانی ، تاویرو شیوو دۆڵەکانی تەنانەت خۆڵو گەردەکەشی .. هەمووی ، ئاوی ، داری ، درەختی ئاشنامن و ساڵەهای ساڵە پشتاو پشت پێکەوە هاتووینەتە خوارێ . وەك کرمی دوو دڵی لە مێشکیا بجووڵێ :

- ئەی ئەبێ بۆچی وا هەڵقرچاوو رەش هەڵگەڕاوە ؟ .

توندتر مێشکی گوشرا ، زیاتر گێژی خوارد .. تیری چاوەکانی گرتە چواردەوری خۆی ، بە دامێنی دەشتەکەی خوارەوەدا نووسا .. تینی دایەوە خۆی و لەشی بەکێش کرد سەرنجی چزا بە رانە مەرو گاگەڵ و ئاژەڵێکدا ، دەمیان لە زەوی چەقاندبوو سەریان هەڵنەئەبری سەرسام بوو زیاتر سەرنجی لێ توندکردن بینی کە هەموو ورگیان درابوو ، لەسەر ئێسکو پروسکیان ووشك هەڵهاتبوون .. تاوێ‌دا بەخۆی بەرەو شوانەو لە ئامێزی گرت :

- بۆچی ورتەت لە خۆت بریوە دەنگ ناکەی ؟ ئەمەی ئەیبینم ، سیحرە ، جادووە ، تەلیسمە یان راستی‌یە ؟ ! .

نەڕانی بە سەریا :

- ئەی هاوار پێم بڵێ وا شەقم برد ، شێت بووم .

شوانەی لە باوەشێ خۆی دوورخستەوە .. لە تەوقی سەریەوە تا نووکی کلاشەکانی لە هەردوو چاویا توندکرد .. شوانەو شمشاڵەکەی رەق هەڵهاتبوون . زۆری کردو کۆشا پەی بە هیچ نەبرد .. هەتا ئەهات مێشکی کاس ئەبوو .

سەراسۆی کەللەی سەری جۆشی ئەسەند لەشی زیاتر دا ئەهەژا .. ویستی زوو بگاتە دەشتەکەی بەرمالان ، بزانێ لەوێ چ باسە ؟ ئەو ناوە چی بەسەر هاتووە ؟ هەنگاوەکانی فرەوانتر ئەنا .. کە گەیشتە ئەوێ ، چاوەکانی چاڵی مێشکیان بەجێ هێشت و دەرپەرینە دەرەوە .. بینی هەرچی سەوزاییەك و شینایییەك لەو ناوەدایە لەسەر بنجی خۆی ووشك هەڵگەڕاوەو سیسی بوتەوە ، دەستی بۆ هەر بنچکێك ئەبرد ئەهات بە دەستیەوە ..

- هەرگیز ئەمە ئەوێ نی‌یە ! بڕوام نی‌یە ئەو رەزو باخ و بێستانە بێ بەجێم هێشتن ! .

پاش ورد بوونەوە تێڕوانینێکی زۆر بەخۆیا هاتەوە :

- ئەوانن ، هەر خۆیانن .. ئەوە رەزەکەی من ، ئەوە پەڵەکەی وسوو ، ئەوە هینەکەی کاکل .. ئەوە باخ و بیستان و هەموو سەوزی و شینایییەکانی گوندەکە .. ئەوە دارو شێخەڵ و دەوەنەکان .. ئەی هاوار ئەوە بۆ هەموو بەجارێ رەشی هەڵگەڕاون .. ئەی بۆچی هەموو باران و بەفرەکەی ئەم چەند ساڵە گیانێکی بە بەردا نەکردوونەتەوە ؟ ..

ئەو شەوەی کە کاکەبرا ماڵ ئاوابی لێکردن شەو هەتا بەرە بەیانێکی درەنگ بەو ناو باخ و درەختو ڕەزانەیا وەك دڵداریك دوا شەوی بێ لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا ، ئاوها باوەشی بەو دارو درەختانەیا ئەکردو لە ئامێزی ئەگرتنو ماچی ئەکردن ، کوڵی گریانی نە ئەنیشتەوە ، لە بەرەبەیاندا دەستی کرد بە بەری پشتێنەکەیداو ئەو توورەکەیەی دەرکرد کە بۆ ئەو مەبەستە هێنابووی بەبەر هەنسکو گریانەوە کەوتە ڕنینەوەی گەڵای درەختەکان ، لەهەر درەختێ تۆپەڵێ گەڵای ئەکردەوە نەك ئێشو ئازاریان پێ بگات :

(بۆ داوو دەرمانی لەمرو بە دوامانەوە .. باو باپیرانمان لە مێژەوە وتوویانە گەڵای درەختێ بەری بۆ هەموو دەردو دەرمانو ئێشو ئازاریك یەکاو یەکە .. با ئەم توورەکە گەڵایە بۆ داودەرمان ، بۆ یادگاریو بیرەوەری بمێنیتەوە بۆ وەچەکانی دواڕۆژم)

- قوڵپی گریان لە گۆمی بیرەوەری ئەو ڕۆژەیا دەری هێنایەوە :
- ئای لەو ساتەی بۆ دواجار خواحافیزیم لەگەڵا کردن .. ئەوە بۆچی ئاهو ناڵەی هەردوو لامان شەقی بە ئاسمان نەبرد ؟

خۆ هەر ئەوەنە نەبوو لە ڕەگو ریشەدا دەربێنو بکەونە دوامان .. ئەبێ هەر ئەو خەفەتو پەژارەیە هەڵی نەپرووکاندبێنو نەی سووتاندبێن ؟ ! .

هەردوو چەموڵەی لە کەلەی سەری نەوین .. کەوتنە گوشینی وەك بیانەوێ هەر چیەکی تیا کۆبووتەوە لێی بچۆڕێننەوەو بەتاڵی بکەنەوە .. فرمێسك هوون هون بەسەر سنگیا شۆر ئەبووەوە .. بۆ ماوەیەکی باش زەوییەکەی ژێر پێی گرتبووی تاوی دایەوە خۆیو گۆچانەکەی دەستی بەرەو پێشەوە بەکێشی کرد بۆ لای ئەو کانیاوە بردی کە پشتاو پشت سەرچاوەی ژیانی ئەو ناوە بوو .. وەك مندالێکی ساوا لە پێشکەدا بتاسێ دەست خرابووە بینا قاقەییو نووزەی لەبەر برابوو . بەچەند وچانێك گەیشتە سەری .. لەپڕ چاوەکانی هەڵخلیسکان ڕەشکەو پێشکە بەری لێگرتن ، بە توندی بە هەردوو دەستی لێیان نەوی پاش کەمێك لە چاوەکانیا کۆمەڵە مندالێکی کاکۆڵ بەسەری تیا بەدی کردن کە هەموویان بە پاچو بێڵو خاکە نازەوە لە پێرەکانی نەوین ، زیاتر لێیان وردبووەوە ، بینی وا بە هەموویان خەریکن بەری کانیەکە پاك ئەکەنەوە .. خەندە کەوتە لێوەکانی ، لە خۆشیانا خەریك بوو شاگەشکە ببێت .. بێپەروا هەڵەتی بۆ مندالەکان برد ، باوەشی کرد بە هەموویاناو کەوتە گوشینو ماچ کردنیان ، بینی پێوە گرتن .. فرمێسکو خەندە تێکەڵ بەیەك بوون تاوی دایە خۆیو دەمی کەوتەگۆ :

- ماندوو نەبن کەسی مامینە .
- سوپاست ئەکەین خاڵەی ڕێبوار ..

وا دەرئەکەوی تینوویەتی لای لێ سەندبێت .. دەفەرموو ئاوێکی ئەم کانیە خنکاوە بخۆرەوە ..

زمان لە دەمیا داما .. دەمەو لەپ خۆیدا بەو قوراوەی لە دەمی کانیەکەدا پەنگی خواردبۆوە ، ماوەیەکی باشی دەمی لەناو دەمیا بوو .. ئینجا بە وێنەی مندالێکی لاسار کەوتە شلپە شلپو شەرە ئاو .. وەك هەست بە تەریق بوونەوەیەك بکات :

- دە تخوا با منیش یارمەتییەکت بدەم ! .

دەنگی منالەکان تێکەڵ بەیەك بوون :

- پێویستیمان بە تۆی ماندوو نییە ، فەرموو تۆ ئیسراحەت بکە .. ئێمە وا شانمان داوەتە بەر ، خەریکین بە تەواوی قورگی ئەم کانیە تاساوە بەر بدەین .. چاوەکانی لێیان نە ئەبووەوە ، هەموو ئەندامەکانی لەشی گوێ بوون بۆ قسەکانی ئەوان .. قسەکانیان لە مێشكو دڵو دەروونیا ئەڕواند .. هۆشو بیرو هەستی دەستی یەکیان گرتبوو ، چاوەڕێی ڕێکردنی ئاو بوون کە فریای ئەو ڕەزو باخو درەختو دارستانە بکەوێ کە تووشی لارەشەو هەڵپروکاندن بوون ، بە هانای ئەو مەرو مانگاو ئاژەڵانەوە بچێت گورگی خەو تێیان کەوتووە ، ژیان بخاتەوە بەر شوانەو شمشاڵەکەی تا جارێکیتر ئەویان فوو بکاتەوە بە میاناو کورگەڵو کچانی ئەو ناوەش ڕەشبەڵەكو چۆپی لێگەرم بکەنەوەو بە ئارەزووی خۆیان تێر هەڵپەڕن .

هەردوو چاوی تێکەڵ بە هەموو ئەو چاوانە کرد کە لە قورگی کانیەکە چەسپابوون ئەوەندەی پێ نەچوو کە هەموو چاوەکان لەگەڵ ئاوی کانیەکەدا کەوتنە بەرزەو نزمەو کەرویشکەو هەڵپەڕین .. کاتێ کە هەمینی ژنی بانگی لێکرد چاوو مێشكو هۆشی لە ئاوەکە جیابوونەوە .. ! ..

# یەکەم گۆرانی بێژی سەرقەوان

# حەمدی ئەفەندی

کەمال رەئووف محەمـەد

« یەکەم کوردی لای خۆمان کە لەسەر قەوان ، گۆرانی گوتبێت ، حەمدی ئەفەندی‌یـە . من لەوەپێش قسەم لەگەڵ مەسئوولی شەریکەتی ئەبو جەلپ[1] کردبوو کە گۆرانیی کوردیی بۆ دەرناکەن ؟ گوتیان کەس نی‌یە و سەرفیش نابێ . گوتم : هەیە و من بۆتان پەیدا دەکەم . گوتیان : تۆ بۆمان بنێرە و ئەگەر سەد دانەت لە قەوانی فرۆشت وەکالەتت دەدەینێ .. کە کەسیش هیچ وەکالەتێکی نەبوو . منیش بە حەمدی ئەفەندیم گوت کە شتێکی واهەیە . قاقەزم دایـە بیبات بـۆ ئەوان بـەو شەرتەی کە قەوانی دەرچوو هەر بۆمنی بنێرن . ئەویش چووبۆ بەغدا[2] بۆ لای ئەو شەریکە تەو —5— قەوانێکی دەرکرد . وا بزانم دەوری سەد روپی‌یەی وەرگرتبوو . ساڵەکەش هەر لە دەوری 1926 — 1927 دا بوو . دووای نزیکەی مانگ و نیوێکیش بە پۆستەدا ، لەناو قوتوودا لە بەغداوە قەوانەکانم بۆهات کە خۆم بە سلێمانی و کەرکووك و چەمچەماڵم دەفرۆشت . دانەییم دەدا بە 50 — 40 — 30 — 20 روپی‌یە . قادر ئاغای عەتار و[3] حەمـەی برازاش کە دووای من وەکـالەتی قەوانیـان وەرگرت ، چـەند کۆششیان بۆوەرگرتن و فرۆشتنی ئەو قەوانانە کرد ، هەربۆیان نەچووە سەر ، کە گۆرانی‌یەکانیش بڵاوبووەوە ، خەڵکێکی زۆر سەریان سوڕما و زۆریان پێ‌خۆش بوو . هەتا هەر چایخانەیەک ئەم گۆرانییانەی لێ‌بدایە ، هەفتەیەك زیاتریش چایخانەکەی بەر نەدەکەوت . حەمدی ئەفەندیش خۆی لەبەر دەرکی سەرادا لە سلێمانیدا لەگەڵ رەشیدی مەلا برایم چایخانەی هەبوو . ئەو گۆراینیانەی کە زۆر باویان هەبوو « ئای ئای و پییرەمەگروون موقەددەسیی » بوون . قەوانی واش هەبوو ، ئەم دییو و ئەو دییوی یەک گۆرانی بوو . هەشبوو ، لەسەر یەک دییودا بوو . »

بەو جۆرە کاك عومەر قەززازی حەفتاو هەشت ساڵەی یەکەم وەکیلی کومپانی‌یەکانی قەوانە کۆنـەکان لە سلێمـانیدا گلۆڵەی شریتی بیرەوەریی خۆی بۆ کردینەوە کە هەنـدێ لەو یادگارانەیشی لەوەپێش لە ساڵی 1979[4] دا بـۆ گێڕاینـەوە ، کە حەڤدە سـاڵیشە خـولیای دۆزینـەوەی قەوانـەکانی حـەمدی ئەفەندی ـ ن و سەرەڕای نەدۆزینەوەیشیان هێشتا هیوادارین و گەڕان و پرس‌کردنمان نەبڕاوەتەوە .. بەڵام ئەگەر دەفتەری بیرەوەریی ئەو بەسەرچاوەیەک تەماشا بکەین ، ئـەوا دەبێت چەند پرسیارێکی تری بەرەو ڕوو بکرێتەوە :



حەمدی ئەفەندی

▷ ◁

- **مامۆستا عەلی مەردانی** [5] کۆچ کردوو وای دەگێڕایەوە کە ئەو لەپێش هەمـوو کەسێکـەوە گۆرانی کـوردیی لەسەر قەوان تۆمار کردووە ، تۆ دەڵێیت چی ؟

* ئەوی من ئاگاداری بم کوردی خۆمان ، کەسیان لەپێش حەمدی ئەفەنـدی‌یەوە ، گـۆرانی لەسەر قـەوان تۆمـار نەکردووە . دووای - ئەم - ئەمجا قەوانی عەلی‌مەردان و حەمەمین گەرمیانی [6] و حەمەسەعی کە سەرراج بوو لە خانی حاجی قەددووری لە بەغدادا ، هەروەها قەوانی دایکی جەمال و [8] و مەلاکەریم [9] و غەفوور ئـاغا [10] پـەیدا بوون ، هەتا دێتەوە بیرم لەگەڵ دەرکەوتنی گۆرانی‌یەکانی حەمدی ئەفەندی ، لەو هەمەلەدا قەوانی ئافرەتێ بە تورکیی ئەستەمووڵیی دەرچوو ، ژنەکە وا بزانم - پلاس خانم - ی ناو بوو . وەکو گوتم دووای حەمدی ئەفەنـدی گۆراینی عەلی‌مەردان پەیدا بوو کە یەکێ لە گۆرانی‌یەکانی ئـەم بەستەیە بوو کە ڕەواجی هەبوو [11] :

لەگەڵ تۆمە ئەی فاتیمە
مەمکت فنجانی گوم گومە
خۆم قاوەچیی پێم لازمە .

ئـەمە لە دیـوێکی قەوانێکـدا بوو کـە دیوەکـەی تـری - قەتاری گـەرمیان - بـوو . حەمـەمین گـەرمییانیش قەوانێکی [12] دەرکرد کە دیوێکی - قەتار - بوو ، دیوەکەی تری ئەم بەستەیە بوو کە ڕەواجی هەبوو :

کەوای بەرت شەیتان بێژی
دوگمەی قەیتانی تەورێزی
ئیمام ڕەزا بیپارێزی

- **وەکو تۆ حەمدی‌ئەفەندیت ناسیوە ، ئاخۆ بۆچی هەر - 5 - قەوانی دەرکرد و ئیتر تەواو ؟**

* چونکە دووای ئەو خەڵکی تر پەیدابوون . جگـە لەمەش ئەگەر ڕاستت بوێت ، حەمدی ئەفـەندی گـۆرانی‌بێژیی پێ‌خۆش نەبوو [13] ، خۆی بەکیبار دەزانی .

● **گۆرانی‌یەکان :**

کە قەوانەکان لەبەر دەستدا نەبن و سەرچاوەیەکی تـر بەدەستەوە نەبێ ، هەڵبەت دیسان پشت بە بیرەوەریی ئەم و ئەو دەبەستین ، بەشکو نزیک ببینەوە . کاک قەززاز سەرچاوەیەکە . بـرازای حەمـدی ئەفـەندیش : کـاگ ئەبووبەکر ئیسماعیل [14] - مەئمووری مـاڵ لە ڕانیەدا ، کاک فوئاد ڕەسوول [15] لە هەولێردا ، دەستیان گرتووین و گۆرانی‌یەکان ئەمانەن :

1 - ئای ئای ... « مەقام » . ( کاک قەززاز و کاک ئەبووبەکر نـاویان هێنـاوە و کەسیشیـان نـازانن هـۆنـراو هی کـام شاعیرە ؟ )

2 - بەهار هاتەوە بەهار هاتەوە
وەختی گوڵ و گوڵزار هاتەوە ... « بەستە » . ( هەر کاک قەززاز ناوی هێنا و ناشزانێت هۆنراوی کێ‌یە ؟ ) .

3 - پیرەمەگروون موقەددەسی
دۆستی دائیمی کوردی ... « سروود » . ( کاک قەززاز و کاک ئەبووبەکر و کاک فوئاد ناویان هێناوە . کاک فوئاد لە نامەیدا دەڵێت : گۆرانی‌یەکی ئەو سەردەمە کە زۆر باو بوو بەڕادەیەك کە دانەیەکی ئەم قەوانە بە یەك لیرەی زەردی ئەو زەمانە دەفرۆشرا ، گۆرانی‌یەك بوو کە بە دەنگی پیاو بوو . ڕوویەکی ئـەم قەوانـە گۆرانیی - پیـرەمەگـروون موقەددەسی بوو . ڕووی دووەمیان گـۆرانیی : - چێشتم ئەمرۆ ژەهری مار ، بوو . مۆسیقای ئەم گۆرانییانە تەنها بە - پیانۆ - بوو لەسەر شێوەی هارمۆینی مۆسیقای ڕۆژئـاوا بە دەنگێکی - تـەینۆر - [16] و بـەرز دەگـوتـرا . « تێبینی : شیعری ئەم سـرووده هی عەبـدوڵڵا زێوەری شاعیرە (گ . ر . م » ) .

4 - **چێشتم ئەمرۆ ژەهری مارو ڕۆحی شیرینم نەهات**
**زەخمی کۆنەم هاتە ژان و مەرهەمی برینم نەهات ...**
( هەر کاگ فوئاد ناوی هێنا . « تێبینی : شیعری

العـــدد

مدير النفوس

ان ... بن ...
لكونه حائز على الجنسية العراقية وسجل في سجل النفوس فقد اعطي له هذا الدفتر في ... سنة ١٩..

| | |
|---|---|
| الاسم والشهرة | |
| تاريخ ومحل الولادة | |
| اسم الأب | |
| اسم الأم | |
| الدين | |
| المهنة وعمل | |
| يقرأ ويكتب | |
| هل متزوج وله زوجة او زوجات | |

الاوصاف الجسمية

| | |
|---|---|
| لون العين | |
| لون الوجه | |
| العلامة الفارقة الثابتة | |

المحل الذي سجل فيه

| | |
|---|---|
| اللواء | |
| القضاء | |
| الناحية | |
| المحلة او القرية | |
| رقم المسكن | |
| نوع المسكن | |

مستەفا بەگی کوردیی شاعیرە . دەشێت بە مەقامیش گوترابێت « ک . ر . م » ) .

5 — سەوزە مەرۆ سەوزەکەی چاووم ... « بەستە » .. ( کاک قەززاز وای ناوهێناوە . کاک ئەبووبەکر دەڵێت : سەوزە مەرۆ سەوزەکە . « تێبینی : هۆنراو دەشێت فۆلکلۆری بێت . مەلا کەریمیش قەوانێکی بەو ناوە دەرکردووە « ک . ر . م » ) .

6 — لەبەر نازی چاو بازان خوردو خەووم خوێناوە بەتیری تیر ئەندازان چیکەم جەرگم برژاوە ... ( کاک ئەبووبەکر وای ناو بردووە : لەبەر نازی چاو بازان . کاک قەززاز ئەم تاکەی هاتەوە بیر کە دەڵێت : بۆچ دەمکوژی خۆ قوربان پردی قیامەت نەپساوە .. زیاتر گوتی : ئەم گۆرانییە لەسەر هەردوو دیوی قەوانەکەدا بوو . « تێبینی : شیعری میرزا عەبدورەحمیی وەفایی شاعیرەو دەشێت بە مەقامیش گوترابێت / ک . ر . م » ) .

7 — دل لە دەردی وەتەن پەست و گیراوە وەک کەوی ناو قەفەس شەوقی نەماوە ... ( کاک قەززاز ناوی نەهێناوە . کاک ئەبووبەکر ناوی هێنا بە : وەک کەوی ناو قەفەس .. « کە ئەمەش شیعری فایەق بێکەسی شاعیرە . هەمان گۆرانیش مەلا کەریم لە قەوان دەری کردووە ، بەلام بە شێوەی سروود نا / ک . ر . م » ) .

8 — لە ناکەس کاریبا خاکم بەسەر رۆیی بەبا عومرم
خودا تۆ بمژێنە تا لەبەر قاپیی کەسێ دەمرم ... ( تەنها کاک ئەبووبەکر ناوی هێناوە بە : لە ناکەس کاریە دەردم . « شعیریش هی مەحویی شاعیرەو دەشبێ بە مەقام خوێندرابێتەوە / ک . ر . م » )

بەهەرجۆرێکیش بتەوێت ، گۆرانییەک لەسەر دوو دیودا بێ و هی‌تر و هی‌تر لەسەریەک دیو ، دەشێت ، یان رەنگبێت کە — 5 — قەوانی هەبوو بێت . بەلام قسەی هەرە راست ئەوکاتەیە کە قەوانەکان دۆزرانەوە !؟ .

● **ژیانی حەمدی ئەفەندی :**

وەک تەسکەرەی نفووسی ژمارە : 1232 / 4 — 5 — 1943 سلیمانیی ، باسی دەگێڕێتەوە ، ناوی : حەمدی افندی ئەمین آغایە . لە ساڵی 1887 ی زایینیدا لە سلێمانیدا هاتووەتە دنیاوە . باوکی ئەمین ئاغایە ( کوڕی حسین ئاغایە لە بنە ماڵەی حاجی ساڵح ئاغا ( نامەکەی کاک ئەبوو بەکر ) . دایکی ناوی : عەطیەیە . موسلمانە . چایچی‌یە . خوێندەوارە . خاوەن خێزانە . ( وەکو خۆم ناسیاویم هەیە ، سێ کوڕی هەیە کە دانیشتووی سلێمانین . نووری خەففاف[17] . جەمال[18] — دوکاندار . لەتیف — ماموستا . ئامینە خانی دایکیشیان پار کۆچی‌کرد / ک . ر . م ) .تەسکەرەی نفووسەکە زیاتر دەڵێت : چاورەشە ، گەنم رەنگە ، خاڵێکی جیوازیی پیوەیە . لە گەرەکی دەرگەزێن خانووی ژمارە 58/74 لە سلێمانیدا دانیشتووەو ( وەکو کەسەکانی دەیگێڕنەوە لە ساڵی 1949 دا کۆچی ماڵئاوایی کردووە و لە گردی سەیواندا نێژراوە . لە لایەکی ترەوە ، ساڵی دنیا دیتن و کۆچ‌کردنی لەسەر بەرگی دەفتەرە شینەکەی نفووسیدا لێکدارەوەتەوە کە 62 ساڵ ژیاوە / ک . ر . م ) .

برای ئیسماعیل و صەبرییەو شوکر و شەوقی‌یە . لە ئیسماعیلی برای عەلی و عوسمان و عومەر و ئەبووبەکر و دوو کچی خەدیجە و فاتیمە ماوون و ئێستا دانیشتووی سلێمانین . لە ئیسماعیلی برایمان بیست کە : بە ویرانی دەنگ خۆشی‌یان بۆ ماوەتەوە ، وەکو ئیسماعیلی برایی و ئەحمەدی حاجی قادری ئاموزایان . جەمالی کوڕیشی هەروەها . ( نامەی کاک ئەبوو بەکر زیاتر دەڵێت .. )



مەریەم خان



یەکەم ئیشی توتن چی بووە . لە پاشدا لەبەر دەرکی سەرا چایخانەی لەگەڵ حاجی ڕەشیدی مەلا ئیبراهیم دانا ، ( کاگ قەززاز هەروەها گوتی کە لەگەڵ حاجی عەوول ناوێك چایخانەی هەبووە / گ . ر . م ) . لە پاشاندا لەبەر حەوزی ناو بازاڕ دووکانی پێڵاو فرۆشتنی دانا هەتا وەفاتی کرد بۆیە ناسرا بە حەمدی ئەفەندی خەففاف . کردەوەکانی زۆر موتەدەیین بوو ، لە خوا ترس ، هەموو ڕۆژی جومعە سەلای جوومعە و تەواشیحی دینی لەسەر منارەی مزگەوتی گەورەدا لە لایەن حەمدی ئەفەنی یەوە بوو . گوتراوە لە هەموو مەولوودێکدا لەگەڵ خوا لێخۆش بوو مامۆستا عەلی کاکە بانگ دەکران . هەردووکیان مەقاماتی عیراقییان دەگوت و لە مەقاماتی عیراقیدا زۆر شارەزا بوون ، تەنانەت لەگەڵ عەلی کاکە[19] لە بەغدادا لەگەڵی شوێنی ناسراودا لەگەڵ پیاوە کۆنەکانی ئەعزمی ییە و کازمی ییە دانیشتوون و مەقاماتی عێراقییان گوتووە .

● **یادگار** :

لەگەڵ بیرەوەریی‌کانی ئەو زاتانەی لێرەدا کەڵکیان لێوەرگیراوە ، بەتایبەت لەمەڕ هونەر و ژیانی ، هەر بیرەوەری و یادگارێکی‌تر بۆ ناسینەوەی هەر لایەنێکی شەخسیەتی حەمدی ئەفەندی کەڵکی تر دەگرێت . لەبەر ئەوە ئەم دوو بیرەوەریی‌یە دەخەینە ڕوو :

1 — ( کاگ جەماڵی کوڕی حەمدی ئەفەندی دەڵێت : ) عومرم چوواردە ساڵان دەبوو کە باوکم مرد و من ئەم باسانەم هەر لە خەیاڵە . باوکم زۆر حەزی بە دۆستایەتی و برادەری دەکرد ، تەنانەت جارێکیان دایکمی لەسەر ڕەفیق و ئەربابی خۆی دەرکرد . جارێکیان باوکم کە زۆر هاوڕێی خاڵم بوو « حاجی ڕەشید ئەحمەد کەریم ـ ڕەشەکوڵی بەققال » دایکمی دەرکردبوو ، ناردبوویەوە بۆماڵی خاڵم کە ئەمە پیشەی بوو . سەیر ئەوەیە کە لە بیریشمان ناچێت ، ئەوا دایکمی دەرکردووەتە ماڵی خاڵم کەچی ئێوارە وەختان خەبەری ناردووە ، دەڵێ : با چێشتێکی باشمان بۆ بکەن . چێشتەش کراو لەوە سەیر تر ، دایکمی نەبردەوە . خۆی زیاد لە پێویست بەلای دیندا بوو ، ئەگەر هەرچی شتێکی بفرۆشتایە بۆ مەولوود گێڕان کە لەگەڵ مامۆستا عەلی کاکەدا دەیگێڕا ، سەری پێوە نەبوو . بەدەگمەن شەوان دەکەوتە ماڵەوە ، هەر لەلای دۆست و برادەر بوو . خەریکی مەولوود گێڕان و بۆ گۆرانیی شەوی ڕۆژ دەکردەوە . زۆریش برادەری بێخودی شاعیر و شێخ محەمەدی مەحویی[20] باشکاتب بوو . ئەوەشم لەبیر ناچێت لە ماڵی خۆماندا قەت گوێمان لە گۆرانی گوتنی نەبووە ! .

2 — ( ڕشتەی مرواری . بەرگی شەشەم . علاء الدين سجادی[21] . بەغدا 1979 باس دەگێڕێتەوە و دەڵێت : ) ... ساڵی ( 1934 ) ە ، ڕابواردنی سولەیمانی جۆرێکی تر بوو . حەمدیەفەنی چایچی ـ خاوەنی قەوانی ئای ئای ـ بڕیاری‌دا پەردە پلاوێك لە ماڵەوە دروست بکا و بۆ نیوە ڕۆژی ئەو ڕۆژە ـ کە ڕۆژی سێ شەنبە بوو ـ بیهێنێتە مزگەوتی حاجی مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسوول . وەستا ئەورەحمانی کەبابچی و وەستا ئەحمەدی حاجی سەیف الله ، دەرویش ئەحمەدی چایچی ، حاجی مەلا عارف بستۆ ، وەستا ساڵحی چایچی ، حاجی عەزیزی تووتنچی ، مەلا حەسەنی شاتری ، دیارە منیش بە شوێنیانەوە ( واتە مامۆستا سجاددی / گ . ر . م ) . نوێژی نیوەڕۆکرا ، حەمدیەفەنی ماڵەکەیان نزیك بوو لە مزگەوتەکەوە ، دوو سێ جار هاتو چۆی ماڵەوەی کرد وە ر جار کە دەهاتەوە ڕەنگی زیاتر تێك دەچوو ! . حەمدیەف ی خۆی لە خۆیدا تووڕە بوو . لەو هاتو چووەشدا ئەوەندەی تر ئاگری گرتبوو ، لە ئێمە

وایە پەردە پڵاوەکە ڕێگ نەکەوتووە و لە شەرمەزاریدا تووڕە بووە ، ئێمە هەموو هەستمان پێکرد . مامۆستا مەلا مستەفا هاتە قسەو ووتی : حەمدیەفەنی ! هیچ تووڕەیی و شەرمەزاریی ناوێ . ئێمە هەموو براین و خێزانی ماڵێکین ، خۆ غەریب نین ، دوور نی یە لە ماڵەوە ئیشیان هەبوو بێ بۆ یان ڕێگ نەکەوتبێ نان دروستکەن . ئێستا دەنێرینە بازاڕ لە کەبابە نایابەکەی وەستا ئەورەحمانمان بۆ دێنن و نان دەخۆین ، ئیتر بۆچی خۆت سەغڵەت دەکەی ؟ حەمدیەفەنی ئیتر خۆی نەگرت . وتی : مەلا مستەفا ئەوە تۆ دەڵێی چی ؟ نانی چی و شتی چی ؟!. من ئەوا چەند ساڵ و عەیام و زەمانە ئیمڕۆ هەوەستم هەستاوە لەو قەحبە بابەی ژنم ، هەر کە دەچمەوە بە پەلە سەیر دەکەم سێ چووار دیڵە قوڕ لە ژوورەکەدان . دەبیەمە ژوورێکی تر ئەو خراپتر . ماڵەکەمان ئیمڕۆ بووە بە نێرگەلەکەی سەی ئەحمەدی بابە ڕەسووڵەوە . نازانم ئەم هەموو ژنە چی‌یە ئیمڕۆ ڕوویان کردۆتە ماڵی ئێمە ؛ منیش دەبێ بۆ خۆ ) سەبر بکەم تا ساڵێکی تر ئەم وەختە !!. لە پاشا پەردە پڵاویان هێنا بەلام چ پەردە پڵاوێك ؟ پەردە پڵاوێکی شیرداخی بەڕۆنی زەنگ و برنجی بساکان و دەست و پەنجەی ئەجەخان لێنرا بێ . دەبێ چ پەردە پڵاوێک بووبێ ؟. ئای حەو جار سڵاو ڕۆنە زەنگەکەی ئەو ڕۆژە !.

● **دووا قسە** :

کردەوەی حەمدی ئەفەندی ـ ئەگەر یەکەم کەس بووبێت ؟ ـ بۆ خۆی چاك و جووان و بەکەڵك بووە ، چونکە لەگەڵ داهاتنی گرامەفۆن و قەوان لە عیراقدا و بەتایبەت لە ناوکورددا ، باو باوی گۆرانیی تورکیی[22] بووە کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تەشەنە و جێگیریی ڕۆشنبییریی بێگانە . لە لایەکی ترەوە بڵاوبوونەوەی گۆرانیی یەکەم لەسەر قەوان ـ گۆرانیی کوردیی ـ جووڵەیەکی شارستاینی بەخەڵك خستووە ، جگە لەوەش هاندانێ بووە کە کەسانی تر بێنە پێشەوە و گۆرانی لەسەر قەوان تۆمار بکەن . ناشبێت ئەو لایەنەش فەرامۆش بکرێت کە گێڕانەوەی شیعری شاعیران ، لە لایەك ڕەواجدان بووە بە شیعر و ئەمجا بە ناسینی شاعیر . دووا جار ئەو کردەوەیەی وەکو تەجرەبەیەکی یەکەم ، چەند پچووکیش بووبێت لە هەموو سەرێکەوە شایانی ڕێزە و خۆیشی بەڕەحمەت بێ !



△ وێنەی گۆرانی بێژی کورد ـ مەلا کەریم ـ کە لە دووا لاپەڕەی وەگێڕانە کوردی‌یەکەی ئەم کتێبەدا بوو !

The kurdish Republic OF 1946

William Eagleton jr .

OXFord University press . 1963 .

ئەم وێنەیەش کاك کەمال فەرەج تۆفیق نیشانی داین و ئێمەش لە بەرمان گرتووەتەوە . سوپاسی دەکەین . شایانی گوتنە ئەو کتێبە لە لایەن سید محمد صمدەوە لە ئینگلیزی‌یەوە کراوە بە کوردی و لە کوردوستانی ئێراندا بڵاوکراوەتەوە .

## پەراوێزەکان

(1) BAIDAPHON لە عێراقدا لەوەپێش بە « دەنگی خاتوون » یش ناسرابوو ، کە کومپانیایەکی بازرگانی بووەو لە ساڵی 1897 دا گرامەفۆنی بە نیشانەی « سەگێ گوێ لە خاتوون دەگرێت » ، داهێنا . بە قسەی کاك قەززاز کە جارێکی تر ئەم باسەم لەگەڵ کردەوە ، پاش تۆمارکردنی دەنگ ، بە دەزگای ناسراو بە « ئەبو بوریی » ، دەنگەکە نێردراوە بۆ ئەڵەمانیا و لەوێ قەوان چاپکراوە . بۆ نموونەش قەوانێکی محەممەد ئەمین کە باسی دێت ، لە لای هەمان کومپانیای قەوان لەسەری نووسراوە : لە ئەڵەمانیا چاپکراوە . دیارە کومپانیاکەش ئەڵەمانی بووە .

[2] ژن برای حەمدی ئەفەندی کە ناوی هات و هاورێیشی بووە ،

له ساڵی 1969 دا بۆی گێڕامەوە کە ئەو لەگەڵی چووە بۆ بەغدا . موخابن ئەو پیاوە مرد و ڕێک نەکەوتەوە قسەکانی تۆمار بکەم .

[ 3 ] ئەم دوو کەسە لە دەورو بەری 1932 — 1933 دا وەکیل ـ ی کومپانیای قەوان بوون . ( بڕووانە گوتارمان : وێنەی کاروانی هونەری مەلا کەریم / هاوکاری ـ ژ : 490 . 3 — 9 — 1979 ) . قادرئاغاش ، دوایی ، هەتا پێش مردنی خاوەنی کتێبخانە بوو .

[ 4 ] ئەم گفتارانەی کاك ع . قەززاز بەچەند جارێ وەرگیراوە کە بەشێکی لە 2 / 7 / 1982 دا بووە .

[ 5 ] مامۆستا ع . مەردان هەتا مابوو ، چەندەها جار قسەی وای دەکرد ، بەلام ئەم باسە ، لەلای من ئەو کاتە یەکلایی دەبێتەوە کە هەرچی قەوانە کۆنەکان هەیە بدۆزرێنەوە .

[ 6 ] ئە : ـ مامۆستا ع . مەردان لە 13 — 7 — 1979 دا باسی بۆ کردووم ، دەڵێت : محەممەد ئەمین هاوڕێم بوو . خەڵکی هەفتەغار بوو . ئەو کاتە چایخانەی هەبوو لە ناو دارتاشەکانی کەرکووکدا . ئەو کاتە لاو بوو . من وەکو بزانم هەر ئەو « 2 » قەوانەی هەبووە . حەمەمین کۆتەرە ملیشی ناو دەبراو وەچەیشی هەیە و بزانم کوڕێکی لە بەغدایە . خۆی مردووە . ( بنوارە گوتارمان : کۆمەڵی .. قەوانی بەنرخ / هاوکاری ـ ژ 497 « 22 — 10 — 1979 » ) .

بێ : لەلای ٢ کومپانیا 2 قەوانی هەیە . بەم جۆرە :
کۆمپانیای : بەیزافۆن BAIDAPHON .
دیوی یەکەم : ئەی خودای ـ قەتار ـ ژمارە : B 090 131
دیوی دووەم . سیدارە ـ بەستە ـ ژمارە : B 090 132
تێدا دەڵێت : ئەو چاوە جوانەی خوا بەتۆی داوە ...
کومپانیای کۆلومبیا Columbia.
دیوی یەکەم : ... ـ مەقام ـ ژمارە : C . O . F 174 / GIA 44
( لەبەر کۆنی هیچمان پێنەنووسراوەتەوە بەلام تورکمانی و کوردی یە ) . دیوی دووەم : پاشا بارانی ـ بەستە ـ ژمارە : C . O . F 175 / GIA . 44 ( لەبەر کۆنی هیچمان پێنەنووسراوەتەوە ، بەلام کوردییە ) . لێرەدا بشنووارە پەراوێزی : ژ ـ 12 ) .

[ 7 ] مامۆستا ع . مەردان ، باسی کرد و گوتی : لەگەڵ من قەوانی خوێندووە . ( = دەری کردووە / ك . ر . م ) . خەڵکی سابلاخ بوو . لە بەغدا قۆندەرچی بوو . لاوێک بوو گاڵتە نەبوو . جوانی دەخوێند . هاوڕێی برام بوو . عەمری خوای کرد . برای هەبوو . زۆر درەنگ دووای دە پاز دە ساڵ بە مردنیم زانیوە . ( بڕوانە گوتارمان : هاوکاری . ژ : 497 ) . حەمە سەعید ناوی تەواوی و گۆرانیی دیاری بەم جۆرەیە : مەولوود زادە موحەممەد سەعید ـ لەلای قەوانی کۆمپانیای : ئۆدیۆن ODEON ی ئەڵەمانی . دیوی یەکەم : « بەستەیەکی کوردی یە و لەبەر کۆنی لە ووشەکانی تێنەگەیشتووین ، بەلام ئاوازەکەی هەمان ئاوازە کە محەممەدی مامڵێ + تەنیا عارەب ، گۆرانیی : شمشاڵی شوان ـ یان گوتووە » . ژمارەی : XES 557 / 35496 دیوی دووەم : « مەقامێکە ، لە کوردی ناچێت » ژمارەکەی : XES 578 / ئەو ژمارەی تری دیار نی یە .

[ 8 ] دایکی جەمال ـ یان ـ شیرین خانم = بەهیجە ئیبراهیم یەعقووب 1908 ؟ ـ 1979 ز ـ لە مەدینە طوببی بەغدا مردووەو شوێن هاتنە دنیایشی نازانرێت . « ئەو موسڵمان » بووە . لە ساڵی 1966 وە هەتا ساڵی مردنی بە دوویدا گەڕاین و لە 9 — 12 — 1975 دا لە سلێمانی ـ گەڕەکی کانێسکان ، ژمارەی خانوو : ق / 42 / أ / 10 دۆزیمانەوە دانیشتن و دەمەودوومان بوو ـ لە (1) گۆرانیی دیاریشەوە (13) گۆرانیمان دۆزی یەوە . ئەوە جگە لە لێکۆڵینەوە لە گۆرانی یەکانی بە شێوەی پرس و ڕا و ـ بیستن ـ و بلاوکردنەوەی وێنەیشی . گۆرانی یەکانی بەستە و سروودن ، هۆنراوی فۆلکلۆری و شیعری شاعیرانی ناسراوی گوتووە . هەموویشی لەلای دوو کومپانیای قەوانی : بەیزافۆن + ئۆدیۆن . ( بۆناسینی بنوارە گوتارەکانمان : هاوکاری ـ ژ : 306 — 27 / 2 / 1976 + ژ ـ 509 : 14 / 1 / 1980 ژ ـ 510 : 21 / 1 / 1980 .

[ 9 ] مەلا کەریم ، ملا کریم افندي = مەلا کەریم ئەحمەد . لە 1885 ز ـ دا لە سابلاخ ـ مەهاباد ـ لە دایك بووە . لە 1901 ز ـ دا «؟» هاتووەتە سلێمانی ( ژین : ژ . 52 — 6 / 1 / 1972 : کەمال فەرەج تۆفیق ) .. لە پێش 12

حوزەیرانی 1938 ی دا لە سلێمانیدا مردووە (گ . ر . م ... بنوارە : زبان ـ ژ . 34 . ساڵی 1 . یەگ شەممە 12 ی حوزەیران / 1938 ) . دووا کاری ناتریی حەمام بووە . لە ساڵی 1966 دا «2» گۆرانیی لەلای رادیۆی کوردیی بەغدا بوو . لەو هەلەوە کەوتینە سۆراخی گۆرانییەکانی . هەر لە نێوەڕاستی ئەو ساڵەدا لە قەوانێکی دۆستێکمانەوە «2» گۆرانیی ترمان دۆزییەوە و لەو رادیۆوە بڵاوبان کردەوە و هەتا نێوەندی ساڵی 1979 توانیمان بە هاریکاریی دۆستەکانی گۆراینی کۆن «12» قەوان بدۆزینەوە کە «24» گۆرانییە بە بەستە و مەقام و سروودەوە . هۆنراوی فۆلکلۆرو شعیری شاعیرانی ناسراوی وەگ عەبدوڵلابەگی میسباحوددیوان ، وەفایی ، پیرەمێرد ، بێکەس ـ ی گوتووە . قەوانەکانیش هی «3» کومپانیا بوون : 1 ـ ئۆدیۆن 2 ـ بەیزافۆن 3 ـ ئەبو کەلب = هس ماستەرس ڤۆیس HIS MASTERS VOICE ـ ی ئینگلیزی . ( بۆ ناسینی ژیان و هونەر و گۆرانییەکانی مەلا کەریم .. بنوارە کۆمەڵە گوتارمان : ـ هاوکاری : ژ . 478 + 490 + 494 + 496 + 498 ) .

[10] هێشتا ژیان و یادگارەکانی غەفوور ئاغامان بۆ ساغ نەبووەتەوە بەڵام پاش پرسین ، بیستوومانە کە کوردی لای خۆشناوەتی بووە . وەچەی لە شاری هەولێردا دەژین . ئەمیش چەند قەوانێکی دەرکردووە ، وەکو قەوانێکی کومپانیای ئۆدیۆن و بەم جۆرە :

دیوی یەکەم : بەستەی «ئامین ئامین» ژمارەی : LA 220556 a / E5878 . دیوی دووەم : بەستەی «بارانە» ژمارەی : LA 220556 b / E5879 .

[11] ئەم گۆرانییەی مامۆستا ع . مەردان ، لەنێو قەوانی کۆندا ، یان لە لای رادیۆ ، یان لە لای خۆی نەماندیوە و نەمانبیستووە . بەڵام دەرکەوتنی بە ناویش بێت ، نرخێکی زۆری هەیە .

[12] ئە : دەرکەوتنی ئەم گۆرانییەی حەمەمین گەرمیانیش دیسان بەنرخە کە خۆیشمان نە قەوانەکەمان دیوەو نە بیستووشمانە .

بێ : شەیتان بێزی = بێجی رەنگ .

[13] وەکو تەماشای ئەم رۆژگارە کۆنە بکرێت ، کە گرامەفۆن بە ئەنتیکە و تەنانەت بە ـ حەرام ـ بزانرێت ، هەڵبەت گۆرانی بێژیش حاڵی خۆش نەبووەو زۆر جوان تەماشا نەکراوە . بۆیەکە ڕێی تێدەچێت حەمدی ئەفەندیی پیاوی نێو پیاوانی ئایین و ناسراو ، لە قەوان دەرکردن کەوتبێت .

[14] لەسەر داوای خۆم کاگ ئەبووبەکر ئیسماعیلی برازای ، لە پاییزی 1978 دا نامەیەکی لە بارەیەوە بۆ ناردم کە باسەکانی ئەم گوتارەی تێدایە و داواکەیشم لە زووەکەوە بوو .

[15] نامەی کاگ فوئاد ڕەسووڵ لە 16 / 2 / 1979 دا لە هەولێرەوە بۆ من هاتووە کە چەند پچووکە باسی گۆرانیی کۆنی تێدا بوو .

[16] نیشانە کردنی دەنگی حەمدی ئەفەندی بەڵگەیەکی باشە و TENOR «تێنۆر» یش جۆرە چینێکی دەنگی پیاوە کە سیفەتی تیژیی هەیە و دوو جۆریشی هەیە : TENOR I و TENOR II

[17] ئەم تەسکەرەی نفووسی باوکی داینێ کە لێرەدا وێنەی پێشان درا . یادگارێکی باوکیشی بۆ نەگێڕاینەوە .

[18] ئەم لە 2 / 7 / 1982 دا ئەو بیرەوەرییەی لەمەڕ باوکیی گێڕایەوە و وێنەی باوکیشی داینێ کە لەبەرمان گرتووەتەوە و لێرەدا نیشان دراوە کە هەر ئەم وێنەیەیشی هەیە .

[19] ناوی عەلی کاکە و هونەری عەلی کاکە لە هەندێ خەڵکم بیستووە ، وەکو ڕەفیق چالاکی هونەرمەندیش ، بەڵام وەکو بزانم تا ئێستا کەسێ لێی نەکۆڵیوەتەوە . ڕۆژی 12 / 1 / 1983 لە ڕایەڵەی قسە و باسێکدا لەگەڵ د . عیززەددین ( حاجی مەلا مستەفا حاجی مەلا ڕسووڵ ) ، دیسان ناوی عەلی کاکە هاتەوە مەیدان و ئەویش گوتی کە : «عەلی کاکە ئەمینی ناوە و لە دەرچووەکانی کۆلیجی ئەسکەریی ئەستەنبووڵ بووە و لە سلێمانیدا مامۆستای قوتانجانەی پێش ـ فەیصەلییە ـ بووە» . ئەمە لە لایەگ لە لایەکی ترەوە ڕەفیق چالاگ جارێکیان بۆی گێڕامەوە کە ئەو عەلیکاکەیە ، یەکەم باندی مووسیقەی لە سلێمایندا دامەزراندووە !؟ هیوادارین هەر کەسێگ چ یادگارێکی لەمەڕ ئەو زاتە هەیە ، بەڕاستیی بینووسێتەوە و بڵاوی بکاتەوە .

[20] چەند دۆستێک ، هەروەها کوڕی خوا لێخۆش بوو ، شێخ محەممەدی مەحوی ، ئاگادارن کە هەتا ئەوزاتە مابوو ، چەند جار چوومە خزمەتی بۆ تۆمارکردنی یادگار و هەر بیرەوەرییەکی . موخابن هەر ڕێگ نەکەوت و لە سالی 1982 دا کۆچیکرد .

[21] ئە : مامۆستای دلسۆز زانا علاء الدین سجادی کە لە مەیدانی بیرەوەری کۆکردنەوەدا شوێنی ڕووناکی دیارە ، ئەو تکایەی لێدەکرێت کە بەرانبەر ئەم جۆرە پیاوانە بە دوور و درێژی ، بیرەوەریی خۆی بنووسێتەوە .

بێ : لەوانەیە یەکێ بلێت : ئەم بیرەوەرییە لەمەڕ حەمدی ئەفەندی پێویست نەبوو . بەلام ئێمە کە لە گەل هەموو زنجیرەکانی ـ ڕشتەی مرواری ـ یشداین ، وا بیر دەکەینەوە کە لە مەیدانی لێکۆلینەوەی زانستانە بۆ ناسینی شەخسییەتی خەلکی ناسراوی مەیدانەکانی سیاسەت و ئەدەب و هونەردا ، تا ئەم کاتە ناتەواو کۆلیومانەتەوە ، چونکە ئەوەندە هەلەین بەیەگ چاو تەماشای یەگ ڕووی باشی یان خراپیی ئەو کەسە دەکەین و لەوەشدا هەر ڕاستگۆ نین ، چونکە هەرگیز بیرمان لە هەست و ئەتوار و سیفەتەکانی ئەو کەسە نەکردووەتەوە کە کار لە کردەوەکانی دەکات . وولاتانی پێشکەوتوو ، بۆ پێشکەوتن ، چونکە بۆ بیانووی هیچ و پووچ ، ڕاستی لە مێژوو ناشارنەوە .. کەی بێت ئێمەش ڕاستگۆ بین ؟ .

[22] ئەوی دەوری مێژوو بکاتەوە ، دەزانێت کە دەولەتی عوسمانلی ، ڕۆشنبیریی خۆی ، وەکو ڕوویەکی خۆی بەسەر ئەم ناوچەیەدا سەپاندبوو ، هەتا ڕۆژنامە کۆنەکانیش بەزمانی ئەویش نوسراونەتەوە . لەلایەکی ترەوە ، نەگ هەر گۆرانیی تورکیی باو بوو ، بەلکو بەهۆی پەیوەندیی دەولەتی عوسمانلیی بە ئەلەمانیاوە ـ کە هەردووکیان لە جەنگی جیهانگیریی یەکەمدا هاوکار بوون ـ کارێکی وایکرد کە بازرگانیی ئەلەمانیی ، لەوانەش هاتنی گرامەفۆن وقەوان ، بێتە ئەم ناوچەیەوە . بۆ نموونە یەکەم کۆمپانییای قەوان : ئۆدیۆن ـ ی ئەلەمانیی پێش جەنگی جیهانگیریی یەکەم پەیدابووە و بە هۆیشییەوە ماوەیەگ سەری نایەوە ! لەبیسەتەکاندا سەری هەلدایەوە .

گۆرانی مندالان بەشێکە لە هونەری مۆسیقاو گۆرانیو ، شوێنی تایبەتی خۆی هەیە لە بواری پەروەردەی مۆسیقادا بۆ ڕاهێنانی هەستو گوێی مندال بەشێوەیەکی ڕێکو پێکو لەسەر بناغەیەکی زانیاری ڕاستو دورست ، چونکە ئێستا لە دەولەتە پێشکەوتووەکاندا پەروەردەی مۆسیقا شان بەشانی زانینەکانیتر دەڕواو بایەخی پێدەدرێ .. هەر لە باخچەی ساوایانەوە تاوەکو پلە هەرە بەرزەکانی ئەکادیمیا .

گۆرانیو سروود دەورێکی بالایان هەیە لە پەروەردەی مۆسیقادا جا چ لە قوتابخانەکانی سەرەتاییدا بێ وەیا لە قۆناغەکانیتری فێرکردندا ، چونکە لەم ڕێگایەوە مندال فێری چۆنیەتی پشوو خواردنەوەو دەرهێنانی دەنگ دەبێ بەڕێگایەکی ڕاست ..

ئەوەی شایانی باسە مامۆستا ، یا ئەم هونەرکارانە دەتوانن لە ڕێگای گۆرانیو سروود گەلێك زانیاری بەهۆی دەقی ئەدەبیەوە بەمنال بگەیێنن وەکو دەوری ئایینی ، دەوری نەتەوایەتی ، دەوری خوو ڕەوشت «اخلاق» ، دەوری بەزمو خۆشی «ترفیە» ، دەوری هەلچوون «انفعالي» .

هەروەك مێژوونووسی (بلوتارك) لەووتەیەکیدا لەبارەی گرنگی مۆسیقاو کاکردنە سەر مندالدا ڕوونی دەکاتەوەو دەلێ «ئەو مندالەی بە دیراسەتی مۆسیقا لۆوپۆپ دەردەکاو ڕەگی لاویەتی لە ژیاندا بە پەروەردەی مۆسیقا دەچەسپێنێ .. ئەوە بێگومان لەدوا ڕۆژدا لاوچاکو دل پاك دەبێو لە هەموو کارێکی نارەواش بە دوور دەبێ» .

جا لێرەدا ئەو هونەرکارانەی کە خزمەتی هونەری کوردییان خستۆتە ئەستۆی خۆیانەوە ئەوەدەبێ بێ سێو دوو هەریەکەیان لە شوێنی خۆیەوەو بە پێی توانا هەولو تەقەللا بدەن ، لە پێناوی گەشاندنەوەو بەرەو پێش بردنی هونەری گۆرانیو مۆسیقای کوردی ..

وەبەتایبەتی دەبێ گۆرانی مندالان فەرامۆش نەکەن ، چونکە مندالی کوردیش هەروەکو مندالی میللەتانیتر پێویستی بە ئاگاداری هەیە بەتایبەتی لەم لایەنەوە ـ واتە لایەنی هونەری ـ چونکە تاکو ئێستا لە کوردوستاندا تەنیا چەند تیپێك یا ئاشکراتر بلێین چەند هونەرمەندێك ـ ئەویش لەم دواییەدا ـ تاکە تاکە گۆرانییان بۆ مندالان داناوە ، بەلام

# منداڵ و گۆرانی

دیسان ئەم لایەنی هونەرییە هەر زۆر هەژارو دەست کورتەو جێگای خۆی لە دڵی منداڵانی کورد نەکردۆتەوەو ، بەڵکو هەر تەنها بریتییە لەچەند گۆرانی و ئۆپەرێتێك کە لە تەلەفزیۆنی «تأمیم»دا بلاو دەکرێنەوە ..

جا هەربۆیە دەڵێم بەر لە هەموو شتێك دانەری گۆرانی دەبێ ئەوە چاك بزانێ کەوا گۆرانی یا سروود بەشێوەیەکی گشتی لەم توخمە بنەڕەتییانە پێك دێ :

1 - دەقی ئەدەبی .

2 - ریتم (ایقاع) .

3 - ئاواز (لحن) .

منیش بەش بەباری خۆم هیوادارم لەم نووسینەمدا بتوانم چەند سەرنجێك بخەمە ڕوو کە پێویستە لەکاتی دانانی گۆرانی و موسیقا بۆ منداڵانی کورد ڕەچاو بکرێ ، وەبۆ زیاتر شارەزا بوونیش وا توخمە بنەرەتیەکان یەکە یەکە شی دەکەمەوە بەمەبەستی ئەوەی باسەکەم زیاتر سوود بەخش بێت و لەم بوارەدا کەلەبەرێك بگرێت :

**1 - دەقی ئەدەبی :**

شیعر کە بۆ منداڵ دادەنرێ دەبێ بریتی بێ لەچەند ووشەو ڕستەیەکی سادە کە لە گەڵ ئاسۆی بیرکردنەوەی منداڵەکەدا بگونجێ و دووربێ لە شتی پڕ لە گرێ و ئاڵۆزو تێکەڵاو ، بۆ نموونە گەر بمانەوێ لە بارەی نیشتمانەوە بنووسین ، پێشەکی لەسەر ئەم ووشانەی ڕادەهێنین «دایك ، باوك ، خانوو ، درەخت ، تۆپ قوتابخانە هتد» کە ئەمانە هەمووی بەلای منداڵەوە مانای نیشتمان دەگەیێنن ، ئەویش لەبەر ئەوەی تەعامولی ڕۆژانەی لەگەڵیاندا هەیەو بەلای ئەوەوە ئەوان کۆمەڵ و خاك و نیشتمانی ئەون .. هەروەها دەبێ دەقە ئەدەبییەکە لەگەڵ تەمەنی منداڵەکەدا بگونجێ نەك منداڵێکی جوان و بچکۆلانە هەر لەسەرەتای ژیانیەوە بۆ یارو شەمامەو چاوی جوان و پرچی درێژ گۆرانی بڵێ - هەروەك لە ئێستکەو تەلەفزیۆندا هەستی پێدەکرێ و دەبینرێ ، مەبەستیشم ئەوە نییە دیوانێکی گەورەو گرانی شیعر بۆ گۆرانی منداڵان دابنرێ ، تەنانەت نووسینەکە با لەشێوەی شیعریش نەبێ بەڵکو بریتی بێ لە چەند ووشەیەکی سووك کە کار لە ناخی منداڵەکە بکات و زیاتر لەگەڵیدا تێکەڵاو بێت و سەرنجی ڕابکێشێ هەروەك چۆن «افلاطون» دەڵێ ! «ئەو زمانەی کە منداڵ پێی دەدوێ هەر ئەویشە گۆرانی پێ دەڵێ .» .

**2 - ئاواز Melodg :**

ئەو ئاوازانەی کە هەڵدەبژێردرێن بۆ منداڵ هەمیسان دەبێ ساکارو بریتی بن لە چەند ڕستەیەکی پڕ مۆسیقاو کورت کورت و دووبارە کراوەو دووربن لە بازدان بەسەر نۆتەکان و (گۆڕینی مەقام)[1] و (کرۆماتیکەوە)[2] چونکە منداڵ ناتوانێ شتی قورس بڵێ .. هەرچەندە زۆر لە ئاواز دانەرەکان ئاوازی ئاڵۆز ئاڵۆز دادەنێن و تەنانەت منداڵەکەش ناچار دەکەن کە بەزۆر بیڵێ و لە ئەنجامیشدا گۆرانییەکە ناتەواو کرچ وکاڵ دەردەچێ و هەتا هەستی گوێ گریش ناجووڵێنێ ..

هەربۆیەش گرنگترین خاڵ لەم ڕووەوە ئەوەیە کە دەبێ ئاواز دانەر شارەزاییەکی چاکی لە مۆسیقاو پلەکانی دەنگ هەبێ ، چونکە جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان پلەی دەنگی منداڵاندا هەیە ، وەبەپێی تەمەنیش منداڵانی باخچەی ساوایان ، ئەوانەی کەتەمەنیان لەنێوان «4 تا 6» ساڵە ناسك و باریکترە لەو منداڵانەی کە تەمەنیان «6 تا 7» ساڵە ، وەئەوانەی کە تەمەنیان «8 تا 12» ساڵە دەبنە خاوەنی بەهرەو دەنگێکی چاکترو ڕێك و پێکترو بەسۆزتر .

دوای ئەو تەمەنەیش ئیتر کە پێ دەنێتە قۆناغی هەرزەکارییەوە ، دەنگە بەسۆزو ناسکەکەی دەگۆڕێ و بەرەبەرە گڕ دەبێ ..

جا لێرەدا ئەو ئاواز دانەرەی کە فێرکردنی گۆرانی یا سروودی منداڵان دەگرێتە ئەستۆ دەبێ لە پلەکانی ناسك و گڕ دوور بکەوێتەوە بەڵکو دەبێ هەموو مەشق و ڕاهێنانەکانی تەرکیز بکاتەسەر پلەی ناوەندی ، هەروەك زۆر جار گوێمان لە ئاوازێك دەبێ کە لەسەر پلەیەکی دەنگی بەرز دانراوە گوایە هی منداڵەو منداڵیش هەر لەخۆیەوە دەنگی ناسکە «سوپرانۆ»[3] یە ئیتر ئەوە وا لەمنداڵەکە دەکا کە بقیژێنێ ئەمەش دەبێتە هۆی نەمانی تام و چێژی گۆرانیەکە .

● **چۆنیەتی دەست نیشان کردنی پلەی دەنگی منداڵان :**

یەکەمین ئەرکی مامۆستای مۆسیقا ئەوەیە کە شارەزایی لە پلەو مەودای دەنگی منداڵدا هەبێ بەتایبەتی کە لە گەڵیاندا کار دەکا تاوەکو بتوانێ باشترین ئاواز هەڵبژێرێ بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگەکانیاندا بگونجێ ..

زاناكانى مۆسيقاش بۆ دۆزينەوەى باشترين ريگاو بۆ دەستنيشان كردنى پلەى دەنگ زۆر ليكۆلينەوەو تاقى كردنەوە يان كردوە ، بۆ نموونە فرۆشلزى زانا لە تاقى كردنەوەكەيدا بەم جۆرە بۆى دەچيت :

أ - «فرۆشلز» : هەستاوە يەكە يەكە داواى لەو مندالانە كردووە كە تاقى كردنەوەى بەسەرياندا كردووە كە «سكێل»[*] پەيژەى «دۆ» بەسەركەوتن و دابەزين بلێنەوە ، ئەمەش دواى ئەوەى مندالەكان بەكردەوە گوێيان لە دەنگى «دۆ» بووە ، جا چ لە ريگەى «چەنگالى لەراوە»[*] وە يا هەر ئامرازێكى مۆسيقا وەيا «فرۆشلز» خۆى بوويێت ..

ب - گەر مندالێكيش تواناى ئەوەى نەبوايە سكێلەكە بلێ ، جا چ لەبەر ئەوەى بەتەواوى راهێنانى لەسەر نەكردووە وەيا كەموو كورتى‌يەك لە دەنگەكەيدا هەبووە ، ئەوە داواى لەمندالەكە كردووە بە ئارەزووى خۆى ئەوگۆرانى‌يە بلێ كە دەيزانێ ..

ج - ئەگەر ئەم هەولدانەيشى سەرى نەگرتايە ئەوە داواى لێ كردوون كە گوێ لەمندالێكى هاوتەمەنيان بگرن و لاسايى بكەنەوە چونكە مندال بەئاسانى دەتوانێ لاسايى دەنگى مندالێكى‌تر بكاتەوە كە هاوتەمەنيەتى ..

لە ئەنجامى ئەم تاقى كردنەوانەو دواى چەندەها ريگاى تر توانرا مەوداى دەنگى مندالان بدۆزرێتەوە كەئەويش فراوانتر دەبێ بەپێى زياد بوونى تەمەن تاوەكو «دوا قۆناغى منداليەتى» «الطفولة المتأخرة» ، كەتيايدا دەنگ دەگۆرێ ، دواى ئەوەى مندالان دەگەنە تەمەنێك كە بەقۆناغى «بلوغ» دەناسرێ . بەنيسبەت كورو كچەوە ..

بەشێوەيەكى گشتى دەتوانين بلێين مندالانى باخچەى ساوايان كە تەمەنيان لە [4 تا 6] سالە ، مەوداى دەنگيان لە نێوان «رێ تالا» يە وەك (فرۆشلز) و (نبتل) لە «انگلترا» لە تاقى كردنەوەكانياندا بۆيان دەركەوتووە . بەلام مەوداى پلەى «سى - رێ» بە مەودايێكى گونجاو دادەنێن بۆ مندالانى مام ناوەندى - لەتواناى دەنگ - كە دەتوانن بە ئاسانى لەم مەوايەدا گۆرانى بلێن ، بەتايبەتى لەپۆلى يەكەمەوە تاوەكو چوارەمى سەرەتايى ، بەلام ئەم مەودايە دەگۆرێ بەگوێرەى پۆلى پێنجەم و شەشەمەوە ..

● چينە ناوەندى‌يەكانى دەنگ ●

مندال : لە «3 — 4» سال لە «رێ - لا»
لە «4 — 5» سال لە «رێ - سى»
كچ : لە «5 — 13» سال لە «مى - دۆ»
كور : لە «5 — 13» سال لە «دۆ - لا»

3 - ريتم «ايقاع» Rythm

ريتم واتە پەيوەندى نێوان دەنگەكان لەبارەى بەردەوام بوونيان لەكاتدا چ زۆر چ كەم ، ئەو باسانەى كە لەمەيدانى سايكۆلۆژيەتى مندالاندا كراون بەچاكى ئەوەيان روون كردۆتەوە كە مۆسيقا گرنگترين هونەرە كارلە مندال دەكا هەر لە سەرەتاى تەمەنى منداليەوە ، وەلە تاقى‌كردنەوەكانيشدا دەركەوتووە كە توخمى ريتم بەرلە توخمى ئاواز سەرنجى مندال رادەكێشێ . ريتمى گۆرانى شان بە شانى دەقى نووسراوەكە «دەقە ئەدەبيەكە» دەروا ، جا گەر هاتوو دەقى گۆرانى‌يەكە سووك و ساكار بوو ئەوە ريتمەكەش ساكار دەبێ و پێچەوانەش بۆ ئەم مەبەستە راستە .. لێرەدا دەبێ تا لە تواناداهەيە ريتمى گۆرانى مندالان شێوەيەكى ساكارو سادەى بدەنێ و پێويستە لە دابركردنى ووشەكان ئاگاداربين لەكاتى ئاواز داناندا و لايەنى جوانى مۆسيقاى تيادا دەربخەين ، ئەويش كە ووشەيەكمان دابركرد ، دەبێ بيكەين بەدوو بەشى يەكسان لەبارەى كاتەوە ، بۆ نموونە : ووشەى (باوكە) دابر كردنەكەى بەم جۆرە دەبێ (باو - كە) .

4 - لايەنى سايكۆلۆژى :

چەند قۆناغێك لەم بارەيەوە بەسەر مندالدا رەت دەبێت بەگوێرەى تەمەن ، وەهەريەكە لەم قۆناغانە (خاسيەتى) تايبەتى خۆى هەيە لەبارەى خوو رەوشتەوە ، كە مندال لەگەليا دەژى و كارى‌تێ دەكا ، قۆناغى يەكەم لە «4 — 7» سال مندال لەم قۆناغەدا حەز لە يارى كردن دەكات ، جا پێويستە گۆرانيەكانى ئەم قۆناغە تەعبيرلە يارى و شێوەى يارى كردنەوە بكەن .. «أميل جاك دالكرۆز»ى سويسرى دەستێكى بالاى هەبووە لەوەى كە مندالان فێرى مۆسيقا بكات بەشێوەى يارى‌كردنەوە ، وەريگاكەى بەناوى (ريتمەكانى دالكرۆز) دەناسرێ .

ئەو يارى‌يانەى كە فێرى مندال دەكرێن دەبێ پربن لە جوولانەوەو خۆشى و بەختەوەرى بۆ ئەوەى لەگەل ئاستى بيرو ئاسۆى عەقلى مندالەكەدا بگونجێن ، ئەوانيش بە پێى

ئامانجەکانیان دەکرێن بەچەند بەشەوە :
1 - یاری خەیاڵی و دەربڕین :
ئەم یارییانەی وا لە منداڵ دەکا کە شارەزاییەك لە بارەی مۆسیقاوە پەیدا بکاو هانی دەدا بۆ دەربڕینی بیروڕای لەم ئاستەوە بەشێوەی جووڵانەوەیەکی تەمسیلی و دەربڕین لەرێگەی هەموو ئەندامەکانی لەشیەوە .. ئەوەی شکرایە منداڵ لە تەمەنی (5—7) ساڵی ئارەزووی نواندن و لاسایی کردنەوە دەکات ..
ب - یاری لە شێوەی چیرۆك و مۆسیقا :
چیرۆکیش وەکو هەر شتێکی تر هەستی منداڵ رادەکێشێ ، بەتایبەتی گەر هاتوو پاڵەوانەکانی منداڵ بن ، وەیا لە بارەی ئەو کەسانەوە بدوێ کە پەیوەندی پێیانەوە هەیە لەژیانیدا .. وەك «دایك ، باوك ، ئاژەڵ ، باڵندە» کە ئەیان ناسێ وەیا دیونی ..
چیرۆکیش گەلێك چەشنی هەیە ، وەکو چیرۆکی خەیاڵی دوور لە واقیع کە منداڵی بچووك زۆر حەز بەبیستنی دەکات .. وەیا چیرۆکی واقیعی کە منداڵی گەورەو گەنج و مەزنەکانیش حەزی لێدەکەن .. چیرۆکی مۆسیقی باشیش - کورت یاخود درێژ - چ خەیاڵی و چ واقیعی ، دەبێ ئامانج و ئاواتی پەروەردە کردن بێ و پڕبێ لە نموونەی خوو رەوشت جوانی بەمەبەستی سوود لێوەرگرتن و پەیرەوکردنی .
جـ - یاری فێرکردن و زانیاری :
ئەمەیش رێگەیەکی ترە کە بەهۆیەوە زانیاری مۆسیقا فێری منداڵ دەکرێت ، جا چ بە ئاواز بێ بە دیارخستنی سەرکەوتن و دابەزین لە سکێلەکان و دەربڕین بە شێوەی بزووتنەوەو جووڵەکردن ، وەیا بە هۆی ریتمەکانەوە بێت وەکو دەنگی بەرز و کاتە جۆی جۆیەکان ، لەدوایشدا ئەو هەموو یارییانە وا لەمنداڵ دەکا سەرنجی رابکێشێ و بابەتەکە زیاتر تێ بگاو باوەڕی بە توانای خۆی هەبێ و هەستی مۆسیقا لە دەروونی دا زیاتر پتەو بکرێت ..

لەدوای ئەم قۆناغە شێوەی گۆرانی و سروودی منداڵان دەبێ شێوەی ئامۆژگاری وەربگرێ و لە بارەی ژیانی کۆمەڵایەتی و چیرۆکی پاڵەوانیەتی و داستان بدوێ ، چونکە منداڵ لەو سەردەمەدا حەز لە پاڵەوانیەتی و ئازایەتی مرۆڤ دەکا بەپێی گۆڕینی فسیۆلۆژی کە بەسەریا تێپەر دەبێ و شانازی بەخۆی و بەهێزی ماسولکەکانی دەکات ..
لە کۆتاییدا دەبێ گۆرانییەکان شێوەی فێرکردن و باری کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی تیادا ئاشکرا بێ چونکە لەو کاتەدا هەست بە لاویەتی و ئازارو ئەشکەنجەی هەزارو چەوساوەو خاك و نیشتمان و خۆبەخت کردن لە پێناویدا دەکا ..

## ● گۆرانی منداڵان کێ بیڵێ ؟

بۆ ئەوەی گۆرانی منداڵان چاکترو بەگوڕتر بچێتە دڵ و دەروونی منداڵەوە ، باشتر وایە منداڵ خۆی گۆرانی بۆ خۆی بڵێ ، چونکە کاریگەرتر دەبێ و زیاتر سەرنجی گوێ گرانی رادەکێشێ و گیانی لاسایی کردنەوەیان لە دڵدا دەچەسپێنێ ، بەتایبەتی گەر منداڵە کە دەنگ خۆش و بەهرەوەر بێت .. بەلام لەگەڵ ئەوەشا زۆر گۆرانی هەن بەدەنگی پیاو وەیا ژنەوە گووتراون و سەرکەوتوویش بووین ، هەر بۆیەشە دەبێ گۆرانی بێژەکە توانایەکی ئەوتۆی هەبێ کە گۆرانییەکە بەچاکی پێشکەش بکات و جووڵانەوەکانی لە بەردەم کامیرادا رێك و پێك بن ، بۆ ئەوەی کە لە تەلەفزیۆندا دەردەکەوێ زیاتر سەرنجی منداڵان بۆ خۆی رابکێشێ .
گرنگترین خاڵ لەم باسەدا دەبێ پەنجەی بۆ درێژ بکەین ، لەبیر چوونەوەی گۆرانی و یارییە فۆلکلۆرییەکانی منداڵانی کوردە ، کە تائێستا هیچ هونەرمەندێکی کورد بەرەو پیرییەوە نەچووە وەکو پێویستە ، وەئەگەر بۆشی چووبێ نەی هێناوەتە بەرچاو .. گەلی کوردمان وەکو هەر گەلێکی تر خاوەنی سامانێکی دەوڵەمەندو گەورەیە لەم بوارەدا ، هەر ناوچەیە گۆرانی و یاری فۆلکلۆری تایبەتی منداڵانی خۆی هەیە کە لەنەوەیەك بۆ ئەوی تر ماوەتەوە ، جا گەر ئەم گۆرانییانە زیندوو نەکرێنەوە ئەوە پاش چەند ساڵێکی تر بزردەبن و لە نێودەچن ، لەئەنجامی کارتێکردنی جۆرەها هۆی بڵاوکردنەوەو راگەیاندن وەك : «رادیۆو تەلەفزیۆن و سینەما» ، دەبێ ئەوەش بزانین کە هەریەکە لەم گۆرانییانە دەبێ بەشێوەیەکی رێك و پێك تۆمار بکرێن ، چ لە بارەی دەنگ و چ لەبارەی دەرهێنانی تەلەفزیۆنی ، کە ئەمەیش کارێکی ئەوتۆ دەکاتە سەر منداڵ ، چونکە وەك دەڵێن لەگەڵ خوێنی تێکەڵاو بووین و لە ناخیشیەوە هەڵقوڵاون ، هەروەك چۆن گۆرانییێکی فۆلکلۆری یا میللی

یەکسەر شوێنی خۆی لە دلی جەماوەردا دەکاتەوە .

ئیتر با ئەمە بانگەوازێك بێت بۆ هونەرمەندانی کورد کە هەریەکە لە شوێنی خۆیەوە هەوڵ بدا بـۆ کۆکـردنەوەی ئـەو گۆرانی‌یانە بۆ ئەوەی هونەری میللەتەکەمان ئەم لایەنەی لێ دانەبڕێ‌و کرچ‌وکاڵ دەرنەچێت ..

● پەراوێزەکان :

1 ـ گۆڕینی مەقام : وەك بڵێین بە (مقامی صبا) دەستمان بە گۆرانی‌یەکە کردو لە ناوەراستیدا گۆڕیمان‌و کردمان بـە مەقامی (عەجەم) .

2 ـ کرۆماتیك : پەیژەی کرۆمـاتیك یـاخو پـەیژەی «رەنگـاو رەنگیش ناو دەبرێ» ، مـاوەی نێوان هـەر دەنگێك بـۆ ئەوەی‌تر «نیوتۆنە» واتە «نیو پلەیە» .

3 ـ سـوپرانـۆ : دەنگی نـاسکی ئـافـرەت‌و منـدالان پێ‌ی دەووتـرێ «سوپـرانۆ» . وەدەنگی گـڕیش «هی مندال‌و ئافرەت» پێ‌ی دەووترێ «کونترآلتو» .

4 ـ (سکێل یا پەیژەی مۆسیقا) : لە حەوت دەنگی‌یەك لەدوای یەکدا پێك‌دێ چ بەسـەرکەوتن‌و چ بـە دابەزین لەگـەل دووبارە کردنەوەی دەنگی یەکەم لە کۆتایی‌دا .

5 ـ «چەنگاڵی لەراوە ـ شوکەرنانە» : ئامرازێکی کانزادی‌یـە لەفیـزیادا بـەکار دەهێنـرێ بۆ مـەبەستی سـەلماندنی گواستنەوەو جوولەو شەپۆل‌و پلەی دەنگ ، جـا چەنـد لەرەی زیاتر بوو دەنگە کە ناسك‌تر دەبێ ، بۆ نموونە گەر چەنگاڵی لەراوە لەرە لەرەکەی (128) لەرە/چرکـە بێت ، یـەکی تریش لەرە لەرەکـەی (512) لەرە/چـرکـە بێت ، دەبینین کە دەنگ لە یەکەمدا گڕەو لەدووەمدا نـاسکە . ئەوەی بۆ مۆسیقا بـەکار دەهێـنرێ لەرە لەرەکەی «440» لەرە/چرکە یا «880» لەرە/چرکەیە ، کە دەنگی نۆتـەی «لا» دەدا جـا بەتـایبەتی ئـامێرە مـۆسیقا ژی‌یـەکـان لەسـەردەنگی ئەم چـەنگاڵە لەراوەیـە دوزان دەکرێن ، چونکە ساردی‌و گەرمی کار لە رینەوەی دەنگەکەی ناکاو هیچ کاتێکیش دەنگەکەی ناگۆڕێ ..


سەرچاوەکان :

1 ـ مجلة القيثارە .

2 ـ التربية الموسيقية للأستاذ حسين قدوري .

3 ـ علم نفس الطفل .

4 ـ طرق تعليم الموسيقى ـ عائشة صبري والدكتورة آمال احمد مختار صادق .


# بەخێربێن

هونراوەی : عثمان شاربلاژێری

ئاوازی : صباح محمدامين

دابەش‌کردنی : ئەنوەر قەرەداغی

A بەخێربێن بەخێربێن باوکانی « دایکانی » بەرێز
بۆ دوا ڕۆژی گەلمان ئێمەین پشت‌و هێز
بەخێربێن بەخێربێن باوکانی « دایکانی » بەرێز

B1 پەپوولەی زانیاری باخی ژیانین
لە دەم ئاسۆی هیوا تیشکی بەیانین
بەخێربێن بەخێربێن باوکانی « دایکانی » بەرێز

B2 رابەری پێشکەوتن مامۆستایانن
چەند ڕێزیان بگیرێ پتر شایانن
بەخێربێن بەخێربێن باوکانی « دایکانی » بەرێز

B3 گەر باوك‌و مامۆستا دەست خەنە ناو دەست
بە زووترین کات ئەگەینە مەبەست
بەخێربێن بەخێربێن باوکانی « دایکانی » بەرێز

تێبینی :

---

1 — پیتی A — B مانای ئەو دێرە هۆنراوەی کە پیتی A — B لە لاوە دانراوە وەك ئاوازی ئەو بەشانەی ئەوترێن کە لەسەر نۆتەکان نووسراون A — B .

2 — بەشی (B2) — (B3) ئەگونجێ لە هەندێ ووشەدا کێشی ئاوازەکە بگۆڕێ بە پێ‌ی پیتی ووشەکان .

3 — ئەم گۆرانی‌یە لە کۆبوونەوەی باوکان‌و دایکان بە تایبەتی لە قوتابخانەکان ئەوترێت .

# دیدەم زارا ...

**ئاوازو هەڵبەستی : فۆلكلۆری**
**ئامادەكردنی : ووریا ئەحمد**
**گوتنی : صلاح پشدەری**

ئـای زارا دیـدەم زارا بـەم ئێـوارە بیلەنگینـە
لەنـگـانـدن وادەبـێ لەبـەر ئەو گـوزەی دەمـرم
لەسەرشانی بەندەبێ

* * *

كـراسـێـكی لەبـەردایـە كـەس نـازانـێ چ رەنگـە
وەكـو رادیـۆ بـاس ئـەكـا ئـەڵین كـاری فـەرەنـگـە

* * *

وەرن جـەرگـم هـەڵدڕن بـزانـن چیـم لە دڵی دایـە
هەمووی دەردو حەسرەتـە لەتـاو دووری لەیـلایـە
ئەی زارا دیدەم زارا ...

**ئەم گۆرانیە ساڵی 1974 لە میانی فیستیڤاڵی یەكەمی هونەری كوردی لە بەغدادا پێشكەش كـرا لەگەڵ تیپی مـۆسیقای بـاواجی كۆیـە ، هەروەهـا تیپی مـۆسیقـای سلێمانیش (ساڵی 1978) هەر بەهەمان پێشـەكیە كـەی من تۆماریان كردەوە بە دەنگی (كامران مجید) .**

# پەروانە

**ئاوازو هەڵبەستی فۆلكلۆری**
**ئامادەكردنی : ووریا ئەحمەد**
**گوتنی : ئیبراهیم سابیر**

چاوی كاڵەو برچی درێژە
ئەمشەو جیّ ژوان سەرەو لێژە
كوشتومت بۆخۆت بمنێژە
كوشتومت وەرە بمنێژە
دێوانە بووم من دێوانە بووم
دێوانە بووم من دێوانە بووم

* * *

ئەو شەمع و من پەروانە بووم
ئەو شەمع و من پەروانە بووم
چی بوو لەپڕ بێگانە بووم
دێوانە بووم ..... ... ...

* * *

هەروا دەڕوا دەڵێی بۆڕە
گوارەی ئاڵتوون لەگوێی شۆڕە
توخوا جوانێ دڵ مەگۆڕە
ئەمان جوانێ دڵ مەگۆڕە
دێوانە بووم ...

* * *

هەروا دەڕوا شیلان شیلان
بۆخۆی یەكەو دۆستی چلان
بەقا مەكەن بەكچەتیوان
بەقا مەكەن بەكچە تیوان
دێوانە بووم ...

**ئەم گۆرانی‌یە لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی تۆمار كراوە بۆ تەلەفزیۆنی بەغدا لە ساڵی 1973دا ..**

# چيڤوكا « سوورێ چاڤشين »

بەرهەڤكرنا

احمد عبدالله زمرو

1983 / 2 / 16

هەژارەكێ سێ كوڕ هەبين ؛ يێ مەزن دگوتنێ سلكوو يێ نافى پيڤازوو يێ بچويك دگوتنێ سيروو ...

بابى گوتە وان ؛ كوڕێت من ئەگەر ئەز مرم شيرەتا من لوەبت كو هوين نەبنە خزمەتكارێ سوورێ چاڤشين ... هەكە ساله ، هەكە دوو پشتى هنگێ بابێ وان مر ..

كوڕێ مەزن گوت : ئەز دێ ڕابم چم بمە خولامو ڕابوو ژمال دەركەت چوو ڕێكەكێ لنيڤا ڕێكەكێ ؛. سوورێ چاڤشين گەهشتێ سلاڤ لێكرو گوتى : دێ كيڤا ؟ كوڕكى گوت : بو خول كارەكێ دگەڕهم .. سوورێ چاڤشين گوتێ : تو نابيه خولامێ من ؟. كوڕكى گوتێ : بەلێ .. پاشى كوڕكى گوت : ئەرێ پا قەول هەتا كەنگى ؟ سوورێ چاڤشين گوت : قەولێ مە هەتا توك دخوينتو شەرتێ مەژى هەكە ئەز سلبووم تو چەرمەكێ ژ پشتا من ڕاكە هەتا بنێ پى‌يا ئو هەكە سلبووى ئەز دێ وەك تەكم .. كوڕك بشەرتێ وى قايلبوو .. گەهشتنە مالا سوورێ چاڤشين .. ڕوونشتن ژنا وى گوت : ئەڤە كى‌يە لگەلتە ؟ گوتێ : ئەڤە خولامێ مەيە ... شيڤا خو خارنو نڤستن .. بو سپێدە سوورێ چاڤشين گوتە كوڕكى : دێ ڕابە هەڕە جوتى .. كوڕك ڕابوو كايێت خو ئينان .. تێرو هەڤجارێت خولكەرى كرن گوتە سوورێ چاڤشين كى دێ لگەل من هێت زەڤيا تە نيشا من بدت .. سوورێ چاڤشين گوت : دێ سەيێ من لگەل تە هێت .. هەڕە چى ئەردێ سە كەتێ تو وێرێ بكێلە ئو هەكە ئێڤارى هاتيەڤە بارەك دارێت چيچكا نەڕيتى پێڤە بو مە بينە .. سە فبەرى كوڕكى كەتو چوون و گەهشتنە چيايى .. سە كەتە سەر كەڤوەكێ ـ تەحتەكێ ـ فرەهـو ما لوێرێ .. كوڕكى نەزانى دێ چ لكەڤرى كت ڕابى كايێت خو زڤراندنو هاتە مال بێ‌سل .. شيڤ بو ئينان .. شيڤ نەخار ژ قەهرێت خو دا نەئاخڤت .. سوورێ چاڤشين گوتێ تويى سلى ؟. كوڕكى گوت : پا ما چەوا سل نەبم !.. ماتو نزانى ئەزێ سلم ؟ سوورێ چاڤشين ڕابوو چەرمەك ژپشتا كوڕكى ڕاكر هەتا بنێ پيا .. ئينا كوڕك كوشتو بر ڤەشارت . برايێ ناڤ ڕابوو گوت ئەزێ چم بو خول كارەكێ گەڕهم .. گەڕها ـ گەڕها هەتا گەهشتيە بەر دەرێ مالا سوورێ چاڤشين .. سوورێ چاڤشين گوتێ تول چى دگەڕى ؟ كوڕكى گوت : ئەز بو خول كارەكێ گەڕهم .. ويژى وەكى برايێ مەزن شيرەتا بابێ خو ژبيركر ، بو خزمەتچيى سوورێ چاڤشين .. وەكى برايێ خو ئەو ژى چوو جوتىو هاتەڤە پڕم شوورو سل ، سوورێ چاڤشين ڕابوو هەر بوى ڕێكێ كوشت وەكى ل برێ مەزن كرى ..

برايێ بچويك گوتە خو دياره خولامەتى زورا خوشە ، لەوما برايێت من نەزڤرين ، كا دا ئەژى ڕابم بچم ببمە خولامێ ئێكێ .. ڕابو كەتە ڕێكێ هەر چوو هەتا ل ئەردەكێ ديتى سوورێ چاڤشين يێ جوتى دكەت ؛ كوڕك ناسناكەت كو ئەوە يێ بابێ وى گوتيێ نەبنە خولامێت وى ، ئينا سوورێ چاڤشين گوتێ تو نابيه خولامێ من ؟ كوڕكى گوت بەلێ .. چوونە مال ڕوينشتن گوتێ دێ بيه خولامێ من هەتا توك دخوينيت ، لالا مەبە . هەكە ئەز سلبووم تو دێ چەرمەكێ ژپشتا من ڕاكەىو هەكە تو ژڤەولێ خو لێڤەبوى ئەز دێ پارچەكا گوشتى ژ لەشێ تە ڤەكم .. كوڕكى گوت بەلى كارێ مە چى‌يە ؟ سوورێ چاڤشين گوت دێ چينە جوتىو دێ هاريكاريا من كەى لنيڤ جهێ جوتى .. سپێدێ ژ خەوێ ڕابوونو قەستا ناڤ زەڤيێ كرن ، كوڕكى گوت : كى دێ لگەل من هێت نيڤزەڤيێ ؟ سوورێ چاڤشين گوتى سەيێ مە دێ لگەل تە هێت .. سە لبەرى كوڕكى كەتو قەستا زەڤيا سوورێ چاڤشين كر . سە چوو ناڤ زەڤيێ كەتە سەر كەڤرەكێ ، كوڕك ما هزرێت خو كرن گوتى ب خودێ دوو برايێت من يێت كوشتين سلكوو .. لێ ئەز سيروومە دێ تولا وان ڤەكم ئەگەر ئەز نەمرم ، د وى دەمى‌دا شيرەتا بابێ وى هاتە بيرێ كوڕك ڕابوو دانا سەى ب داروبەراو ڕابو چوو ناڤ زەڤيێ دەست هاڤێتە جوتى هەتا نيڤرو بسەردا هاتى ل دانێ نيڤرو كچا سوورێ چاڤشين فراڤين بو كوڕكى ئينا . كچكێ گوتى بابێ من يێ گوتى بلا فراڤينێ بخوتو دەما نانى دخوت بلا كەرنەكتو ماستى ژى بخوت سەرتيكێ وێ خراب نەكت . كوڕكى گوت بلا نەكارەك ب زەحمەتە ، ڕابى نانێ خو ژناڤ ئينا دەرێو بنێ مەنجەلوكێ كونكرو ماستێ خو خوار ، تێر فراڤين خوارو بەرێ خودا جوتێ خو هەتا لێ بوويە ئێڤار . ڕابى گوت ئەز دێ دارێت چيچكا نەڕيتى پێڤە ژكيڤە ئينم ، ڕابى هەڤجارێ ( هنجار ) خو ڤەت كرولپشتا . دموارێ خوكرن .. كوڕكى قەستا مال كرو دارێت خو دانان ، سوورێ چاڤشين گوتێ دارێت چيچكا نەڕيتى پێڤە ئينان ؟ گوتى بەلى .. ڕابى چوو بەرێ خو دايێ هەڤجارێ ڤەتكرىو ئيناى .. گوتێ كوڕو ئەڤە تە چ كرى‌يە ؟ كوڕكى گوتێ ما تويى

سلی و نەڕازیی ؟ سۆرێ چاڤشین گۆتی نەء .. ڕابین چـوون شیڤا خۆ خوارن .. دەمەکێ مانە هشیـار هەتـا دەمێ خەوێ ڕابین هەر ئێك کەتە سەر جهێ خۆو هەتا بویە سپێدە ، سپێدێ ژ خەوێ ڕابین سۆرێ چاڤشین گۆتـە کچێ هەڕە بێـژە خۆلامی ( سیرۆ ) بلا گایا ئاڤ بدەت بەلێ بلا پێت وان تەڕ نەبن ، کچك ڕابی چوو گۆتە کوڕکی بابێ من یێ گۆتی بلا بچت گا ئاڤبدەت بەلێ بلا پێت وان نە تەڕبن و دەرگەهێ ژی نەڤـەکت .. کوڕك ڕابی کـارێ خۆ کـرو چوو بـەر دەرێ گۆڤێ و گـۆتی ئەز دێ چەوانێ چم ئاڤدەم و پێت وان تەڕ نەبن ؟! ڕابی پەنجەر شکاندو چوو ژوورڤە ، دەست هاڤێتێ سەرێ هەردوو گا بڕی و هاڤێتە دەری و سەرێت وانا دئاڤێ هلاندن و جارەکا دی زڤڕاندنەڤـە دگۆڤێ ڤە ، چوو نك سۆرێ چاڤشین .. گۆتێ : تە گا ئاڤدان ؟ گۆتی : بەلێ و پێت وانا ژی تەڕ نەبوون ..

چاڤشین ڕابی چوو بەرێ خۆ دایێ دەرگەهێ گۆڤێ هەر وەکی خۆیە چوو ژوورڤە بەرێ خۆ دایێ هەر دوو گا پێت سەر ژێکری ، هاتە نك کوڕکی و گۆتێ : تە بۆچی هۆ کرییە ؟ گۆتێ : مانێ تە یا گۆتی هەڕە ئاڤبدەو دەرگەهێ ڤەنەکەو پێت وان ژی تەڕنەبن .. گۆتی پانێ من دەرێ کۆلی ـ گۆڤێ ـ نەڤەکرەو پێت وان ژی نە تەڕبوون .. کوڕکی گۆت : ئەرێ ماتو سلی یان نەڕازی ؟ گۆتی : نەء ئەز نەیێ سلم .. ڕابی گاییت خۆ ئینان پیستێ وانا دسەردا ئیناو قەت قەت کرن .. گۆتە کوڕکی هلۆ هندەکێ بو کچا من ببە هندەك کرە سەڤێی و دا پشتا کوڕکی .

کوڕکی پچەك برن و جارەکـا دی زڤڕیڤـە .. گۆتی بـۆچی تە زڤڕاند گۆشتێ خۆ ؟. گۆتی کچکێ یا گۆتی پیچەکە من نەڤێت ، دوو گا پێت سەر ژێکـرین و ئەڤ پیچکـا گۆشتی بـو پـە یـا ڤڕێکری .. هندەك گۆشتێ دی دانا سەرو گۆتێ بو ببە هەکە نەڤیا لبنێ گـۆهێ وێ بدەو وەرە . کـوڕك ڕابی گۆشتێ خـۆ هەلگرت و جارەکا دی قەستا مالا کچا چاڤشینی کر .. بڕێکێ ڤە گۆتی : ئەڤە خۆش کارە ! چوو گۆشتێ خۆ هـەمی بژالەکـرو قەستا مالا کچکێ کر ، پارچەکا گۆشتی یاڤێ لێ هەمی هەستینە ، چوو مالا کچکێ ئەڤە گۆشتە بابێ تەیێ بۆتە هنارتی .. کچکێ گۆتی ببە تە ژکیڤە ئینایە ببەڤە کوڕکی گرت و ئەو پارچا هەستی لدەڤێ داو کچك نەهش کر . زڤڕیڤە مال گۆتێ : تەبر .. گۆتی : من بر بەلێ ب دلێ وێ نەبوو .. جیرانێیت کچکێ پێ حەسیان کو یا هاتی کوشتن .. سالۆخدان گەهشتە مالا سۆرێ چاڤشین ب کوشتنا کچا وێ . سۆرێ چاڤشین گۆتی : تە کچا من کوشت .. گۆت : بەلێ من کوشت .. مانێ تە گۆتبوو هەکە نەڤیا لدەڤێ وێ بدەو وەرە .. منژی دانایی و مر . کوڕکی گۆتێ : ما تو یێ سلی ؟ سۆرێ چاڤشین گۆتی نەء .. مێرکی گۆتە کچا لمالێ دێ چ ڕێکێ بو ڤی کوڕی بینین ؟ پشتی کوڕك ژوێرێ چووی ، کچکێ گۆتی ؛ مانێ قەولێ مە هەتا تۆك بخوینت وێ ژدەڤ مە چت ، ئەز دێ ڕابم چمە سەر دارا دەرێ خانی هەر دێ کەم تۆك ـ تۆك ، تو بێژە مانێ قەولێ مە تەمام بـو تۆکێ خـاند .. کـوڕك یێ لبەر پەنجەرێ گوهدێرە ، ڕابوو کارێ خۆ کرو بەرەکی لاو ژخـۆڕا هەلگرت ، کچك لسەر دارێ خۆ ڤەشارت و هەر گۆت تۆك ـ تۆك ، چاڤشینی ژی گۆت : خۆلام ـ خۆلام ، گۆتێ : بەلێ گۆتێ : تە گۆل تۆکی هەیە یادخوینیت ؟ کوڕکی گۆتی : کانێ دابـەرێ خۆ ب دەمێ .. چوو بەرێ خۆ دایێ کچکا سەردارێ دەست هاڤێتێ پیلەك یان تیفشەك ( بەرەك ) تێوەراند ، کچك ددارێ دا ئینا خارێ . کچك ژی مر . سۆرێ چاڤشین گۆتە کوڕکی تە کچا من کوشت ؟ کوڕکی گۆتێ : مانێ تە گۆت تۆکە .. ئەز نزانم تـۆك چەوانن ! من گۆت : دا بەرێ خۆ ب دەمێ . کوڕکی گۆتە سۆرێ چاڤشین ما تو یێ سلی ؟ سۆرێ چاڤشین گۆتی نەء، ئەز نەیێ سلم .. بو شەڤ ؛ شیڤا خۆ خارن ، سۆرێ چاڤشین کوڕەکێ بچویك یێ هەی .. کوڕکێ بچویك هـەر دگۆت : دێ میـزم .. سۆرێ چاڤشین گۆتە خۆلامی هەڕە ببە دەرێ مالێ دا بمیزیت ، ئەو بتنێ نەوێرت .. کوڕك ڕابی دەستێ بچـویکی گرت و بـرە دەرڤەو قنجڕیك ( قوڕنجیك ) ل بچویکی دان .. کوڕکێ بچویك کرە گری گۆتی بەسە ـ بەسە نامیزم ..

برە دژوورڤە ، جارەکا دی کرە گری و گۆت : دێ میزم .. جارەکا دی کوڕك ڕابوو ئینا دەرڤەو هەر قنجڕیك لێدان دیسان کوڕکی کرە گری و گۆتی بەسە ـ بەسە ئەز نامیزم .. کەربێت سۆرێ چاڤشین ڤەبوون گۆتە خۆلامی هەکەر نەمیزت بگرەو ب دیوارێ ڤەدە .. کوڕکێ خـۆلام هەر دگـۆتێ : دێ بمیزەو دبـەڕا هەر قنجڕیك لێ ددان ، کوڕکێ بچویك هەرێ دگریت و دبێژیت نامیزم .. ئینـا خۆلامی دهـەردوو پێت وێڕا گـرتن و سـەرێ وێ ب دیوارێ ڤەدا ؛ مەژیێ وێ هێلا ب دیوارێڤە .. سۆرێ چاڤشین گۆتە خۆلامی : تە کوڕێ من کوشت ؟ خۆلامی گۆت : ماتێ تەیێ گۆتی من ب دیوارێ ڤەڕە .. پاشینکێ خۆلامی بەرێ خۆ دایێ و گۆت : ما توێی سلی ؟ سۆرێ چاڤشین گۆت : نەء ئەز نەیێ سلم

خۆلام چووژوور روینشت ؛ بو وەختێ خەوێ جهێت خۆ چێکرن ، کوڕکێ خۆلام چوو سەر جهێ خۆو نە نڤست .. گوهێ وێ ما لسوورێ چاڤشین و ژنـا وێ کا دێ چ بێـژن .. پشتی

دەمەکێ خۆش ، سۆرێ چاڤشین گۆتە ژنا خۆ ئەو خۆلامێ پیس نڤستی‌یە ؟ ژنکێ گۆت : ژمێژە .. کورك گوهـ یێ لێ .. سۆرێ چاڤشین گۆتی : پا تەکبیرا مە چی‌یە دا ئەم ژڤێ بەلایێ خلاس بین ؟ ژنکێ گۆت : ئەز دێ رابم فەردەکێ کادا چێکەم .. دێ سپێدێ مالا خۆ ژبەر وی بارکین هێشتا ئەوێ دخەو .. کورك دبن نڤیناڤە ئاگەهـ ژێ هەیە .. ژنك کەتە بەر کادا ، فەردەك چێ‌کر و پڕی تەلیسەکێ کرن و گۆت دا سپێدێ زوی بارکین .. کورك رابوو چوو هندەك کادە هاڤێتن و جهێ خـۆ د تەلیسی‌دا چێکر ، ما تێدا سپێدی زوی . ژنکێ ؛ مێرکێ خۆ ژخەو ڕاکرو گۆتێ هلۆ ڕابە دا بچین .. سۆرێ چاڤشین ڕای تەلیس دا پشتا خۆو چوون .. کورکێ خولامژی یی د تەلیسی‌دا .. قوناغەك پێڤە چوو میزا کـورکی هات ، ئـەوی ژی میزتـە ب پشتا سـۆرێ چاڤشین‌ڤە .. سۆرێ چاڤشین گۆتە ژنا خۆ پشتا من گەرم‌بوو و تەڕبوو . ژنکێ گۆت : هندی من ڕۆن یا لێکری‌و ناڤك تژی کری دارەق نەبن .. بێهنەك پێ‌چوو هەتا برسی‌بوون سۆرێ چاڤشین گۆتە ژنا خۆ دا بێهنا خۆ ڤەکەین هندەك کادا ژی پێ بخوین ، مانێ ئەم و خۆلامی ژێك ڤەبووین .. گەهشتنە بەر سها دارەکێ تەلیسێ کادا دانان دەست پێ‌کرن کو کادا نجۆن دەرێ فەردەی قەکر دیت کو کورك یی تێدا ئینا چ بسۆرێ چاڤشین‌ڤە نەما گۆتە کورکی تەح بیرا مە نەهات ! مە تو ژبیـرکری هـەما بـاشبوو توهاتی .. نانێ خۆ خارن و ڕابوون هـەرسێ پێکڤە چـوون بەر ڕووبارەکێ بۆش .. چاڤشینی گۆت : ئەم دێ ئەڤ شەڤە لڤێری بین ، شیڤا خۆ خارن .. کـورك ڕابوو پیچـەك دویر ژوان خـو ڤەشارت و گوهێ وی ما لوان .. سۆرێ چاڤشین هەر بەرێ خۆ دایێ کورك نەدیت ، ئینا گۆتە ژنا خۆ ئەم چ لێ بکەین دێ ژێ رزگار بین ؟ ژنکێ گۆت : هەکە هات ئەم دێ بێژینێ وەرە لناڤبەرا مە بنڤە دونیا سارە ، دا تە سار نەبیت ، هەکە دخەوچوو ئێك ژمە پێت و یی دی سەرێ وی بگریت و دێ هاڤێنە د رووباری‌دا .. گوهێ کورکی یی لێ کانێ چ دبێژن .. کورك هات بو دەمێ خەوێ سۆرێ چاڤشین گۆتە کورکی وەرە دنیڤەکا مەدا بنڤە دا تە سار نەبیت .. کورك هات کەتە دنیڤەکا وانداو ما هشیار .. نیڤەکا شەڤێ ڕابوو چوو ڕەخێ دی ژ سۆرێ چاڤشین سۆرێ چاڤشین ما لجهێ وی .. ژنك ژ خەو ڕابوو چوو هنداڤ سەرێ کورکی‌و گۆتی ڕابە یی نڤستی « بهزرا وێ مێرێ وی‌یە » وێ نەزانی کورکە ، تاری‌یە ، نانیاست کورك ڕابووڤە گوتێ دێ لەزێ بکە هێشتا ژ خەو نـەڕابی .. ژنکێ پێت سۆرێ چـاڤشین گـرتن‌و کولاکی سەرێ وی گرت و هاڤێتنە د دووبارێ بۆشداو ئاڤێ برو بن ئاڤ بی .. کورك و ژنك زڤرنیەڤە مال .. ژنکێ هۆ دیت خۆلامە .. نەزانی چ بکەت کورکی گۆت : من تۆلا برایێت خۆ وەرگرتن ، سلکۆو پیڤازۆ .. ئەز سیرۆمە ، دا چۆ جارا سۆرێت چـاڤشین نەڕابن زۆرداری‌و بێ‌بەختی‌ی ل خەلکێ بکەن .. ژنکێ چ پێ نەما شوی پێ‌کرو مالەکا دی دانان [1]..

(1) ئەڤ چیرۆکە « سەرهاتی » من ژزار دەڤێ دوو کەسا وەرگریتە یی ئێکێ : ناڤێ وی سمـو صالح میـرزا خەلکێ دەڤـەرا ( سنـدی ) یـانـە لزاخـۆ ژیێ وی (61) سـالە ، نەخوێندەوارە ، شەهرەزایە بو ڤەگێران سەرهاتی‌و مەتەلوك‌و چیرۆکێن کوردەواری یێن کەڤن .
یی دووێ : ناڤێ وی مختار پیرموسە خەلکێ گوندێ « ڕاڤینایە » لدەڤەرا بەرواری‌یا قەزا نامیدێ ، ژیێ وی نێزیك (50) سالە .

**ووشە گرانەکان**

سلك  زلق ـ سلق
پیڤاز : پیواز ـ پیاز
رابم ـ رابی ـ رابوو ـ : هەلسان
توك : جۆرە باڵندەیەکە ، خوێندنی یە
( نەحسي ـ تشاؤم ) بەناو بانگە کوندە بەبۆ
سل‌بوون  تورە بوون
راکە : لێی بکەوە . فرێدان
هەرە  برو
هەڤجار : هنجار ـ هەوجار
زدەق  لنك . لەکن
سە  سەگ
ویری  لەوێ
نەڕیتی پێڤە  گوێ پێوە نەبێت
چیچك  چۆلەکە ژڤراندن  گەڕاندنەوە
شیڤ  خواردنی شەو ـ شێو
یاما : ئەدی « بو سەر سوڕمان بەکاردێت »
ڤەشارت  شاردەوە

قنجریك ـ قورنجیك : قونجرکە
بێ قایل نەبوو : پێی رازی نەبوو
کەڤر : بەردی گەورەی چیایان
ڕاکر : لێی کردەوە .
بن : ژێر
ناڤێ : ناوەندی
گەرهم : دەگە ڕێم
پرم شۆر : لێوی شۆڕ بووە
بری : برا
لێڤە بووی : لێی بوویتەوە
دانێ : دەمی ـ کاتی
فراڤین : خواردنی نیوەڕۆ
سەرتویك : سەرتووك
دەوار : ئاژەل ـ مەبەت بو ئەسپ و کەر ـ بەکار دێت
سپێدە : بەیانی
نەڤەکت : نەکاتەوە
کۆڤ : کوول وەیا تەویلە
قەت ـ قەت : لەت ـ لەت . پارچە ـ پارچە

سەڤی : سەبەتەی گەورە هی میوە ..
بچەك : کەمێك
ڕڤرێ کری : ناردی
گوهـ : گوێچکە
بژالەکر : بلاوی کردو تێکی‌دا .
هەستینە : ئیسقاتن
نەهش‌کر : کرکر . بێ هۆشی‌کرد . بێ دەنگ کرد
سالۆخدان : دەنگ وباس
منژی : منیش
گوهدێرە : ئاگای لێیە .
ژخۆرا : بو خۆی
کانێ : کوا ؟
تیفش : پارچە یەکی بان لەبەر دێك
دەڤە : دەرەوە
کەرب : کین . عاجزبو ـ تورەبو ـ ڕڤی لێی گرت
پاشنکێ : گۆنیك . گوشە
سهـ : سێبەر
هۆ : ئەوها



# ئەو خونچانەی ڕۆژگار نایەڵێ دەم بکەنەوە

نەوزاد علی

جارێکی‌تر هاواری دایکێکی‌تری کورد بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە ، بۆ ئەو کۆچە ناکامەی کە ( ساهیرە ) ی بەهیواو ئاوات نەگەیو کردی ... بەڵێ دەستی ڕەشی مەرگ بێ‌بەزەییانە کۆتایی بەژیانی خوشکی ـ جوانە مەرگ هێناو لەگەڵ دوا هەناسەیا ماڵ ئاوایی لەخاك‌و نیشتمان‌و کەس‌و کارو گەلەکەی کرد ....

ڕاستە گڵ تەرمی ساهیرەی داپۆشی .. بەلام ناوی هەرگیز لەیاد ناڕواو ناسرێتەوە .. ئەویش بەهۆی بەرهەمە جوانەکانیەتی کە بۆمانی وەك ملوانکێکی ئافرەتی کورد بۆ یادگار بەجێ هێشت ! جوانە مەرگ ئەگەر چی بۆ جارێکیش بەرهەمێکی خۆی لەسەر لاپەرەی ڕۆژنامەیەك یان گۆڤارێك نەبینی .. بەلام والێرەدا بەکۆمەڵ‌و گەلی دەناسێنین .. چونکە بەو تەمەنە کورتەیەوە کە لە ( نۆزدە ) ساڵ تێنەپەڕی ، توانی خۆی بە زۆر لەهاوزمان‌و هاوبیری خۆی لە شارەکەی ڕەفیق حلمی‌و ئەسیری شاری کەرکوك بناسێنێ !....

خوشکی جوانەمەرگمان لە ساڵی 1964 لە شاری کەرکووك هاتوتە دنیاوە ، وەلە خێزانێکی هەژاردا پەروەردە بووە ، لەتەمەنی حەوت ساڵی‌دا وەکو هەر منداڵێك چووەتە قوتانجانەو قوتابی‌یەکی زیرەك‌و هوشیار بووە ، هەر لەسەرەتای ژیانیەوە حەزی لەخوێندنەوەی لاپەرە کوردیە نووسراوەکان دەکرد بەهەموو بابەتێکیەوە ، بەلام زیاتر خوی لەگەڵ شیعرا ڕاگرتبوو ، بۆیە جار جاریش خامەی هەڵئەگرتوو داخی دڵی خۆی بەرامبەر ڕۆژگار دەخستەپاڵ دەنگی شاعیرەکانمان !. ساهیرە لەژیانیا هیوای ئەوەبوو کە وەك مامۆستایەکی ئافرەتی کورد ڕۆژێ لە ڕۆژان فێرکەری ئەلف‌و بێ‌ی کوردی بێ بە منداڵانی چاوگەشی نەتەوەکەی ـ بەلام داخ [illegible] پێ هەڵچنیو ماوەی نەدا .. تالەڕێکەوتی [illegible] ساڵی 1983 کەقوتابی بوو لە پۆلی سێیەمی خانەی مامۆستایانی کەرکووك ، بەنەخۆشی ( شێرپەنجە ) لەشاری بەغدا چاوی لەیەك ناوو حەزوو ئاواتەکانی دڵی لەگەڵ خۆیابردە گۆڕەوە . ئەوەی ئەمانەوێ بیڵێین ئەوەیە .. کەساهیرە وەکو شاعیرانی کورد هەرجارەی ڕۆژگار زۆری پێدەهێناو هەستی دەبزوان دەستی ئەدایە خامەو داخی دڵی بەشیعر دەردەبری ، ئەوەتا لێرەیا هەروەك زۆر لەشاعیرانمان یادی نەورۆزی پیرۆزی نەتەوەی کوردی کاوە ئەکاتەوەو دەڵێ : ـ

ئەمرۆ سەرەتای ڕۆژی بەهارە<br>
یادی کاوەیەو جەژنی هەژارە<br>
ئەو جەژنەی ناوی لە مێژوو نووسرا<br>
ئەو جەژنەی زۆردار سەری پانکرا<br>
ئەو جەژنەی عاشقان سوێندی پێدەخۆن<br>
ئەو جەژنەی کوردان بەپیریی دەڕۆن<br>
هاتنت بەخێر نەورۆزی پیرۆز<br>
ڕەمزی سەربەستی تۆی کاوەی نەورۆز

وەك لەم شیرەیْ خوارەوەدا دەبینین جار جارێك خامە شەرمەزاربوە بەرامبەر خوشکی جوانەمەرگو بەشەرا هاتوونە ، چونکە ئەوەی ویستویەتی دەری ببڕێت نەی توانیوە بۆی بنووسێت ! لەگەڵ ئەوەشا خامەی دەستی پەیمانی بۆ نوێ کردوەتەوەو بڕیاری داوە هاوڕێیەکی غەم‌و ئەشکەنجەکانی بێت وەك دەڵێت :

— 1 —

زەمانێ بوو ..<br>
خامەی دەستم شەرمەزار بوو<br>
هەڵهات‌و ڕۆی ...<br>
توانای نەبوو خۆی ڕاگرێ

ئەوەی دەم ویست بۆم بنوسێ<br>
بۆ فەلەستین<br>
بۆ کارەساتەکەی

( دێر یاسین )<br>
بۆ ئەفریقیاو بۆ لوبنان<br>
بۆ چەو ساوانی سەر جیهان .

— 2 —

بەلام ئەمڕۆ<br>
پەیمان دەداو دەڵێتەوە

لەپێش چاوی هەموو جیهان<br>
دەبمە مۆمێك<br>
لەسەر ڕێگای چەو ساوەکان .

( خەمی خۆشەویستی )

— 1 —

چەند حەزدەکەم<br>
زیاتر لەوەی کەدەمەوێ<br>
لەگەڵ غەم‌و ئازاردا بتوێمەوە<br>
چەند حەزدەکەم<br>
بەوێنەی ( شەم )و ( دیوانە )

منالانی کوردستانم<br>
فێری عەشق‌و<br>
خۆشەویستی بکردایە !

— 2 —

بەلام .... ئاخ<br>
ئەوەی دەمەوێ بینووسم<br>
لە ئامانج‌و لە کردارما<br>
تەنها غەمە !<br>
غەمی منیش دەریایەکە<br>
لەبن نایە .. لەبن نایە ..

# پیاچوونەوە بە دەورانی ڕۆژانەدا

نوزاد حسن احمد
سلیمانی ـ 1979

— 1 —

تنۆك .. تنۆك
لە ڕۆژێکی زستانی تووشی سارد
لەبەر کوانووی ئاگردانێ
پشکۆی فرمێسکی چاوجوانێ
بەسەر کولی گەش و ئالیا
ئەهاتە خوار .. پەپکەی ئەخوارد
ئەخزایە نیگای قەد پاڵی
سیمای کلۆی شاخی شارا
دەتۆ مەڕۆ جیم مەهێڵە
شەو بە ترسە ! بەفرە ، بارانە .. ڕەهێڵە

— 2 —

جارێکیتر ...
سێبەری تارمایی پەڵە هەورێکی ڕەش داگیرساو
شەقامەکان دا ئەپۆشێ
تۆ نازانی من لە سێبەر خەو ئەبینم ...
لە هەتاوا تۆ ئەبینم .
بۆیە جارێ ، ڕەوە پاساری ووشەکانم
بەرەو نیگای چاوی سزا هەڵفریون

— 3 —

لەنێو خەما ئەتوێمەوە
ژان بەری چاوی گرتوومو ،
کۆرپەی خۆزگەی چەندەها ساڵی بەد بەختیم
لەنێو شەوە زەنگی چاوەکانتا ئەخولێتەوە
خەمەو وا لە دایك ئەبێ
خەوی منیش لەنێو بزەی خەندەی لێوی ..
تریفەی قەڵبەزەی فرمێسکی چاوتا وون ئەبێ

— 4 —

پەنجەی شادیم بەند کراوە
بە سنووری ئەو برژانگەی کە خەوی تیادا شکاوە
ڕاستە ئەڵێن لە جیاتی نوقڵانەی جەژنە
لکی داری بەڕووی شاخی کوردستانت بۆم هێناوە

## بۆ لانە

● صباح اسعد نجم ●
کویسنجق

لەو ڕۆژەی تۆ کە هەنگاوت بۆ ڕووی دونیا هەڵێناوە
وێنەی جوانیت لە ئەلبوومی دڵی مندا لەبەر چاوە ..!
پەری ئاسمان لە جوانیتا ، لە ڕووتا واقی وڕماوە
قژی زێڕینی هونراوە ، خەیاتەی خاوە ئالاوە
برۆو برژۆڵی نەخشاوت ، لە دەوری تیشکی ئەو چاوە
دەڵێی کۆگای دڵی لاوە ، بە بەهرەی خوایی ڕازاوە

● * ● * ●

ئەزانی ئەو نیگایەی تۆ ، کە سیحری خوایی کیسایە
تەرازووی کێشی هۆنراوەم ، لە کێشی جوانی تۆ نایە
بزانە خۆشەویستی تۆم ، لە ژینا بۆتە سەرمایە
بۆیە شێوەی جوانیت وا لە ڕووی ئاوێنەی دڵدایە
نەبینێ چاوی بەد ڕووی تۆ ، بینای تانەی بەسەردایە
هەمیشەجوانە خوا یاربێ ، فریشتەی باش لە گەڵتایە
کەتۆ دیارییت دڵی خۆتە ، دڵی من وا لە دەستتایە

# وەرزێکی دوور لە بەرزاد

« 1 »

بەریزادم
بۆ نازانی من خەڵکی کوێم ،
من مرۆڤی شاری بەفرم !
من دڵداریکی بارانم !
ئەوا وەرزێك تێدەپەڕێ بەسەر دووریت
ئەوا وەرزێك بەسەر دەچێ لە دووری تۆم
لەسەر بەفری ڕێگای نەهات ..
هەڵمداوە هەواری خۆم
کە چاوەڕوان لەشکری عەشقی بارانم ! !

«2»

بۆ نازانی ...
تاف لاویم بەسەر چووە
لەسەر لوتکەی تاریکایی !
دڵدارەکەم زویر بووە ...
لەسەر ماچێکی خودایی ! !
کە هەرشەوێك لە خەیاڵی بیرەوەریمدا دێمەوە
وا دەزانم دیسان لەدایك دەبمەوە .
بۆ نازانی ..
وەلی پێشەنگی کاروانی ڕێگای بەفری ئەم وەرزەیە
سیامەندە هەڵدێراوی چیای سیپان
لەشەوێکی تەڕو تووشدا
پارێزگارم لە هەژاری ئەم ڕێگەیە .

«3»

بۆ نازانی ...
دیسان وەرزێك بەسەرچووە
لە سەختی ڕێی هات و نەهات
لە سەفەری ...
وەرزی پایز ، شەوی خەڵات
بۆ نازانی ..
ئەوا وەرزێك تێپەڕ بووە
لە هەنگاونان بەرەو ترۆپکی تەنیایی
لەسەر لوتکە ڕێدەگرم لە تاریکایی
لەپاشان دەگەڕێمەوە
بۆ باوەشی تاقە دایکم ، داوا دەکەم دیسانەوە
گوێزەبانەم بۆکاتەوە ..

## بۆ هیوا

ئەم جارەشیان نمەی باران سەری هەڵدا !
ئەم جارەشیان بزەی یاران خۆی وەدەردا
ئەم جارەشیان لە دیمەکاری ئەم هەوارە
داری بادەم گوڵی دەردا !
بەڵام گیانە .. توخوا نەکەی !
نەکەی خەرمانەی ئەم جارەت
لەبەر چاوی چاو برسیەکان شەنە باکەی
نەکەی هەگبەی خەمەکانت بێ ئالاکەی
نەکەی دەرخون لە نەهێنی کوپەڵەی دڵ
سەر واڵاکەی ..
ئازیز نەکەی ... هیوا نەکەی ؟
شیرینەکەم
وا تێ نەگەی نەغمەی بولبول ئەو نەغمەیە
لە قەفەزی بەند کراوی بەردەمتایە
بەڵام گیانە لەچەپەریش هەر ئازادی لەدڵ دایە

جەوهەر کەریم ڕەشید

بائیز عمر احمد



# تەخێرە؟

کچکەکا جلك دریای ؛ تژی چاڤا رونـدك ـ سەرێ لێ سەرئەڤرازە . بچویکەکێ پێخاس و سەرو سویما شکەستی ؛ چانتکەکێ تژی چنیێت نانی یێ بملیڤە ـ بدلەکێ کـوزری یێ بەرێ خو ددەتە هندەك بچویکێت مژویل بخاندنێڤە ... (ئەرێ ماچو ویێنێت دی نینن کو دلێ مروڤی پێ ڤەبیت ؟) پشتی من پاریێت چایا خوداین دەرکەتم جەهدا بێدەنگو ڤالایە ، جار پێنگاڤێت بێزەڤەر دهاڤێم ، جارژی خەم و خیالێت ژیانێ من دکەنە سنگو چاڤا لمن زیق دکەن . دەنگەکێ تیژ پەردا گوهێن من تێکداو ئەز ژناڤ کول و کوڤانا دەرێخستم ... !!! ؛ سڤك لێکرفریم .. ؟ (ئەوە ـ کچکا جللك دریایە) هندەك بەزینێ کەلەخێ وێ ژبن توروممبیلێ کێشادەر . من خو خر خوش کر دابنکڤە بچم ، ئێکی ژ پشتڤە جلکێت من گرتن ؛ ئەز لێ زفریم .. !! ئەو بچویکە بسەرو جلکێت خوڤە ، دەستێ خویێ لبەر من ڤەگرتی :ـ (خودێ ژتەرازی بیت ـ عانەکی بدەمن) .. چ بکەم ـ بچم ؟ نەچم ؟ .. پشتی هشك راوستیانا بێهنەکێ ؛ من دەستێ خو بسەریدا ئینا خارو لبەر روینشتم . یاژمن هاتی من تەخسیر نەکر ؛ دەمێ بو من دیار بوی کو شیرەتا مەودایێ خو نینە ، چونکی بەرسڤا پسیاریێت من دا :ـ (ئەز ژ خویشکا خو مـەزنترم . ژیێ من شـەش سالە . بـابێ من یێ هـاتیـە کوشتن ... ؟ !!! . دەیکا من شول دکەت ، بەلێ ئەم پاریێت وێ ددەینە کریا خانی . ئەم دگەرییێن دا نانی بو خوو دەیکا خو پێ بکرین . پا هەکە ئەز چومە بەرخاندنێ ـ کی دێ بو مە نـانی ئینیت .. !!) .

**بو سپێدە ، رێ خوش خو دهاڤێتە بەر من و ئەز رادکێشـام ؛ دەمێ ئـەز راوستیـایم :ـ (وە ... واهـە چ قەرەبالغە لسەر رێ ؟) بنکڤە چووم .. گوتن :ـ (ڤەقیری ژبرسادا خو کوشت) .**

**دپولێدا روینشتم ، سەیدای کاغەزێت تاقیکرنا بوری دانەڤمە :ـ (بـوچی ؟ !! .. ئەز چـو جارا نـەکەتیمـە !!) ببەرێکڤە چوم ، سەرێ من زڤری .. «هەژاری .. کوشتن .. برساتی .. چو ژێ نەهـاتن» پشتی ڤان هـزرو بیرا کـریە بوڤین دسەرێ مندا .. لهە ڤالێ خو زڤریم :ـ**

- **دێ رابم چمە مال .**
- **چەوا ؟ !**
- **دێ چمدا روژەکێ دوا بێهنا خو ڤەدەم .**
- **بەلێ سوباهی مە تاقی کرنا هەی ؟**
- **هەر وەکی شەش دبێژن هەرەڤە ـ دڤێت بچم .**
- **کورو تو هەژاری ـ تویێ هاتیە ڤێـرێدا زوی ڤبابێ خورا بکەهی نەبدویف دلێ خو بکەڤی ... .**

دتورو مبێلێدا گوتی :ـ

- خالو هەروەکی تو گەلەکێ شەپرزە ـ تەخێرە ؟
- نێ نوزا ئەزبەنی ـ ئەز بخوژی نوزانم .
- تە خویشك و برا هەنە ؟
- خویشك و برایەك هەما ئەوەیێ بسەر پیاکەتین .
- بابێ تەیێ ساخە ؟
- بەلێ .
- خودێ بوهەوە بهێلیت .

ئێڤاریەکا زوی بو ، کولومتێت چیا ژ دویرڤە خوەیا بون ، وا بەتەنا کەسك دکر ژ داروبارو گل وگیا ، ئەو ئاڤ پێدا دهاتە خار یاکو ئەسمانی رەنگێت خوتێدا ددیتن . من چو جارا باژێرێ خو هوسـا رەنگین نـەدیتبو ، ژبـەر هندی هـەما چـاڤێت من مانەپێڤە .

لکولانا نێزیك مالا مە سەکنیم ـ هەروەکی نەئەو باژێرێ بەری نوکە .. ژبەر گومین و حرین و نرینا ، سەب ئەزمانێ سەی نەدزانی . دناڤ توزو دویمانێرا دەرگهێ مالا مە لتاق دیاربو :ـ (ئەڤە چیە ؟ !!! ـ چو جارا مە هوسا دەرگهێ خو لتاق نەکریە .. !) .

**ڤنـاف دەری کـەتم ؛ تشت ژ دەستێت من کـەتن ، پێ لمن خاڤ بون ، چاڤ زیق بون ـ دەمێ گوتین :ـ (بابێ تە ئەمرێ خودێ کر .) .... ؟؟؟ !!**

1981 — 5 — 3



قـرچەی نیـوەڕۆ کـە بنیـادەمی دەسـووتـانـد .. وەك ڕۆژانی‌تر لە ماڵ هاتیەدەر ، بە چالاکی هەنگاوت دەنا .. کۆڵان‌و شەقامە ماندووەکان بە هێمنی ڕاکشابوون‌و لە خەوێکی قووڵدا شەلاڵ بوون ، منالان بە دەم گەمەو یـاری‌یەوە لە دەروازەی قوتابخانەکەوە وون دەبوون .. مـرواری هیوا لە خـەندەیـان دەڕژا ، کەوتبوویتە نێو دنیایەکی ناسکەوە .. خەندەو قـاقای منالەکان خۆشی‌یان بـە گیانت دەدا .. بیـرت بە لای ئـەوەدا نەدەچوو کە دەبێ دوای چەنـد ساتێکی دی لەبـەر گەرمی‌و هالاوی ئامێرەکاندا بسووتێیت .

ـ ئاسۆئەحمەد ـ

شوباتی 1980

چـەنـد تـابلۆیـەك لەپێشـانگـای شـەقـامـەکـەدا هـەڵواسرابـوون ...کۆمـەڵێك کـرێکار بـە چـوستی تـاسـە چیمەنتۆیان لە سەر شان دەناو چۆڕ چۆڕ ئارەقەیان لێدەتکا .. لە ژێر لێویشەوە بە نەرمی قەتاریان دەچڕی . ئێرکـۆندێشنی خانووە بەرزەکان لە گەڕدا بوون .

کیـژێك لە سـەر بانیـژەی مـاڵێـك ڕاوەستـابـوو .. لاوێـك لە دامێنی‌یەوە .. لە سەر شەقامەکەوە قسەی لە گەڵ دەکـرد . منالێك لە پەنا دیوارێکدا تروشکەی کردبوو .. بە دانیشتنەوە خەوی لێکەوتبوو . تۆ هەرگیز گوێت بە ئـاسانی‌و گـرانی کار نەداوە .. شانت وەبەر گشت کارێکی گران داوە ..

لە ژێر تاشە بەردەکانی سەر شانتدا نقەت نەکردووە ، بەلام هەرگیز ناتوانیت لە ئاست جوێن‌و بۆڵەی خاوەن کاراندا بێ دەنگ بیت .. هەربۆیەش گەلێك جۆرەکارت کردۆتە پیشە .. کوڵ هەڵگری .. توونچێتی .. کرێکاری ... هەموو شەکەتی‌و ڕەنجێکێشت بۆ گری سۆپەیەکی نەوتە لە کرێوەو تۆفاندا بە فریادتان بگا .. بۆ ئەوەی منالەکانی تریشت وەك هیوایـان لێ نەیەت ، ئای لەو مەرگە ساتانەی هیوات دێتەوەیاد .. بیرلەو بەیانی‌یە بەفرانبارە دەکەیتەوە کەهیوا لە سەرمادا .. لەژوورە بێ پـەنجـەرەکـەداو لە ژێـر لێفـە شـرەکـەی‌دا بـە دەم نەخۆشی‌یەکەیەوە ڕەق هەلاتبوو .. لاشەیـەکی ساردو سـڕو بێ‌گیان .. پارچە سەهۆڵێك‌بوو ، بە سەر دەستەکانتەوە شـل ببوو .. ڕەنج‌و هیوای هەشت ساڵت وەك هەناسەیـەك لەدەم هاتەدەرو تێکەڵ تەمە چرەکان‌بوو ، فرمێسکە گەرمەکـانت بە سەر کوڵە ساردو سپی داگەڕاوەکانی‌دا دەتکان ، گەرەکت‌بوو لاشە بەستووەکەی هیوا بە کۆڵان‌و شەقامەکان ـ دا بگێڕیت‌و نیشانی خەلکی بدەیت‌و ئاگاداریان بکـەیت نەبـادا ـ هیوا ـ کانی ئەوانیش بەو دەردەبچن !

بە ئاگا هاتیەوە .. بێویستی خۆت دوو تنۆك فرمێسك بە کوڵەکانت دابەرەو خوار کشان ، گەرە لاوژێیەك لای کارگەوە سەرنجەکانتی بۆ لای خۆی کێش کرد ، خۆت بۆ کوتا .. گەیشتیت ، لە کەندەڵانێکی قەراخ ڕێگاکەدا لۆرییەك سەربەرەو خوار گیرسابۆوە .. تایەکانی ڕوویان لە ئاسمان بوو .. بەلام هێندە زیانی نەهێنابوو ، درت بە خەڵکەکەدا .. چوویتە پێشەوە ، جەستەی چەند حەماڵێك بە سەر کیسە چیمەنتۆی دڕاوو نیوە بە تاڵەوە کەلەکەبووبوو .. خوێنیان پەلە پەلە چیمەنتۆکەی مەیاندبوو ، پەیتا پەیتا ئوتومبیلی سەوزو سوور بە خێرایی تێ دەپەڕینو لاشەکانیش چاوەڕێی دەستێك بوون ساتێك زووتر بە فریادیان بگا .. بەرلەوەی دوا هەناسە بدەن ، خاوەن لۆرییەکەش کەفو ڕستەیەکی چەراند ... چیمەنتۆکەش هیچی نەما .

بە کوڵێك خەمی گرانو ژانی بە سوێوە لۆریو خەڵکەکەو جەستەی سەختی حەماڵەکانت جێهێشتو قاچەکانت بە دوای خۆتدا کێش کرد .. بەسستی هەنگاوت دەنا .. لەبەر دەروازەی کارگەدا هەواڵیان پێدایت ...

- بەڕێوەبەر ناردوویەتی بە شوێنتا .
- بەڕێوەبەر ؟! نازانیت بۆچی ؟
- نازانم ، خێر دەبێ ئینشەڵڵا !

بیرت وەك شارە زەردەواڵە وڕووژا .. بەڕێوەبەر بە خۆرایی نانێرێ بەشوێن کەسدا .. « بەڕێوەبەر بانگم دەکا ؟! سەیرە .. چی لێم دەوێ ؟ تۆ بڵێیت بۆمەسەلەی عەلاوەکەبێت ؟! »

منداڵەکانت دەبینی لە دەوری سۆپەکە خڕ ببوونەوە .. لە گەرمادا کوڵەکانیان سوور هەڵگەڕابوون .

« نا .. بڕوا ناکەم ، هەرگیز بەڕێوەبەر بۆشتیوا بانگم ناکات .. هەرچییەك بێ .. تەنیا لە شەڕی ئەوزلەمە بە دوور بم هیچم ناوێ »

بەرەو ژووری بەڕێوەبەر پەلت کوتا .. هەزارو یەك غایەلەی سەیر بە مێشکتدا دەهاتن ، لە بەر دەرگا چاوەڕێت کرد ، دوای ماوەیەك دوو دڵیو ترس .. ڕێتدرا ، چوویتە ژووری .. سلاوت کرد .. وەلام نەبوو ، لای دەرگاکەوە ڕاوەستایت .

- قوربان داوای منتان کردبوو .. خێرە ؟
- بۆ خێرماوە ؟
- بۆچی گەورەم ؟!
- دوێنێ چ کەتنێکت کردووە ؟
- هیچم نەکردووە .. چی ڕوویداوە ؟
- دوێنێ شوڤلێك شکاوە .. گوایە ئاگادارنیت ؟
- بەڵێ ئاگادارم !
- دانی پێدادەنێیت کە بە دەستی تۆوە شکاوە ؟
- بەڵێ .. بەلام گوناهی من نەبوو .
- ئەی هی کێبوو ؟
- گوناهی کاك سەردار بوو .
- دەمتداخە .. هەی جنۆکە ، بۆ ئێمە ئەوەندە ساویلکەین تابەتۆوەڵ خەڵەتێین ؟
- ئاخرئەمەڕاستییە .. ئەو بەردەی کاك سەردار ووتی هەڵیکەنە ..من دەمزانی بەدوو شوفلێش هەڵناکەنرێ .. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانم سەرپێچی فەرمانەکانتان بکەم .

بیبڕەوە .. هەی نارەسەن ، چەند دەمی گەرمە .. دەتەوێ تاوانەکە بخەیتە ئەستۆی پسپۆڕێکی وەك کاك سەردار ؟ هەیسپلە .. ئەوە بڕیاریشمان داهەقی چاك کردنەوەکەی بەتۆبدەین .. لەبەر ئەوەش کەناتوانیت هەمووی بەجارێك بدەیت ، هەرمانگێك (40) دینار لەمووچەکەت دەبڕین .. یەڵڵا بڕۆ دەرەوە . خەمەکانت گەورەتر بوون .. ئاگری قین لەناختدا کڵپەی کرد ، هاتیە دەرەوەو بەتوندی دەرگاکەت بە ڕووی بەڕێوەبەردا خڕ داخست .. گوڵی هیواکەت وەریو بەناخی زەویدا ڕۆچوو .. تالەگەڵ نمەی بارانو شنەی بەهاردا دیسان چووزەرە بکاتەوە . / منداڵەکانت بینی لە دەوری سۆپەکە خڕ ببوونەوە .. لە هیکرا سۆپەکە وەك سیحری لێکرابێ .. لە چاو ونبوو ، منداڵەکان لە سەرمادا هەڵ لەرزینەوە .. فرمێسك لە چاوەکانیانەوە ڕێچکەی دەبەستو بە کوڵەکانیانەوە دەبووە چلوورە ، جەستەیان دەبووە پارچە سەهۆڵو کەچی دڵیان هەرگەرمبوو .. / .

# هیرۆشیما

نووسینی : فرج ماکسیم
وەرگێڕانی : خالد دلێر

ئەم شانۆگەرییە یەك پەردەییە (هیـرۆشیما) کـە لە نووسینی [فرج ماکسیم]ی میسرییە ، لە گۆڤـاری [الطليعة الأدبية]ەی ژمارە (9)ی تایبەتی بۆ شانۆ ، ساڵی شەشەمی ، ئەیلوولی 1980دا بڵاوکراوەتەوە ، لەسـەر داوای دوو قوتـابی ئامادەییو بۆ سوودی گشتیش وەرم گێڕایە کوردی .

دیمەن :ـ

هۆڵێکی چاوەڕوانی کـردن لە نەخـۆشخانـەیەکـدا ... هـەندێ کـورسـی ... چـەنـد مێـزێـك ... لەسـەر دیـواری بـەرامبەریـان ، تـابلۆیـەکی گـەورەی شێـواوەکـانی شـەڕ هەڵواسراوەکە لەژێریدا نووسراوە «درۆینەی شەڕ» لە تەنیشت تابلۆکەوە ، پەنجەرەیەك کە بەسەر هەندێ کەلاوەو بۆشاییدا دەڕوانێت . لەلای چەپیشەوە ، تابلۆیەکی تـرهەیـە ، چـەنـد کۆمەڵێکی پەرێشانی ، سەرلێشێواوی تۆقیو دەنوێنی ، کە لە ژێرێریدا نووسراوە : «ئەی هیرۆشیما ... کوان ڕۆڵەکانت» . لە ژێر ئەم تابلۆیەدا ... لەسەر یەکێك لە کورسییەکان [هیراتۆ]ی ڕاوکـەر ، بێدەنگ پـاڵی لێداوەتـەوە ، کە پیـاوێکی یـابـانی بەساڵاچـووە ، جلو بـەرگێکی کۆنی ، ڕەنـگ چووەی پـاکی لەبـەردایە ، لە چاوەکانیدا سـەختی ئەشکـەنجەو قـووڵی دڵشکاندن بەدی دەکرێ . لەبەرپێی ئەمدا ، لەسەر زەوی [سو]ی خێزانی بە جلو بەرگێکی نەتـەوایەتی «کۆمینۆ» وە دانیشتووە ، لە چاوەکانیدا ، پەلەکردنو ئارەزوو دەبیندرێ بۆ دیتنی شتێکی وەك خەون . هەندێ «خابرین پێچ»[1] بە ناو ئەو دەرگانەدا دێنو دەچن کە بۆ ناو نەخۆشخانەکە کراونەتەوەو داڵدە خانەیەکی ئەو منداڵانەش لەناو نەخۆشخانەکەدا هەیە کە لە ئەنجامی کارەساتەکانی هیرۆشیماو ناگازاکی دابێ خێر بوون[2] . [سو] وەك چـاوەڕوانی کەرێـك ، چاوی لە خـابرین پێچەکانە .

(خا برین پێچێك دەچێتە هۆڵەکەوەو بەرەو ڕووی «هیرا» دەچێ)

**خابرین پێچ** : منداڵێکتان لێ وون بووەو هاتوون بیدۆزنەوە ؟

**هیـرا** : بەڵێ ... لە کـورەکەمـان دەگەڕێـین . بلیتێکیشمـان نووسیوە ، هەموو ناوونیشانەکانی کورەکەی تێدایە .

**خابرین پێچ** : لێرە چـاوەڕوان بن ... بوذا یـارمەتی هـەموو لایـەك بدات . (دەست بـە ڕۆیشتن دەکات ، پـاشـان ڕادەوەسـتێتو سـەیـرێکـیان دەکاتەوە .) .

بۆگەڕانەکە ماوەیەکی پێدەچێت . منداڵەکان زۆرنو گەڕانیش لە ناویاندا دژوارە . دان بە خۆداگرتن شتێکی جوانە .

**هیرا** : پێنج ساڵی ڕەبە قە دان بەخۆدا گرتن ئازارمان دەداو ئێمـەش هەر بـە شوێنیـدا دەگـەڕێـینو چـاوەڕوانی دەکەین .

**خا برین پێچ** : ئارامگرتن لە بوذا نزیکمان دەکاتەوە

(خا برین پێچەکە دەچێتـە دەرەوەو بێدەنگی هەردووکیان و خەمناکی هیرا دادەگرێ) .

**سو** : هیراتۆ .... خۆشەویستەکەم بۆچی هیـوا بڕاویت ؟ لە قسەکردنو لە منیش مانتگرتووە . کەی مانگرتنەکەت دەشکێنیت ؟

**هیرا** : مانم لە هەموو ئەم جیهانـە گرتـووە کە دوژمنـایەتیم دەکات .

**سو** : بە پشتیوانی بوذا ئاشت دەبنەوە . خوداوەند زیافەتێکی ئاولەدەم هێنەرمان بۆ ئامادە دەکات .

**هیرا** : (بەگاڵتە پێکردنەوە) وەك ئـەوەی کە بـۆ هیرۆشیمـا ئامادەکرا .

**سو** : (بە ترسو ڕاچڵەکینەوە) نا ... بێدەنگبە ... تکات لێ دەکەم ... بەم پەستییەوە قسە مەکە ، نەوەکا ئارامی خوداوەند تێکبدەیت .

**هیرا** : (بەتوندییەوە) هیچ شتێـك ئارام لە خـوداوەند تێـك نادات ... سو ... کەی تێدەگەی ؟

**سو** : هێزی شەڕانیو سامناك هەڵیان خەڵەتاندووی . پەچەی مردنیان بەسەر چاو داداوی . جا ئەگەر بـوذا گوێی لێتبێ ، قـورم بەسـەر چیبکەم . بـەزەیی پێمـانـدا نایەتەوە . نایەڵێ لە خەویشدا چاومان بەکورەکەمـان بکەوێتەوە . تەنانەت لەو دنیاش . ماڵی وێرانم لەدەست تورەیی بوذا .

**هیرا** : پێم ناڵێی ؟ ئەو گوێی لە ترپەی پێی هەنگاوی بیروڕا کانمانـە کەجـارێ هەر لەنـاو مێشکمـانـدا هاتو چـۆ دەکەن ، بۆچی ئاگای لەوە نەبوو کـەخانـەی خۆیـان هەموو لە هیرۆشیما وێرانکردو ناگازاکییـان کرد بـە تەنوورێك لەشی هەموو ئەوانەیان تێدا برژاند کە ئەویان خۆش دەویست .

**سو** : (دەست بۆدەمی دەبات ، بەگریانەوە دەپاڕێتـەوە) ...

دەنگت ... وەك ئاگرێكی سووتێنەرو وێرانكەر بەرزبۆتەوە ... وەك ... بۆمبا .

**هیرا** : بەڵێ ـــ ئەی سۆ ... وەك بۆمبا .

**سۆ** : تووبی خواونیشتمان ... تووبی میكادۆ لە كەولی خۆت دەرمەهۆ . خواحافیزیمان لێ مەكە . نامدەتوانی شێوەی ڕووی خۆم بگۆڕم و نە درێژی بەژن و بالام . ناتوانی ناتوانم بەوەی تۆ دەی لێی بڕوابكەم .
(سۆ بەسەر هیرادا دەچەمێتەوە)
گوێم لێبگرە ، بهێڵە سنگت بشێلم ، ئەو لەشەی لە دەوری دلتدا ، وەك پشتی كیسەڵ ڕەقت كردووە ، لێگەڕێ با خاو بێتەوە ، گەرمداهاتووە ، گیانت لە تاویدا ئازار ئەچێژێ ، دەڵێی بەبێ ئەوشاخانە ، نارەحەتی .

**هیرا** : نەخێر خۆشەویستم ، گەرم دانەهاتووە ، بەڵكوو مردووە . ئەو كاتەی شەیتانتان بەسەر هیرۆشیمادا بەردایەوە ، من لەوێ بووم . دەزانم ... لە ناو دڵما جێگیربووە . بەڵێ لەگیانی مندا تۆوی مرد ن رواوە ، ئەو تۆوەش بەرە بەرە گەشە دەكات و پەرە دەستێنێ ، بەلام گرەوم لێ دەباتەوە ، گەورەو زل دەبێ ، نینۆكەكانی لە دەروونم دەچەقێنێ ، ڕیشەم دەردێنێ ، هەروەك ڕیشەی ئەو چەند ملیۆن كەسەیان دەركێشا ، لە دەوروبەری پەرستگاكانی بوزادا بوون و كتێب و قسە نەستەقەكانی ئەوی لێبوون .

**سۆ** : ئەو دەبینێ ... گەورەیە ... بەلام ئێمە بچوكینی ، ئەو بەزەیی بە بێدەسەلاتیمان دا وێتەوە ، بۆیە وامان لێناكا كە ئەو هەمووشتە تێبگەین . بەلام ئەو هەموو شتێك لە جیاتی ئێمە دەزانێ .

**هیرا** : زانینی ئەو چ كەلكی ئێمەی تێدابووە ؟

**سۆ** : گوێبگرە ، گوێبگرە ، چیرۆكێكت بۆ دەگێڕمەوە .
(بەكارتێ كراوی یەوە دەیگێڕێتەوە) :-
هەزاران سال لەمەوبەر بوزای مەزن ، ڕێگەی ڕاستی نیشانی خەڵكی بەهەلە چووددا دەدا ، كە خەڵك بەجێیان هێشت ، مەیموونێكی بچووك هاتە لای و پێی ووت :-
ئەگەر ڕاستە تۆ مەزنی وابكە كە من هەموو جیهان لە چاو تروكانێكدا ببینم ... بوزا ... لە پێدەستی ڕاخستو مەیموونەكەی هەلگرت .. مەیموونەكە لە خۆشیانا ، لەسەر نینۆكی پەنجەكانی بوزا وە هەڵسایە سەرپێ و دەیەویست بە دەوری پەنجەكانیدا بسوڕێتەوەو لە كوێ هەرپەنجەیە كۆتایی دێت . پاشان دەستیكرد بە خۆنقوم كردن لەناو ئارەقەی ناو خەتەكانی لەپە دەستەكەدا كە بوزا هێنایە خوارەوە لێی پرسی ی چیت دی ؟ .
مەیموونەكە ووتی : وولاتێكی زەوی فراوان و دەشتێكی زۆرو چیای وەهام دی كەچاو دووری یەكەی نابینێت . كۆلەكەی وەهام بینی كە بەدەیان سالی دەوێ هەتالە چوار دەوریا بسوڕێیتەوە وەپێ پلكەی بەرزمەدی كەكۆتایی یەكەی دیار نی یەو زۆری نەمابوو لە دەریا تێكەل بووەكاندا نوقوم ببم .

**هیرا** : ئاخر من مەیموون نیم «سۆ» .

**سۆ** : بەڵێ وایە . بەلام زۆر جار وەها بیر دەكەیتەوە .

**هیرا** : بەلام من .. هەر هیچ بیرناكەمەوە . بیركردنەوە بازرگانی یەكی بێ قازانجە . هەموو شتێك لەبەرچاوم كۆتایی هاتووە . بۆچی بیربكەمەوە . ئەی سۆ ، من بەچاوی خۆمدیم ، تۆ سەردانی خوشكت دەكرد لە تۆكیۆ ، لەبەر ئەوە ناتوانی لەوەتێ بگەی كە لە هیرۆشیما ڕوویدا ... من خۆم لەوێ بووم ، من و «ساسۆ»ی كوڕمان . خۆم لە گەرووە كەداراوم دەكرد كە ئاو نوقومی كردم و ساسۆش لە كەناری دەریاكە ئاگای لەڕاوەكە بوو .

**سۆ** : (دەلەرزێ) ... سا ... سۆی جوان .

**هیرا** : (بەردەوامە) .. لە ناكاو گوێم لە دەنگێكی گەورەبوو . بەندی دلی پچراندم (لەدواوە ، لەگەل گێرانەوەی چیرۆكەكەی هیرادا فیلیمێك نیشان دەدرێ ، هەموو شێوەكانی وێرانكردن دەنوێنێ كە لە جیهاندا ڕووی داوە . بە سووتاندنی ڕۆما دەست پێدەكات ... سووتاندنی هیرۆشیما ... هەتا مزگەوتی گەورەی قودس)
دیتم لافاو لە دەریاكەوە هەڵسا ، ئاو دەكولا . خانووە دوورەكان بە سەرسەری منەوە دەفرین ، پاشان دەكەوتنە خوارەوە دەبوون بە خۆلەمێش . تەنانەت پەلەوەرەكانی هیرۆشیما لە ئاسمان دەسووتان و

دەکـەوتنـە خـوارەوە . مـاسی مـردوو رووی ئـاوی داپۆشیبوو . مردن بەبێ دەنگی یەکی پیلان گێرانە لەم سـەرو ئەوسـە ری شارەکـە تێپەڕیبـوو . بارگـرانی تاوانەکانی مرۆڤ ئەی هیرۆشیما هەمووی بۆتۆ هاتـە خوارەوە . سنگی ووردو خاش کـردی . بەلام جیهـان هەستی بە ئازارێك نەکرد .

(هیراتی دەنگ دەبێ و سو دەڵێ ... ئێ ی) .

**سو** : ئەی ساسۆ ... ساسۆ لە کوێیە ؟

**هیرا** : لە پاش چەند رۆژێك کە بەئاگا هاتمەوە ، شارەکەم وەك کە سە سەر رێك هاتە بەرچاو کە قورسایی یەکی گەورەیان پێدا دابێ ئێسقانەکانی ووردو خـاش بووبێ و مێشـك پەرِی بێت و لەگەڵ خوێن و ئێسقانی ووردو خاش بوودا تێکەڵ بووبێت ... لە شارەکەدا گیاندارێك نەمـابوو . وەخت بوو شێت بم . هەمـوو بووبـوون بە خـەڵووز . ئەوانەش کە لە مردن رزگاربووبوون ، شالاوو بای ئاگر شێواندبوونی . ئەوانەی تووشی زیـانە هـەرەکەمـەکە بووبوون ، ئەوانەبوون کە تیشکی درندەکە بە لەشیاندا چووبوو لە ناویاندا بووبوو بەهەوێنی مەرگ و یەك بە یەك لە ناویان دەبات . من یەکێکم لەوانە ئەی «سو» جارێ نۆرەم نەهاتووە . پێنج سالی رەبەقە وامن چاوەڕوانی ئەو نۆرەهاتنە دەکەم . لەگەڵ هەموو لە دەرگا دانێکدا خۆمی بۆ ئامادەکەم ... بەلام تـۆ چاوەڕوانی سـاسۆ دەکەیت . هەموو رۆژێك بۆ پشکنینی بۆ هەموو خاکی یابان رام دەکێشیت ... خۆمان بهاوێینە هـەموو ژێـر زەمین و پەناگایەك بۆ ئەوەی لە ساسۆ بگەڕێین .

(لە بـەر ئـازاری خـۆی رادەپـەڕێت لە سـو دوور دەکەوێتەوە)

بۆچی لە ژێر گردۆڵکە خەڵووزو وێرانەکانی شاردا بۆی نەگەڕێین ؟

**سو** : (بە داچلەکینێکی شێتانەوە) ... نا ... ئەوماوە .

**هیـرا** : زیندوە ؟ ... بـۆچی هەر تـەنیا ئـەو ... ئـایا ئـەو دەسگیرانی یەکێك لە کچەکانی خوداوەندە ؟

**هیرا** : بەڵێ ماوە .. هیچی لێ روونەداوە ... نا ... نە پێستی سووتاوە . نە چاوێکی دەرپەڕیوەو نە قاچێکی بۆدەرەوە گێربووە ، گۆشتی سووتـاوە ونە ئێسقـانی رەش وەك قەتران دەرکەوتوون و نەو ... نە .

**سـو** : (خۆی پێ نـاگیرێ . بـەلام بە هـەمـان دەنگی نـزم قسەدەکات) ئەو زیندوە ... ساسۆ زیندوە و ئەژێ .... بـە هەمـان جوانی یـەکەی جـارانی یـەوە ، رووەگـە شەکەیـەوە ... چاوە پێکـەنینەکانی ... قـژە رەشە ، نـەرمـە ، پـرەکـەی و ددانـە سـپـی یـە وەك مرواری یەکانیەو .

**هیـرا** : بەڵێ ... بـەڵێ ... لە ئاسمـان لە باخی بـوذا دا گوڵ ئەچنێ .

**سو** : لە باخی بوذا نا ... بە ڵکوو لەسەر زەوی .

**هیرا** : (بەگاڵتە پێکردنەوە) ... هەندێـك دەڵێن ... ئاشتی و هێمنی لە سەرزەوی یە .. بەلام ئەمە درۆیە[3] .

**سو** : ئەو هەیە ... بەلام ئێمە نایبینین .. هەر کاتێ دۆزیمانەوە بە بیرت دەهێنمەوە .. مرۆڤ دەبینی ماوەیەکی زۆر لە شتێك دەگەڕێ و نایدۆزێتەوە ... پاش ئـەوەی مانـدوو شەکەت دەبێ ، لە ناکاو دەبینێ وابـەتەواوی ، بـەبێ توێکڵ لەبەردەمیایـەتی . هەمـوو شتێك رووت و بـەبێ توێکڵە ، بەلام ئێمە چاومان بە ستراوەتەوە .

**هیـرا** : (فکری رۆیشتـووە) دەڵێن ئەوان وێنـەی ئافـرەتێکی رووتیان لەسەر بۆمباکە کردبوو .

**سو** : لەپاش سـووتانـەکە ، هـەموویـان بوون بـە ئافـرەتی سەربەست . با لەکاتی نوێژەکانماندا بەزەیی مان پێدا بێتەوە بۆیان .

**هیرا** : بەڵکوو بەسەر هەموو جیهاندا زاڵ بوون . ئەوان گەورە دەبن و گەورە دەبن ... وەك نەخۆشی شێرپەنجە لە لەشی جیهاندا ... وای لێ دێ جێگایەکمان بەدەستەوە نامێنێ نوێژی تێدا بکەین .

**سو** : دەی با نوێژ بکەین ... نوێژی هەمە رۆژە[4] .

**هیرا** : ئەوە پێنج سالە ئێمە نوێژی هەمە رۆژە دەکەین

**سو** : تۆ دڵسۆزنیت لەگەڵ ئارەزلوداو بە رووناکی ی پارانەوە ناسووتێی ، بۆیە موعجیزەکە نایەتە دی .

**هیرا** : ئا بەم جۆرە خەیاڵ گاڵتەت پێ دەکا . ئەمـەتا خـۆت هـەموو رۆژێـك بە دڵو بـەگیـان دەسـووتێیت ، چ موعجیزەیەك هاتەدی ؟

**سو** : لە پێناوی خۆمدا لێتان دەپاڕێمەوە ئەی گەورەی باوك .

بام مێشکتان وەك ئاسمانی دوای باران بێ گەردبێ . وەك خەیاڵ بەربڵاوبێو وەك خۆشەویستی پاك بێو وەك ڕاستی پرشنگدار بێو ... لە دواییدا بە هێمنیو بە بێ دەنگی بیری لێبکەرەوەو بیر لە ساسۆ بکەرەوە . هەر کاتێك دوو ئەقڵی دڵسۆز بە یەکەوە بیر لە شتێك بکەنەوە ، ئەو شتە دێتەدی .

**هێرا** : پێنج ساڵە ئەی سو ... پێنج ساڵ ، ئێمە هەموو ڕۆژێك بەم شێوەیە ، وەك لۆکەی تەرکراو دادەنیشین ، لە ناخمانەوە وێنەی ساسۆی جوان دێنینەوە بەرچاومان ، بە دەستی خۆمان چاو بەستەکێ لە دڵمان دەکەین ، لە ناو بێدەنگیو تاریکیدا ، خەیاڵات وەك دەعبا تێکمان دەشکێنێ ، لەناو تەمدا دەژین . لەگەڵ وێنەکانی جارانی ساسۆ ، دەنگە بە سۆزەکەی ، ووشە بچووكو کەمەکانی ، جلکە ڕەنگاو ڕەنگەکانیو جووڵانەوە ڕێكو پێکەکانیدا دەژین . دەی هێنینەوە بەرچاو ، لەناو ئەو خەیاڵە شێتانەدا ژیان بەسەر دەبەین ، لە تاریکی ئەم لە هۆش خۆچوونەدا .. لە ناکاو دەنگی تێك چووی تۆبەرز دەبێتەوە ، باس دەکەی کە چۆن ساسۆ بە چاوە تەلیسماوییەکانی خۆت دەبینیتو چۆن جلکی خۆتو ساسۆ دادەکەنیتو بە خۆتیەوە دەنووسێنیت .

[سووەك خەوتوویەك ڕوو لە گۆشەیەك دەکاو لە شێوەی نوێژکردن کڕنووش دەباو وەها دەردەکەوێ کە گیانی خۆی کۆ کردبێتەوەو نوقومی خەیاڵاتی دەروێشانە بووبێتو هەست بە جیهان نەکات . لە دواشەوە فیلمێك هەندێ دیمەنی مرۆڤایەتی بەختیار ، خانوو بەرە ، گوڵ ، چۆلەکە ، منداڵی کامەران ، نیشان دەدا ، لەگەڵ ڕۆیشتنیدا بەدەم خەیالەوە ، بە دەنگێکی قووڵی کاریگەر قسە دەکاتو جاروبار هەناسەی خۆشییەکی وەها زۆر هەڵدەکێشێت هەر وەك بڵێی لە جیهانێکی دیکەوەبێ] .

**سو** : ساسۆ ... خۆشەویستەکەم ، واگەڕایتەوە ... وەرە ... بچۆرە ناو دڵی دایکتەوە ... باقڕت ... نێوچەوانت ، چاوەکانت ، کوڵەکانت ماچ بکەم ... با جارێکی تریش تۆم ببێتەوە ، بەگەرمی باوەشم تێوەربێنە .

[ڕووناکی شانۆکە کز دەبێو تەمی لێدێ . لە قوولاییەوە منداڵێکی پێنج ساڵی زۆر جوانی قژ ڕەشی چاو گەورە دێتە دەرەوە ، بە هەنگاوی ڕێكو پێك دێتە پێشەوە ، هەر وەك بفڕێ ، یان سەمای بالیە بکات ، خۆی دەهاوێتە کۆشی سووی دایکیەوەو زۆربەی لەشی لەناو کۆشی دایکیدا وون دەبێ ، سو بە دەنگێکی مۆسیقەیی پڕ لە ئارەزووەوە قسەی لەگەڵ دەکات ، لە پشتەوە شمشاڵێك ئاوازێکی بە سۆز لێدەدا] .

**سو** : ساسۆ گیان ... خۆشەویستەکەم
**ئەی لاوەکەم** ... ئەی دایکەکەم
زۆر درەنگ گەڕایتەوە لام

**دەنگی ساسۆ** : دایکە گیان ... سو
**بم بورە**
لەو باخانەدا ئاهەنگێك بۆلۆرد سازکرابوو ...
لەوێ بانگ کرابووم لەناو گوڵاندا دەرۆیشتم
لە کاتێکدا سروشت خەوی دەبینی
من کە خەیاڵی یاسەمیندا بووم
بۆنە خۆشەکانی ، زەعفەران ، دەستیان گرتمو ڕێ نیشاندەرم بوون لەدەرگای گوڵە هەنارمدا
بۆنە ساواو ناسکەکان دەرگایان بۆکردمەوە .
پاشان ، باڵیان دامێ تا بفڕم
بە خۆم ووت
بۆ ڕۆژ هەڵهاتن دەمێنم
ئەو کاتەی دایکم دەرگامان دەکاتەوەو بانگم دەکا
لەناو گوڵاندا خۆمی لێ دەشارمەوە .

**سو** : ساسۆ .. ساسۆ

**دەنگی ساسۆ** : گوڵاو لە گوڵ دەگرم
لەسەر قاچی ئەوان بەرەو ڕوویان دەچم
لە گرانایی یە ، کەمەکەی خۆم ڕزگار دەبم
بەڕیزگرتنەوە دەڵێم :
دایکە زووکە بە گوڵاو خۆت بشۆ

**سو** : (بەمەستییەکەوە) ئەی تاقانەکەم . گیان گەڕایەوە ناو درەختی دڵم تۆ وەکوو گیان ، تاکە یەکێکیت .

[سو ، خەریك دەبێ تارمایی ساسۆ وەك جاری پێشوو بگرێتە باوەشەوە ... بەلام لەدەستی دەردەچێ و بە هەنگاوە شێوە فرینەکانی بۆ دواوە دەگەرێتەوە] .

**هیرا** : (قسە لەگەڵ خۆیدا دەکا)
هـە میشە ، لە پاش ئەو ماوە لە خەیاڵ ژیانـەدا ، دەکـەویت و وەك کۆلەکـەی پەرستگاکانی هیـرۆشیما دەچیتەوە پاڵ یەك و دەکەویتە کوڵی گریانێکی وەهـا ، هەروەك تۆ «ایزیس» بیت و بەوی (نیل) یك بەفرمێسك هەڵسێنیت .

**سو** : (هەڵدەستێتە سەرپێ ، لە بەرسەر لێشێواوی خۆی هاواردەکا) ساسۆ

**هیرا** : (دڵی دەداتەوە) سو ... ئەی سو ... تازە لەگەڵتدا دانەبوو ؟ ئەی کەوابوو ، بۆ دەگری ؟

**سو** : (هەروەك لە خەوێك ووشیار بووبێتەوە)
من لە خۆشیان دەگریم .. ئەی هیراتۆ .

**هیرا** : چەند تاڵە ئەو خۆشیەی بمانگرێنێ ... کتێب هەڵیان خەڵەتاندوویی ... بروام پێبکە ئەوەی دەمان گرێنێ ئەقڵە ، کە دەزانێ هەندێ شت هەیە هەرگیز نایەتـە دەستەوە ... ئاژەڵەکان چونکە ئەقلیان نی یە ناگرین .

**سو** : (هەروەك شتێکی گرنگی دۆزیبێتەوە) ... تۆ نەتدی ... تۆ نوێژت بۆ هاتنی نەکرد . تۆ بروات بە بوونی نی یە ، لەبەر ئەمە ئەویش نایەت .

**هیرا** : گەلێـك لەیەك دوور کـەوتووینـەتەوە .. ئـەی سو .. وادیارە ئاگری هیرۆشیما ئەقڵی من و هەموو ئەو کتێبە کۆنانەی خواردبێ کە لە ناویدا هەبوون ، هەروەکـوو چـۆن گیان و کـورەکەمی سـووتانـد من بەبێ پـەناو پەسێوم . گیانم لە کەلاوەکانی جیهان رادەکشێت .

**سو** : ئای کە ئەت بینی .. وەك خەون جوان‌بوو ، وەك بیری فریشتە ناسك و تەنك‌بوو ... هەموو ماتەمی یەکت لەبیر دەچووە .

**هیرا** : ئەی تۆ بۆ ماتەمی یەکەت لە یاد دەرناچێ ؟ ئەمە تادەی بینیی ، هەموو رۆژێك ، هەمـوو چاوتـروکانێـك ، بە دڵێکی گـەرمی ئـارەزوو دارەوە بـە ئـەقڵێکی پـر لە خـۆشەویستی پـرشنگدارەوە .. لات وایـە گۆیـا ئەو هەیە ... ئەو لەتۆدا هەیە ... دەی بینی ... هەستی پێ دەکەی ... دەستی لە مل دەکەی ... ئەی بۆچی بەو بوونە ئەفسوونی یە دڵت ئاو ناخواتەوە ... ئەو بوونەی دروستت کردوە .

[خابرین پێچێك دێتە ناوەوە ، ئەم بۆیان دەچەمێتەوە]

**خا برین‌پێچ** : ئێوەن چاوەروانی منداڵەکە دەکەن ؟ .

**هیرا** : بەڵێ . ئێمە باوك و دایکی ئەوین .

**خا برین‌پێچ** : ووتتان لە تەمەنی نۆ ساڵیدایە ؟

**سو** : بەڵێ ... ئەو ساسۆیە .

**خا برین‌پێچ** : لە منداڵێك زیاترمان لەلانی یە کە لەو تەمەنەوە نزیك‌بێ

**هیرا** : ناوی چی‌یە ؟

**سو** : ساسۆ ... ساسۆی جوان .. گوڵی بەیان

**خا برین‌پێچ** : هەرچۆنێ‌بێ ، وابزانم خۆی هیچ شتێك ناڵێ وە ئێمەش زۆری لەبارەیەوە نازانین .

[بۆ هیرا ، بە شێوەی داواکردنی لێبوردنێکی نا ئـاشکرا] گـەورەم خۆت دەیـزانی کە ئـەوان زۆرن ... لە هیرۆشیماو ناگازاکی و شارەکانی دیکەوە کۆمان کردونەتەوە . لە بـەر ئەوە زۆر گرنگیمان بەوە نەداوە کە کارتیان بۆ پر بکەینەوە بـەڵکـوو بـەتـەنـگ مشـوور خـواردنی ، خـواردەمەنی و جل و بەرگ و فێـرکردنیـانەوە بووین .

**هیرا** : باشە ... ئێوە فێریشیان دەکەن .. لەوانەیـە باوکیـان نەیان توانیبێت .

**خا برین‌پێچ** : دەولەت قەرزاریانە .

**هیـرا** : بەڵکـوو هەمـوو جیهان (بـەگەرمی یـەوە) تەنـانەت خواوەندەکانیش .

**خا برین‌پێچ** : ئەمە راستە ... پاش تاوێکی دی ئـامادەی دەکەین . ئەگەر خۆی نەبوو ، تکا دەکەم هیوا برار نەبن .

**هیرا** : پێنج ساڵە

**خـا برین‌پێـچ** : هیـرۆشیمـای لاو ، لەپاش سـەدان سـاڵ گەرایەوە .

**سو** : (بە توورەیی یەوە) کوا کورەکەم ، ئێستا چی پێویست بەو هیواو میوایە دەکا ؟ هەر ئێستا بۆمی بێنن لەناو هەزاران

کەسیش دابێ منەهێناسمەوە ،

**هیرا** : بەلام ئەی سۆ ، لەوانەیە بوونی گۆرابێت .. ئێستا گەورەبووە .

**سو** : شتێکی هەیە ، ناگۆڕێت .. نیشانەیەکە لەسەر پێستی ، لەسەر مەمکی ڕاستی‌دا لە نزیک گۆی مەمکە بچکۆلەکەیەوە ، پارچەیەکی خشت پێستی ڕەق هەیە ، موویەکی زۆری زەردی پێوەیە ، هەر وەك بلێی لە پێستی مانگا دەچێت .

**خا برین‌پێچ** : لەوانەیە ... وابزانم دەستە جلکە تازەکەیان لەبەرکردبێت وا دەی هێنم .

[خەریك دەبێت بچێتە دەرەوە .. دوو دڵی دەنوێنێ ... شتێکی لە مێشکدایە لێکی دەداتەوە ... دەگەڕێتەوەو ئاوڕیان لێ دەداتەوە .]

تکام وایە لەبەردەمی دا خۆتان بگرن ئەوەندەی خەڵك لەبەرامبەری نیشانەی سامناك دەردەبڕن ، منداڵەکە ئاڵۆز بووەو وایان لێ کردوو ڕقی لە خەڵك دەبێتەوە .
منداڵەکە شێوەی بە تەواوی شێواوە .
[سو .. ڕادەپەڕێ .. وەك شتێکی پێوەدابێ]

**هیرا** : چی ؟ مەبەستت ئەوە نەبێ کە بلێی وەها شێواوە خەڵك لێی بترسێت .

**خا برین‌پێچ** : منداڵ هەرگیز ترسناك نابن .

**هیرا** : کەواتە بیهێنە

[خا برین‌پێچەکە دەچێتە دەرەوە ... هیرا بە بەزەیی‌و سۆزەوە ئاور لە سو دەداتەوە] . بیتەوە یادت ... زۆر جێگای دی‌ی هەیە تا ئێستا نەچووین بگەڕێین .

**سو** : (بە پاڕانەوەکی جەرگبڕ) ساسۆ هەتا ئێستاش هەر جوانە ... وانی‌یە

[هیرا دەستەکانی سو بە بەزەیی پێداهاتنەوەوە دەخاتە ناو دەستی‌یەوەو بۆ سنگی خۆی دەبات . سو بە قووڵی هەناسە هەڵدەکێشێت . هیرا دەست لە شانی دەداو بەرە پەنجەرەکە دەڕواو پاڵی پێدەداو بەسەر خەمناکی‌یە کوشندەکەی خۆی‌دا زاڵ دەبێ]

**هیرا** : (قسە لەگەڵ خۆی‌دا دەکا)
ئەی چەتە دڕەکان کە حوکمڕانی جیهانی پیاوچاکان دەکەن ... ئەی بۆچی
بەختی من ڕاو دەنێن‌و نانم لێ ژەهراوی دەکەن . ئەی چارە نووسی
زۆرداری سەردەم .
بۆچی ئە ستێرەکانی ئاسمانم لێ دەدزن
لەناو دەستت دا ، دەبینم خەوەکانم دەمرن
وەك چۆلەکە سەر هەڵکەندراوەکان (خۆی پێ ناگیرێت)
ئەی‌چەتەکان
زوڵم‌و زۆریتان ناهێڵێ هاواریش بکەم (سو بە پە لەدەچێ بۆلای)

**سو** : گەورەم ... خۆشەویستم . دەزانم خەمناکی‌یەکەت گەلێ زۆرە بەلام تۆ لەمن بەهێزتری لێم ببورە کە لە کاتی هیوا براویدا ، گومانت لێ دەکەم .

**دەنگی خا برین‌پێچ** : (لە دەرەوە) وەرە خۆشەویستم لەگەڵ مندا بچۆرە ژوورەوە

[خا برین‌پێچ دەردەکەوی‌و منداڵێکی تەمەن نزیك نۆ ساڵی لەگەڵدایە .. بۆی دەچەمێتەوەو بە شێوەیەك قسەی لەگەڵدا دەکا کە ووشەکانی لەوەپێش ئامادە کرابن . منداڵەکە جلکێکی سەیری لەبەردایە ، هەر لەسەریەوە گرتویەتیەوە هەتا دامێنی‌ی]

خۆشەویستم .. گوێ بگرە .. مەترسە .. ئەو کەسانەی لێرەن هەندێ کەسن کەخۆیان لە دڵەوە ئازار دراون ، ئازارت نادەن .

[منداڵەکە وەها سەیری دەکا وەك پرسیاری لێ‌بکا . خا برین‌پێچەکە بە هەندێ بێزاری‌یەوە هەناسەی قووڵ هەڵدەکێشێت . منداڵەکە بەرەو هیراتۆ دەباو لە قسەکردن‌دا دەنگی بەرزدەکاتەوە ، هیراو سو لە جێگای خۆیانەوە ڕەق بوون‌و وەك کە سانێکی

بیر ڕۆیشتو سەیر دەکەن .]
پێم ووتی چی ... هەندێ کەسی باشی لێیە .. ئا ئەمانەن . دەیانەوێ چاویان پێت بکەوێ تۆیان وەك منداڵی خۆیان خۆشدەوێ دەبێ تۆش ئەوانت خۆشبوێ .. تێگەیشتی ی .. ها ... دەتوانی لە قسەکانم بگەیت ؟
[خا برین پێچ ، منداڵەکە لە هیراو سو نزیك دەکاتەوە . سو لە باوەشی هیرادا دەردەپەڕێو بە سەرلێشێواویو نەسرەتەوە دەوەستێتو هەروەهاش هیرا]

**هیرا** : (ئازایەتی یەکی بەڕواڵەت دەنوێنێت) . وەرە پێشەوە کورم . ئابزانم سەرت بەرزبکەرەوە ، با چاوە جوانەکانت ببینم .

**خا برین پێچ** : (بۆهیرا) کورەکە گوێی گرانە
[سوو هیرا ڕاچڵەکینێکی خێرا رادەچڵەکن . خا برین پێچەکە دەستی منداڵەکە دەگرێ بەرەو پێ شەوە ڕای دەکێشێت . لە پاشان سەری منداڵەکە بەدەستی خۆی هەڵدە بڕێو کۆچکەکەی لە سەرسەری دەکەوێتە خوارەوە دیمەنی منداڵەکە دەردەکەوێ زۆر ترسناکە . سەری لووس وهیچ مووی پێوە نەماوە . پێستی دابڕ دابڕ بووە ، چاوەکانی داخراونو بە قوولا چوون . لەدەم و چاوە سووتاوەکەیدا نە لووتیو نە گوێچکەکانی دیارن شوێنەواری سووتانەکە لە چوار دەوری ملیەوە دەست پێ دەکاتو لە کونی کراسەکەی کۆتایی دێ . سو ئاهێکی تێك چوونو سەر لێ شێوان دەردەبڕێو بەلادا دێو هیرا ئاگای لێ دەبێ ، زوو دەستی بۆ درێژ دەکاتو ئەویش دەستی هیرا دەگرێو لە هوش خۆی دەچێو دەکەوێ . خا برین پێچەکە منداڵەکە بەجێ دەهێڵێو بە پەلە بۆ یارمەتی دانی هیرا دەچێو ناوچەوانی سو دەگرێ]

**خا برین پێچەکە** : لەهۆش خۆ چوونێکی ئاسایی یە .
[بە هیرا دەڵێ] ئەمە زۆر جار روو دەدا . بینینی منداڵێکی شێواو گرانترە لە بینینی جهانێکی وێرانە . تکات لێ دەکەم هەندێ بچۆرە ژێر باڵی یەوە ... دەچم گالیسکەیەك دەهێنم .
(هیرا بە مەبەستی هۆشیارکردنەوەی دەست لە شانی سو دەدا)

**هیرا** : سو ، سو ، گوێم لێ بگرە .
[خا برین پێچەکە بە قەرەوێڵەیەکی پێچکەدارەوە دەگەڕێتەوە . بە هەردووکیان سوی دەخەنە سەر] .

**خا برین پێچەکە** : لێدانی دڵی کزە . دەیبەم بۆ ژووری بوژاندنەوە
[پاڵ بە قەرەوێڵەکەوە دەنێو ئاوڕیش لە هیرا دەداتەوە]
تکات لێ دەکەم ئاگات لە منداڵەکە بێ .
[پاڵ بە قەرەوێڵەوە دەنێو ڕووی بەلای منداڵەکەدا وەردەگێڕێ]
ئومێد دەکەم ئەم فرمانەبە پەلە کۆتایی بێ .
پرسیاری لێمەکە ، هیچت لێ ی دەسناکەوێ . توانای یادکردنەوەی شێواوە ... لەوانەیە هەر نەشمابێ . منداڵەکە لەگەڵ ئەوەشدا کوێرە .
[هیرا بە جووڵانەوەیەکی شپرزەی نەویستەوە کشایە دواوە]
[خا برین پێچەکە قەرێوڵەکە دەباتە دەرەوە] .
[مندا لەکە وەك یەکێکی وونبوو ، لە ناوەراستی شانۆکەدا وەستاوە . هیرا سەرنجی لێدەداو لە جێگەداو لە جێگەی خۆیەوە ڕەق بووە . هیرا سەری دەجوولێنێ بۆ ئەوەی هۆشی بێتەوە بەر ، لە منداڵ کە دەچێتە پێشەوە . دەستی دەخاتە سەر شانی . منداڵەکە

به جوولانەوەیەکی نەویست خۆی لە دەست دەربازدەکا ، لە دوورەوە دەوەستێ . هیرا جارێکی تریش هەوڵ دەداتەوە بەلام منداڵەکە بە توندیو بە نارەزایی دەگەڕێتەوە دواوە . لێرەدا سەرنج دەدەین کە دەنگی منداڵەکە هەمان دەنگە کە هاتبووە خەونی دایکەکەوە .]

**منداڵەکە** : گەورەم ... دووراو دوور چاوەڕ وڵێ بە هەرچی بتەوێ پێتی دەڵێم بەلام دەستم لێمەدە .

[هیرا هەروەك گوێی لە شتێکی لەبەرکراوبێت]

من ناوی خۆم نازانم . نە باوکم دەناسمو نە دایکم . منداڵ بووم کە وولاتەکەم بەلای بەسەرداهات . لە نێوان لاشەی مردووەکاندا ، بەسەر لێشێواوی دۆزراومەتەوە . من کوڕی دەوڵەتم .. ئێمە لێرە لە سایەی ئەو چاکەیەدا دەژین کە خێرەومەندانی وەك ئێوە شتومەکمان پێ دەبەخشن .

(بەسەر سامییەوە)

**هیرا** : دەڵێی قسەکانت هەموو لەبەرکردوە . دەمەوێ بزانم ئایا تۆ کوڕەکەی منیی ؟

وەرامم بدەرەوە .. قسە بکە ... بۆچی بەم شێوە سەیرم دەکەی .

من هەڵەم نەکردووە تا تاوانبار بکرێم . پێم بڵێ تۆ کوڕی منیی ؟

(رادەوەستێ ، وەك بیری کەوتبێتەوە)

بەلام تۆ خەتات چییە .. بۆ لە تۆ توورە ببم ؟

تۆ لە من ناگەی ... تەنانەت هەر گوێشت لە دەنگم نییە .

[هیرا منداڵەکە بەگەرمی لە باوەش دەکاو تاوێ گریانی بە کوڵ دای دەگرێ)

کوڕم لێم ببوورە ... ئەی کوڕی هەموو خەڵك .. ئەی تاوانی هەموو لایەکمان .. لێم ببوورە .. ئەی ئەو فریشتەیەی لە شەیتان بوویت .

چونکە منداڵ لە هیرو شیمادا دەهێنینە دونیاوە .

[منداڵەکەخۆی دەهاوێتە باوەشی هیراوە ودەستی بەلەشی دادەهێنێت .

**منداڵەکە** : گیانت دەلەرزێ ... تۆ دەگریی ... ئایا بەراستیتە دەگریی ؟ بۆچی ؟

[منداڵەکە دەست بە جلكو بەرگی هیرادا دەهێنێت]

جلکەکانت کۆنن ... وەك جلكو بەرگی ئەو کەسانە نییە کە خێرمان پێ دەکەن .. تۆ لە ئەوان نیی .. ئایا گوێت لە قسەکانمە ؟

من قسەت بۆ دەکەم ... تۆ وەك ئەوان نیی .

تکات لێ دەکەم لە پەنجە کوورِ بووکانم بێزارمەبە .. تکات لێ دەکەم بهێڵە با دەست لە دەمو و چاوت بدەم . بۆ خاتری بوذا ماوەی ئەمەم بدە .

[هیرا دەستی منداڵەکە دەگرێو بە ڕوومەتی خۆیەوەی دەنێ]

ئەمە فرمێسکە ؟

تۆ دەگریی . لە پێشدا ئەمەم پێ ووتی .. گوێت لێمبوو .. بەلام بۆچی دەگریی ؟ ئایا تۆش بریندارییو تووش بووی ؟

**هیرا** : ( بە دەنگێکی نزم ) . بەڵێ پێکراوم

**منداڵەکە** : ئایا تۆش پێکاوی ؟ برینداری یەکەت لە کوێیە ؟

**هیرا** : لە دڵمدایە

**منداڵەکە** : دەستم بخەرە سەر برینەکەت . تکات لێ دەکەم . لە هیچ مەترسە دەستم زۆر پاکە [ هیرا دەستی منداڵە دەگرێو دەیخاتە سەر دڵیەوە ]

**هیرا** : ئەمەتا لێرەدایە

**منداڵەکە** : بەڵێ تۆ برینداری .. هەموو خەڵك بریندار بوون .

**هیرا** : بەڵێ ... هەموویان

**منداڵەکە** : هەموو جیهان برینداربوون . هەموو خەڵك . من دەزانم . هیچیشم نەبینی بەلام زانیم . لە چاو تروکانێکدا هەموو خەڵك برینداربوون بەلام بۆچی .. ؟

**هیرا** : هەموو جیهان خۆی دەکوژێت .

منداڵەکە : بۆچی هەموو کەس برینداربوون ؟
هیرا : چونکە بوذا دوورەو ئاگای لە هیچ نی یە .
منداڵەکە : ئایا خەڵك بە برینداری یەوە دەتوانن لە باخەکاندا گوڵ بچێنن ؟ من دەتوانم خوێندەواری فێربیم ... ئەوان لێرە بەسێرەی دەست فێرم دەکەت ... کتێبەکە هەموو لە بەردەکەم . زۆر چیرۆکی تێدایە . من حەز لە چیرۆك دەکەم . کتێبەکەم چیرۆکێکی خۆشی لە بارەی هیرۆشیمای لاوەوە تێدایە ئایا چیرۆکەکەی دەزانی ی ؟
هیرا : نەخێر .
منداڵەکە : بۆتی بگێرمەوە ؟.
هیرا : نا .
منداڵەکە : دایکە ئاسمانی یەکەم لە دێر زەمانەوە بۆی گێرامەوە .
[ منداڵەکە دەبێ بە حیکایەت خوان ]
هیرۆشیمای لاو لە لایەن کاربەدەستەوە زوڵمی لێکرابوو بۆ ئەوەی لە دەست ئەو جەورو ستەمە رابکا ، سواری بەلەمەکەی بوو . شاژنی دەریای بۆ دەرکەوت و لە گەڵ خۆیدا بردی یە ژێر ئاوەکەوە بردی یە ناو باڵاخانە سیحرا وی یە کەیەوە . بە ناو ژووری کەژەکاندا گێرای . لەهەر ژوورە ڕۆژێکی بەسەر برد .
لە ژووری هاویندا گەرمایەکی وەك ئاگر تینی بۆ هێنا . لە ژووری پاییزدا هەموو دەوروبەری بوون بە گەڵای دار . لە ژووری زستاندا ، سەیر دەکا ، هەر بارانەو بەفرە بەسەر درەختەکانەوەیە .
لە ژووری بەهاردا ، هەموو شتێك ناسكبوو بۆوە وەك دڵێك کە خۆشەویستی ی تێدابێ .
کە ڕۆژی چوارەم کۆتایی هات ... هیرۆشیمای لاو ، داوای مەرەخەسی ی کردنی لە شاژنی دەریا کرد تا بگەرێتەوە بۆ وڵاتی خۆی بۆ بینینی دایکی و براکانی ی .
شاژن ، شووشەیەکی دایەو پێ ی ووت ، بۆ ئەوەی بتوانێ بگەرێتەوە شانشینی دەریا ، نەکەی هەرگیز سەری ئەم شووشەیە بکەیتەوە .
هیرۆشیمای لاو لە باڵاخانەکەی دەریا چووە دەرەوە . سەیر دەکا جیهان هەمووی گۆڕاوە . شوێنەوارێکی دێیەکەیان وخەڵکەکەی نەدۆزیەوە . زانی ی کە چوار سەدە بووە ، بەسەر مانەوەی لە باڵاخان سیحراوی یەکەدا . سەری لەوە سوورما کە ئەم هەتا ئێستاش هەر لاوەو قۆزە ویستی نهێنی ئەمە بزانێ .
سەری شووشەکەی هەڵپچڕی ی ... دوکەڵێکی وەك دوکەڵی سووتانەکەی . هیرۆشیمای لێ دەرچوو .
بەمە ، هیرۆشیما بوو بە پیرێکی تەمەن چوار سەدەیی و نەشگەڕایەوە بۆ شانشینێ دەریا ، ویستی لە خاکی خۆیدا بمرێ .
هیرۆشیمای لاو خرایە گۆڕەوە ، هیرۆشیمای شاری لەسەر ڕوا [ لێرەدا منداڵەکە بە ئاگادێتەوە ، ئاور دەداتەوە ، بو هیرا دەگەرێ هیرا لە نزیك پەنجەرەکەوە ڕاوەستاوە ]
ئایا تێ ی گەیشتی ی ؟
چیرۆکێکی خۆشە ، ئەی گەوەم بۆکوێ چووی ؟
[ هیرا لێ ی نزیك دەبێتەوەو دەمی دەخاتە بن گوێ ی منداڵەکەوە ]
هیرا : ساسۆ .... ساسۆ .
منداڵەکە : خەریکی جارێکی دی دەست بە گریان بکەیتەوە ؟ ئەوان لێرە ناهێڵن ئێمە بگرین . پێمان دەڵێن کە ئێمە بە توانایین . وە هەرچی یەکمان لەدەست چووە بوذا بۆمان دەگەڕێنێتەوە .
هیرا : ساسۆ ... ساسۆ .
منداڵەکە : هەرگیز مەگری . فرمێسك وورە بە مرۆف بەردەدا . گوێم لێ بگرە ، چیرۆکێکت بۆ باس دەکەم کە چیرۆکی خۆمە :ـ کە لەپاش سووتانەکە هاتمەوە هۆش خۆم . دەستم خستە ناو گیرفانمەوە . گیرفانەکەم تەڕ بوو ... ئایا گوێت لێمە ؟ سەیر دەکەم ماسی یەکی تێدایە ، ماسی یەکی بچکۆلە .. بڕوا دەکەی ؟ من خۆم نەم دی ی ، بەلام زانیم کە ماسی یە . لە سەرچاوم دانا ، لەگەڵ ئەوەشدا نەم

دەی ، زانیم ماسی یەکێ بچکۆلەی مردوو بوو . بە گیانی بوذا سوێند دەخۆم کە هەر خۆم زانیم .
[ هیڕا خۆی پێ نەگیراو هاواری کرد ]

**هیرا** : تۆ ساسوی .. تۆ کوڕی منی .
[ هیرا دەست بۆ یەخەی کراسی مندالەکە دەبا بـۆ ئەوەی زریزەکەی بکاتەوە .. مندالەکە بە تووڕەییەوە ناهێڵێت . بەهەمان بێزار بوونی جاری یەکەمەوە لێی دوور دەکەوێتەوە ]

**مندالەکە** : چی دەکەی ؟
بۆچی دەتەوێ ڕووتم بکەیتەوە ؟
تۆش وەك ئەوانی ی ... دەتەوێ سەیرم بکەن . من قینم لێتانە تەنانەت ئەگەر بریندارایش بن ... لێمان دوور کـەونەوە .. بـڕۆن .. بەمـەندە دلت ئـاونـا خواتەوە کە چرو چاوم دەبینی ی .. هەموو لەشم سووتاوو شێواو . دەتەوێ چیتێدا ببینی ی ؟ بەو هەموو گریانە تێر نەبووی
[ بێ دەنگی یـەگی گران ئـەو نـاوە دادەگـرێ .. مندالەکە وەك بۆ ڕاپەڕین ڕاوەستان ، ڕادەوەستێ . هیڕا قەڵەمی دەستو پێی دەشکێ ، دادەنیشێ ، بێ دەنگی درێژە دەکێشێ . مندالەکە بەرەو پێشەوە دەست وپێ دەکوتێ . وەخت دەبێ بگری ]

ئایا ڕۆیشتی ؟ بەبێ دوعا خوازی لێکردن بەجێت هێشتم ؟ بەجێت هێشتم لە پێش ئەوەی پێت بڵێم ... سایونار ؟
[ منـدالەکە لەکـاتی بۆ پێشـەوە چوونیدا دەستی بە هیڕا دەکەوێ ] ها ئەمە هەر لێرەی ؟
[ مندالەکە پەنجەکانی دەخاتە سەر گۆنای هیڕاوە ]
بەلام هەتا ئێستاش هەر دەگری ؟ بـۆچی ؟ بوذا تۆڵەمان بۆ دەکاتەوە .
ئایا برینەکـەت ئازارت دەدا ؟ ئێمـە هەمـوو مان پێکاوین . ئایا تۆ لەبەر ئەوەی سنگمت نەدی ی ، لەمن زوپربووی ؟ بەلام من لەمەوپێشیش هەرگیز سنگـم دەرنـەخسـتـووە ، تـەنـانـەت لەپێش سووتانیشمدا ... داخوا دەزانی بۆچی ؟
شەرمم پێ ی بوو !
خاڵێکی خڕی وەك پێستی مانگای پێوەبوو .
ئێستا زانیت لەبەرچی شەرمم پێ ی بوو ؟ . ئێستا ئەو خاڵە سووتاوەو هیچ شوێنـەوارێکی نەمـاوە . بەلام ئێستا لەبەر پێستە سووتاوەکەم شەرم دەکەم دەری بخەم ... بێگومان دیمەنێکی سامناکی هەیە ، بە درێژایی شەم دەستی لێ دەدەم ....
هەتا ئێستاش هەردەگری ی ؟ لێم ببوورە ... دەهێڵم پێستی لەشم ببینی ... ئەمەتا ... فەرمـوو ... بە پەلە سەیری بکە .
[ منـدالەکە زریـزەی یـەکـەمی یـەخـەی دەکاتەوە ... بە پەلە هیڕا بۆی دەچێ .... بە بێ ئەوەی سەیر بکات ، کراسەکـەی دادەخاتـەوە . مندالەکە بە تاس و ئارەزووو بڕوا پێکردنەوە وەشی دەگرێ ]

**هیرا** : نامەوێ ، زۆرم بینیوە ، هەموو ڕۆژێك دیومە ، هەموو چاو تـروکانێـك وام لێ هاتـووە ، قینم لە چاوی خـۆمە کـە ئەشکەنجەم دەدا .

**مندالەکە** : تۆ پیاوێکی بـاشی ... ڕاوکردن دەزانی ؟ من زۆر حەزم لێیەتی . خۆزیا تۆ باوکم بوویتایە . من بەبێ باوکم ... مندالەکانی ئێرە نە باوکیان هەیەو نە دایك . برادەکانم دەڵێن ئێمە هەمووومان باوکمان هەبوو . بەلام من بڕوایان پێ ناکەم ... ئێمە کوڕی دەوڵەتین

[ هـیـڕا خـۆی لەدەسـت مـنـدالەکـە دەردەهێنێتو لێی دوور دەکەوێتەوە . یان دەورو خولی دەدا . بە جۆش و سۆزێکی ئەوەندە بە ژانەوە قسە دەکا ، هەروەك بڵێی شیوەنی هەموو جیهان بکا ]

**هیرا** : ساسو ... من باوکتم .
بەلام شەیتانێك کەوتۆتە نێوانمانەوە . کوڕەکەم وامان لێ هاتووە کەسمان کەڵکی ئەویترمان پێوە نەماوە . من لە پاش یەك دوو ساڵی دی دەمرم .

دایکیشت ناتوانیٚ بڕوا بکا .. کـه توٚ خـوٚتی . له پاش ئەوەی هیوا بڕاو دەبیٚ له مانی کوڕەکەی جارانی بەم داخەوە دەمریٚ ، له پیٚش ئەوەی بە مردنی خوٚی بمریٚ . له دوای ئەمە ، من چیم هـەیە پیشکـەشی توٚی بکـەم نەدەستم دەڕوا خواردن‌و پیٚویستیت بوٚ دابین بکەم ، نە دەتوانم فیٚری خویٚندن‌و نووسینت بکەم .

من هەژارو .. نە خـویٚنەوارم . خـوٚت ووتەنی « ئیٚمـە هەموومان پیٚکراوین » بەلاٚم لەڕاستی‌دا ئیٚمە هەموومان مردووین .

حالٚی توٚ لیٚرە باشترە لەوە کە لەگەلٚ ئیٚمەدابی .

وەکوو ئیٚمە دەربەدەر دەبی ... خواردەمـەنی‌یەکـەت وەك ئیٚمە بە سوالٚ کردن پەیدا دەکەی .

توٚ لیٚرە لەناو کەسانیٚکی وەك خوٚت دا دەژی‌ی کە تیٚ‌یان دەگەیت‌و ئەوانیش لەتوٚ دەگەن .

بەلاٚم لەویٚ ڕوٚلٚەکەم .. بینینەکان هـەموو دلٚ ڕەقـانە دەڕوانن تـوندو تیـژن ، بیٚزیـان لیٚت دەبیٚتـەوە ، لیٚت دەترسن ، سەریان گیٚژ دەخوا . وادەزانن توٚ ناقوٚلاٚی‌و لە قبوولٚ‌کردن نەهاتـووی . شتیٚکی لەش شیٚواوو پیٚست پیسی . نە مندالٚیٚکت دەس دەکەویٚ یاری لەگەلٚدا بکەی‌و نە پیاویٚك پیٚتیٚکت فیٚربکا .

**مندالٚەکە** : له کویٚی ... بوٚ کویٚ چووی ؟

[ هیٚرا بە جوٚریٚك دەست لە منـدالٚەکە وەر دەهیٚنیٚ هەروەك بیەویٚ بیخاتە ناو دلٚیەوە ]

**هیٚرا** : ئەمەتام ... لیٚرەم ... ئەی خوٚشەویستم .

[ مندالٚەکە دەست لە لیٚوەکانی هیٚرا دەدا ]

**مندالٚەکە** : کەتوٚ قسە دەکەی واهەست دەکەم کە دەنگت بە ناو لەشـمدا دەڕوا ... دەنگـت وەك بخـووری نـاو پەرستگاکـانی بوذا هیٚمنـەو وەك برووسکـەی ناو دوٚلٚەکان دەنگ دەرەوەیە .

ئایا نویٚژ دەکەی ؟... بیٚ‌گومان توٚ نـویٚژی مـەزن دەکەی .

**هیٚرا** : ئەوە نویٚژی دوا ڕوٚژمە کوڕم .

**مندالٚەکە** : دەزانم توٚ نویٚژ دەکەی ... پیاو چاکان هەمیشە ئەمە دەکەن

**هیٚرا** : لەگەلٚ ئەمەشدا هەرگیز شتیٚك لەم جیهانە ناگوٚڕن .

**مندالٚە؟** خوٚزگە دەخرانی دەم‌و چاوت چوٚنە .

**هیٚرا** : ئای کـە تەنیـایی یەکـەت سەختـە ، بەلاٚم لەگـەلٚیدا راهاتووی . دایکیشت تەنیا لەناو ئەقلٚی خوٚی‌دا ، لەگەلٚ رابـردووی ـنـدالٚیت‌دا دەژی . لەپیٚش ئـەوەی بـەم ـ ـ گوٚڕن .

وـرە کوڕم با ماچت کەم ... بەلاٚم توٚ ماچم مەکە . من پیاویٚکی بیٚ دەسەلاٚت‌و بیٚ توانام .. لەبەر ئەوە من بیٚ فەڕم ، شایانی ئەوە نیم کە توٚ ماچم بکەی . بهیٚلٚە بـا ماچت بکەم ... بەلاٚم هەرگیز توٚ ماچم مەکە تەنانەت لە خەوەکانیشتدا چونکە من شایانی ئەو فەڕو پیتە نیم

[ هیٚرا دوور دەکەویٚتـەوەو هەردوو دەستی لە سەرسەری مندالٚەکە بەرز دەکاتەوە هەروەك ئەوە کە دوعای بوٚ بکا ]

ئەی خوٚشەویست‌ترین کەس . وامن دەت دەمە دەستی بوذا . ئەمە لەوانەیە کە وام لیٚ بکا خوٚشم‌بویٚ ، یان ئەقل مەندی یەکەی تیٚ‌بگەم .

[ هیٚرا بەسەر مندالٚەکەدا دەچەمیٚتەوەو هەموو شـویٚنیٚکی دەم‌و چـاوی مـاچ دەکـا . منـدالٚەکـە بـە خوٚشەویستی‌یەکی سادە ، دەستی لە مل دەکا . خـا برین پیٚچەکەی لەگەلٚ سودا چووبوو دیٚتە ژوورەوە ]

**خا برین‌پیٚچ** : گەورەم ، مندالٚەکە زوٚر سەخلٚەتی نەکردووی .

داوای لیٚ بـووردن دەکـەم . چـونکـە من بـە خیٚزانەکەتەوە خەریك بووم .

**هیٚرا** : ئەدی ئەو لە کویٚیە ؟

**خا برین‌پیٚچ** : هاتەوە هوٚش خوٚی‌و ئیٚستا ئەی هیٚنن . ئیٚستا دەبیٚ مندالٚەکە ببەمەوە .

[ دەستی مندالٚەکە دەگـریٚت‌و دەیەویٚ ببیات ... بەلاٚم شتیٚکی بـە بیر دیٚتـەوەو ئاوڕ دەداتەوە ]

گەورەم ناسیتەوە ؟ . ئایا لات وایە کـە ئەمـە کوڕە وون بووەکەی توٚیە ؟ ●

[ هیـرا قسە دەکـا ، وەك ئـەوە گیـان بدات ]

**هیٚرا** : نەخیٚر ... ئەمە ... کوڕی من نی‌یە .

**خا برین‌پیٚچ** : ئەمەکوڕی دەولٚەتە .

[ دەستی منداڵەکە دەگرێ‌و لەگەڵ خۆیدا ڕای دەکێشێت . منداڵەکە سەری بۆلای هیرا دەسوورێنێ‌و ڕۆیشتنەکەی لێ تێک دەچێ خابرین پێچەکە کە ڕۆیشتن بە پەرۆشە منداڵەکە ڕادەکێشێت ]

**منداڵەکە** : سایونارا

[ کاتێک هیرا گوێی لەم قسەیە دەبێ ... لەشی گرژ دەبێ وەک ئەوە کە دڵی دەربهێنرێت . هەناسەکانی تێک دەچن . وەک گرمە گرمی هەوریان لێ دێ . هەردوو دەستی بەرەو ڕووی منداڵەکە ڕادەکێشێت . بەڵام لە پاشان خۆی دەگرێتەوەو بەسەر هەڵچوونەکەیدا زاڵ دەبێ ، خا برین پێچو منداڵەکە لە بەرچاو وون دەبن .

هیرا خۆی پێ ناگیرێ‌و بەبێ جووڵە لەسەر کورسی یەکدا دەنیشێت . سو کە دەستی لەسەر شانی برین پێچێکی ترە ، دێتە ژوورەوە هەندێ توانای جارانی هاتۆتەوە بەر . ]

**سو** : ئەی هیرا .... ئایا .... ئایا ڕۆیشت ؟

**هیرا** : [ هەردوو دەستی سو دەخاتە نێوان دەستەکانیەوە ] بەڵێ ئەی سو منداڵەکە کوڕی ئێمە نەبوو .

**سو** : [ لەپاش تاوێ بێدەنگی ] من دەمزانی .

**هیرا** : بیست دالدەخانەی ترمان ماوە ... بۆی بگەڕێین .

**سو** : من دەمزانی ... دەمزانی ئەوە ساسۆ نی یە .

[ لەو کاتەدا هیرا بە گریانێکی جەرگ بڕ دەگری ، پەردە دادەدرێتەوە ] .

**ـ ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی ـ 1982**

**پەراوێزەکان :**

(1) خاتوونی برین پێچ .

(2) مەبەست لەوە نی یە کە کەڵک‌و خێری ژیانیان پێوە نەمابێ . ئەمانە هەر نەبێ بۆ دادانی دەرس‌و پەندی کاریگەری مرۆڤی لە خۆبایی بوو ، بۆ ژیان بە کەڵکن .

(3) مەبەستی ئەو دووعایەی عیسایی یەکانە کە دەڵێ : ( وعلى الأرض السلام ) .

(4) نوێژێکی تایبەتی یە .



## گۆڕینی کەمال جەلال غەریب



شوێن بریتیە لە کارگەیەکی کۆن ، کورەو بۆتە (بودقە)و چەوتەک (معوجە) و دەزگای دڵۆپاندن‌و موشەدەمەی تیادا پەرش‌و بڵاو بۆتەوە ، لە نێوانی ئەم شتانەدا ، پیاوێکی پیرخۆی بەسەر قازانێکی گەورەدا چەماندۆتەوە ، قازانەکە نزیکەی دوو هەزار هێلکەی تیادایە ، مامەی پیرە دەیان کوڵێنێت ، دوای ئەوە بە شێنەیی پاکیان دەکات ، ئنجا توێکڵەکان کۆمەڵ دەکات‌و لە دەفرێکدا لە سەر گڕێکی هێمن گەرمیان دەکات بۆ ئەوەی مادەیەکی سپی شێوە بەفری لێ بەدەست بکەوێت . کەمێک لەولاوە پیاوێکی تر خەریکە سپێنەو زەردێنەی هێلکەکان لە یەکتری جیا دەکاتەوەو لە گەڵ تەرسی ولاخدا تێکەڵیان دەکات ، ئنجا هەردووکیان پێکەوە دەست دەکەن بە گەرم کردن‌و دڵۆپاندنی ئەم شتە سەیرانەو بۆ ماوەی هەشت ساڵ بەردەوام دەبن . مەبەستیشیان لەمە ئەوەیە کە شلەیەکی سپی نهێنی سەیروڕوونێکی سوریان دەست بکەوێت کە گوایا بەم دووشلە توێنەرە بە هێزانەی کە هەمووشتێک دەتوێننەوە (بەردی فەیلەسوفەکانیان) چنگ دەکەوێت ، بەردی فەیلەسوفەکانیش ئەو بەردەیە کە گوایا ئەگەر لەکانزا بێ بەهاکانی ( هەرزانەکانی ) وەکوو قورقوشم‌و تەنەکە بخرێت دەیانکات بە زێڕ . ئەوڕۆژەی کە پێویست بوو ئەنجامی ئەرکەکەیانی تیادا دەربکەوێت واخەریکە نزیک دەبێتەوە ، ئەم ڕۆژشیان وەکوو ڕۆژەکانی تر بە هەناسە بڕکێ‌و دڵ تەنگی‌و ئاوات خواستن‌و دڵە لەرزی بردە سەر بێ ئەوەی هیچ جۆرە سەرکەوتنێک بهێننە دی . بۆچی ؟ چونکە (بەردەکەیان) مانی گرتوەو نایەوێت هیچ جۆرە کانزایەکی بێ بەها بکات بەزێڕ . پیاوە پیرەکەیان لە پێشدا بە شێوەیەکی نهێنی لەسەر قسەی کیمیا گەرە کۆنەکان دەستی بە ئیشکرد ، چونکە زانا کیمیا گەرە کۆنەکان دەڵێن : توخودا بە ئاسانی دروست کردنی زێڕ واتان لێ نەکات لە خۆتان بایی ببن‌و نهێنی ڕێگەی دروست کردنەکەی لای خەڵقی ئاشکرا بکەن ، هەرکەسێک بێت ، نە ژن

# بەردی فەیلەسوفەکان

نە کچ نە کوڕ ، نە خزمەکانتان ، چونکە ئەگەر بە گوێی ئێمە نەکەن پەشیمان دەبنەوە لەوکاتەدا کە پەشیمانی هیچ سوودێکی نابێتو ئەگەر ئەم نهێنی‌یە ئاشکرا بکەن پیشەکە (سنعاتەکە) تامی تیادا نامێنێتو وای لێ دێت زێڕ ئەوەندە دروست دەکرێتو هەرزان دەبێت وەکوو تۆڵەکەی لێ دێت ، گەڕان بە شوێن بەردی فەیلەسوفەکاندا هۆش و گۆشی لەم پیاوە بڕیبوو .

ئەم پیاوەش مام (تریڤیزان) بووە . (تریڤیزان) لە ساڵی 1406ی زایینیدا لە خێزانێکی بەزیرەکی ناسراو لەشاری (پادوا) لە دایکبووە ، کە یەکێك بووە لە شارە کۆنەکانی باکووری ئیتالیا ، بەو چیرۆکانە دەست خەڕۆ بووبوو کە باپیری بۆی دەگێڕانەوە دەربارەی سەر چڵ و چاو نەترسانی کیمیاگەرەکان و چۆنێتی گەڕانیان بە شوێن زێڕو مایەی (ئاکسید) ژیاندا ، ئەو چیرۆکانەی کە هەمیشە ئەنجامەکانیان هەرکلۆڵی و نەهامەتی‌بووە . بەلام ئەم دەیوت من هەر دەبێت سەربکەوم لەم کارەدا با ئەوانەی پێش من سەرکەوتوو نەبووبن ، لەو لاشەوە دایکو باوکیش هەر هانیان دەدا . لە تەمەنی چواردە ساڵی یەوە بڕیاریدا کە خۆی بهاوێژێتە ئەم گێژاوەوە ، خێزانەکەش ئەمەیان پێ خۆش‌بوو بە هیوای ئەوەی کە میراتی یەکی باوکی هەزارەها جار زیاد بکات ، بەلام بەداخەوە ساڵ لەدوای ساڵ هەر نەهامەتی دەهاتە ڕێ و میراتی و سامانەکەش هەتا دەهات هەر بەرەو کزی دەچوو ، هەتا وای لێ هات کە خێزانەکەی دەستیان لێ شتو بەزەیی‌یان پیایدا دەهاتەوە و پێ‌یان دەووت لەوە دەچێت کە عەقلێ تێك چووبێت ، کە چی خۆی هەر سوربوو لەسەر بڕیارەکەی و هیچ جۆرە کۆسپێك کاری تێ نەدەکرد ، ئەوەبوو تاقی‌کردنەوەی هێلکەکان سەری نەگرت ، ئەو تاقی‌کردنەوەیەی کە بە یارمەتی (گۆتفریدس لوریە) کردی ، بەلام هەر بەردەوام‌بوو لە سەر ئیش‌کردن ، ئەم جارە وای بە خەیاڵدا هات کە (زێڕیش تۆوی هەیە ، ئایا کانزاکانی تریش هەر وەکوو ڕووەك لە زەویدا ناڕوێن ؟ . کەوابوو هەر دەبێت قورقوشم ، کە کانزایەکی هەرزانە ، ببێت بە زێڕ ، ئەگەرەکوو ماوەیەکی تەواوی بدرێتی ، چونکە ئێمە نابێت وا بەتەمابین کە سروشت لە ماوەی چاوتروکاندنێکدا ئەم گۆڕینە بکات بەڵی وەختو شێنەیی زۆر پێویستن ، جگە لەوەی کە دەبێت ئەم هەنگاوە هەنگاوی تری لە پێشەوە بێت چونکە سروشت شتی ناتەواو بەر لەشتی تەواو دەهێنێتە بەرهەم ، لە دواییدا وردە وردە ناتەواوی‌یەکە پڕ دەکاتەوە ، ئەوەش کارێك نیە لە سروشتەوە دووربێتو بەلایەوە ستەم بێت ، ستەمی چی ؟ ئێمە هەموو ڕۆژێك دەبینین کە چۆن هەنگو زەردەواڵەو قالۆنچە لە پیسایی و تەرس گیانەوەرەوە وێنە دەرەوە ! ! . خۆ ئەمانە هەموویان زیندەوەرن و لە کانزاکان تەواوترن و بە زەحمەت تریش دروست دەکرێن ! !) .

بەم جۆرە (تریڤیزان) بە ردەوام خەریك‌بوو کتێبە کیمیایی‌یەکانی ئەو سەردەمەی دەخوێندەوەو یەك لە دوای یەك تاقرکردنەوەی دەکرد ، گەلێك جۆری لە کانزاو خوێ‌یە سروشتی‌یەکانی دەهێناو دەی تواندنەوەو دەیکردن بە بلووروو هەمان تاقی کردنەوەی دەیەها جار دووبارە دەکردەوە لە سەرزاخی سپی و زاخی سەوزو مادەی ڕووەکی و گیانەوەری و گژوگیاو تەرسی وڵاخ و گۆشتو پیسایی ، دەیخستنە بوتەو چەوتەکەوە دەیکولاندن و دەیدلۆپاندن و خەستی دەکردنەوەو شلی دەکردنەوەو دەیسوتاندن و دەیەلماندن و تێکەلی دەکردن و ... هتد . لەبەر خۆیەوە دەیووت (زێڕ لە هەموو کانزایەك تەواوو ڕێکو پێك ترە ، خودای گەورە بەردی دروست کرد ئنجا کە ڤری (صخرة) دروست کردو بە زێڕ کۆتایی پێ هێنان ، ئادەمیزادیش دەگمەن ترینی دەستکردە زیندووەکانی خودایە ، کەوابوو دەبێت زێڕ لە ئادەمیزاد دەر بهێنرێت .) .

ئنجا لەبەر ئەوە مام (تریڤیزان) خووی دایە میزو خوێنی ئادەمیزاد ، نزیکەی دوانزە ساڵ ئەمانەشی تاقی کردەوەو نزیکەی شەست هەزار کرۆن پارەی لە گیرفانی خۆی خەرج کرد . چەند کەسێکی دزو درۆزنیش کە بەمەیان زانی خۆیان لێ نزیك کردەوەو بە بیانووی ئەوەوە کە ئەوانیش هەر بە شوێن زێڕدا دەگەڕێن ، هەندێك نهێنی درۆی ئەم پیشەیەیان پێ

فرۆشتو دەستیان کرد بە پارە لێ کێشانەوەی هەتا وای لێ هات سامانەکەی بەرەو کەمی دەڕۆیشتو ئەوەی نەدەزانی کە هەتا زانایەکی پاك هەڵدەکەوێت ، هەزارەها تەڵە کە بازی لە پاڵدا پەیدا دەبێت ، بەلام لە دواییدا کەراستی ئەمانەی بۆ دەرکەوت وردە وردە خـۆی لێیـان دزیـیەوە . ئـنجـا رووی کـردە نوسراوەکانی دوو زانای کیمیا گەری کۆن (دیرۆپسیسیـا) و (سکرۆ بۆسکۆ) ، بە مە کەمێك بڕوای بە بەردی فەیلەسوفەکان پەیدا کردەوە . لێرەدا قەشەیەکی لەگەڵ خۆیدا بە شدار کردو دەستی کرد بە دلۆپاندنی شەراب ، هەزارەهـا جار ئـەمەشی دووبارە کردەوە ، لە ئەنجامدا ئەم ئەرکەشی هەر بە فیڕۆ چوو ، بەلام هەر کۆڵێ نەئەداو گەرمیی هیواهەر لەدەروونیدا کلپەی دەکـرد ، بەم جـۆرە ماوەی (15) سـاڵی تریشی لە کـارگـەیـدا بـردەسەر ، بـەرگـەی بـرسێتیو تینـوێتی دەگـرت ، بـەلام هەیهوو ، ئەم جارە نزیکەی (10) هەزار کرۆنی تری خەرج کرد ، بـەرەبەرە تـەندروستییـەکەش بـەرەو خـراپی دەڕۆیشتو تەمەنی بەرەو پیری دەچوو ، خەریكبوو عەقڵیشی تێك بچێت ، لێـرەدا فریـای خۆی کـەوتو خووی‌دایـە نوێـژکردنو خـوا پەرستن ، بەلام هاوڕێکەی لەم پێناوەدا مرد . دوای ئەمە بە ماوەیەك (تریفیزان) کارگەکەی گواستەوە بۆ قەراغی دەریای باڵتیك ، لەوێ لە گەڵ دادگەرێکی ئەلمانیدا هاوبەشی کرد ، ئەم دادگەرەش وەکوو ئەو عەودالی زێڕ دروستکردنبوو دەیووت (مـن دڵنیـام لەوەی کـە نـهێـنـی ئـەم بـەردە ، بـەردی فەیلەسوفـەکان ، خـۆی لە خوێ لە خـوێی ئەم دەریـایەدا شـاردوتەوە ، هـەستە بـاشەوو رۆژ ، بێوچـان ، لەم ئـاوە بدلۆپێنین هەتا وای لێ دەکەین وەکوو بلووری لێ بێت) نزیکەی ساڵێک خۆی بەمە شەوە خەریككرد ، بەلام پیـرە بەرد هـەر خـۆی نەدەدا بـە دەستەوە . (تـریفیزان) خـەیـاڵێکی تـری بەسەردا هات بۆ چارەکردنی ئەم کۆسپـە : هەنـدێك جیـوەو هەندێك زیوی هێناو هەریـەکەیـانی بە جیـا لە ئاوی ئـاگردا (مادەیەکی ترشی توێنەرەوەی بەهێزە) تواندەوە ، ئنجا هەردوو گیراوەکەی لەسەر پشکۆی ئاگر خەست کردەوەو تیکەلی کردنو کردنییە بۆتەیەکی فەخفوریيەوەو خستنیە بەر هەتاوو وتی :

(خۆر بەوەی کە لە سەرزەویو لە ژێر زەویدا دروستی دەکات ، دەبێت هەر ئەویش بێت کە کانزاکان دروست بکات ، زێڕ هەر تیشکی خۆرە بەلام خەست بۆتەوەو بووە بە مادەیەکی رەقی زەرد ، ئـادمیـزاد کـان دە دۆزێتـەوەو ئـەلمـاسی لێ دەردەهێنێتو بـەجێی دەهێڵێت ، دوایی کە دێتـە وەسەری تەماشا دەکات ئـەلماسـەکە سـەر لەنوێ دروست بـۆتەوە) لەمەدا ناحەقیش نەبوو چونکە بەگوێی خۆی دەیبیست کـە هەندێك لە خاوەن کانەکان ، کانـە کانیـان بەجێ دەهێڵن بـۆ ماوەیەك بـۆ ئەوەی سـەرلەنوێ کـانزاکـانی ناویـان گەشـە بکەنەوە . پێنج ساڵی تریشی بردە سەر بە وەی کە تێکەلاوەکەی دەخستە بەر هەتاو و یەك لە دوای یەك سوراحی لێ پڕ دەکردو چاوەڕێی گۆڕانی دەکرد ، بەلام ئەمەش هەر بێ سوودبوو . (تریفیزان) لەم کاتەدا تەمەنی گەیشتبووە پەنجا ساڵی ، بەلام ئەو ئاگرەی کە لە دەروونیدابوو هەر لە کلپە کردندابوو . دوای ئەوە شڕو شیوا لە کانی کۆکردەوەو سـەری خۆی هـەلگرتو بەرەو ئەلمانیاو ئیسپانیاو فەڕەنسە ڕۆیشت ، لەوێ بـەشوێن کیمیا گەرە راستەقینەکاندا دەگەڕاو لەگەڵ بەناوبانگترین ئەو کەسانەی کە بە شوێن زێـڕدا دەگەڕان گفتـوگۆی دەکـرد بە هیوای ئەوەی کە بگاتە کلیلی ئەم گیرو گرفتە ، لە کۆتاییدا لە فـەڕەنسە گیـرسایـەوەو دەستی کـردەوە بـە ئیشکـردن لە کارگەکەیدا ، لێرە بیستی قەشەیەك کە ناوی (هـەنری) بـوو نهێنیی بـەردەکەی دۆزیـوەتەوە ، خێـرا شتومـەکەکـەی کۆ کردەوەو بەرەو ڤییەنا پایتەختی نەمسا ڕۆیشتو لەوێ بەوپیاوە گەیشت کە بە درێژایی ژیانی ئاواتە خوازی پێگەیشتنی بوو . مـامۆستـا (هەنـری) تەمـەنی خۆی لە پێنـاوی دۆزینـەوەی کانزاکانو گۆڕینیان لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر بردبووەسەر ، ئایینی و دڵسوزبوو . کە بەیەك گەیشتن هەردووکیان پەیمانیان بەست لە سەر برایەتییەکی بەردەوام ، بـۆ دەرخستنی ئەم برایەتییە تریفیزانی دڵپاك شەوێك لە شەوان ئاهەنگێکی گێڕا هەرچی کیمیا گەرێکی ئەو ناوچەیە هەبوو بانگی کردن . لەسەر مێـزەکە چـلو دوو مارکی (جـۆرە دراوێکە) زێـڕی لە خۆیو میوانەکانی کۆ کردەوە ، پێنج مارکی هینی مامۆستا (هەنری) بووو بەڵینیدا کـە لە بۆتـەکەدا بیکـات بە پێنـج ئەوەنـدە . (تریفیزان) بیست مارکیدا و باقییەکەی ئەوانی تر دایـان ، هەرچەندە ئەوانی تریش هەر لە تریفیزانیـان قەرز کـردبوو . ئنجا (هەنری) هەستایە سەرپێو سوراحییەکی شێوە سەیری هێناو برێك گۆگردی ستوونی زەردو چەند دلۆپێـك لە جیوەی تیادا تێکەل کردو سوارحییەکەی خستە سەر ئاگرو بەرەبەرە

پارچە زیوی تێ دەکرد کە لە شێوەی دەنکە گەنمدابوون ، لەگەڵ کەمێك لە رۆن زەیتوونی پاك ، بەر لەوەی کە دەمی سوراحی‌یەکە بە قوڕو خوڵەمێش گەرم بگرێت ، چڵو دوو مارکەکەو کەمێك قورقوشمی تواوەشی تێ‌کرد ، دوای ئەمە تێکەڵاوە سەیرەکەی کردە بۆ تەپەکەوەو لەناو پشکۆی ئاگردا نوقمی کرد ، ئەمانە خەریکی خواردنو خواردنەوەو بەزمو رەزمی خۆیان بوونو تێکەڵاوەکەش بۆ خۆی لە سوراحی‌یەکەدا لەسەر ئاگرەکە قوڵپە قوڵپ دەکوڵا لە کورەی موبەقەکەدا ، دوای ئەوەی کە کوڵانی تێکەڵاوەکە کۆتایی هات سوراحی‌یەکەیان شکاند کە تەماشایان کرد هەرچی‌یەکی تیادا بێت زێری تیادانیە ، هەنری ووتی ئێستا من تێگەیشتم کە بۆچی ئەم تاقی‌کردنەوەیە سەری نەگرت !! . ووتی لەوە دەچێت کە شتێکمان کەم تێ کردبێت ، ئەوانی تر ووتیان دەشێت رووی مانگو ئەستێرەکان لە کاتی تاقی‌کردنەوەکەدا لەو بارە ئاسایی‌یانەدا نەبووبن کە پێویست‌بن بۆ سەرکەوتنی تاقی‌کردنەوەکە ، لەمەش سەیرتر ئەوەبوو کە سوراحی‌یەکەیان شکاند لەبەرچاوی هەمووان‌دا تەماشایان‌کرد لە چڵو دوو مارکەکە تەنها شانزەی ماوە ، ئەم بەزمە بووە هۆی توورە بوونی (تریفیزان) ، لەبەر ئەوە بڕیاری‌دا کە ئیتر هەرگیز بەشوێن بەردی فەیلەسوفەکاندا نەگەڕێت . بەڵام تەنها هەردوو مانگ ددانی بە خۆیدا گرت کەوای دەزانی بەدوو ساڵ لێی رۆیشتووە ، دیسانەوە کەڵکەڵە کەوتەوە سەری ، شیری میسر خۆی لە کالانا ناگرێت ، بە تایبەتی بۆ ئەوەی ئەو سامانەی بەدەست بهێنێتەوە کە لە پێناوی ئەو بەردە نەگبەتەدا دۆڕاندبووی ، ئەم جارە رووی کردە مەڵبەندە کۆنەکانی کیمیا لە میسرو فەلەستینو یۆنانو تورکیاو دوورگەی قوبرسی ، لەبەر خۆیەوە دەیووت «بۆچی نەچم بۆ ئەو مەڵبەندە کۆنانە ؟ نەبوو کە مێژوو ناسەکان بە شوێن یەکەم کیمیا گەردا دەگەڕان کە تەماشایان کرد کوڕەزای نوحەو نهێنی بەردەکە دەزانێت ، نەبوو (سارە) ی ژنی (ئیبراهیم) لەسەر لەوحێکی زمرووت چۆنێتی دروست کردنی زێڕی نوسیبێوە !! .

بە شێوەیەکی ئەوەندە ئاڵۆزو مەتەڵ نوسیبوویەوە بۆ ئەوەی کەسی لێی تێ نەگات !! ، ئنجا لە دواییدا لەو حەکەی شاردەوە بۆ ئەوەی دەست کەس نەکەوێت !! . ئەوەبوو لە دواییدا ئەسکەندەری گەورە لە ئەشکەوتێکدا لە نزیك (هەبرۆن) لە فەلەستین دۆزی‌یەوە !!» . ئیمپەراتۆری رۆمانی (جایۆس دیوکلیتیان) لە ساڵی (290)ی زایینیدا فرمانی دەرکرد بە سوتاندنی هەموو ئەو کتێبانەی کە باسی چۆنێتی دروست‌کردنی زێڕ دەکەن بۆ ئەوەی کە میسری یەکان پێ ی دەوڵەمەند نەبن‌و شۆڕش بکەن دژی ئیمپەراتۆری‌یەکان . (تریفیزان) خوا خوای ئەوەی‌بوو کە هەندێك لەو کتێبانە بەر سوتاندن نەکەوتبێ ، لەبەر ئەوە بەرەو شاری ئەسکەندەریە رۆیشت بۆ هێنانەدی ئاواتەکەی . نزیکەی چوار ساڵ لە ئەسکەندەریە مایەوەو لەوێوە نامەیەکی ناردووە کە تیایدا دەڵێت (نزیکەی پانزە هەزار کرۆنم خەرج کردووەو بەراستی هەژاری دایرزاندووم‌و هیچ دەرامەتێکم پێ نەماوەو تەمەنیشم گەیشتۆتە نزیکەی (62) ساڵ) . ئەوەندەی پێ نەچوو کە (تریفیزان) ناسیاوی لەگەڵ قەشەیەکی تردا پەیدا کرد ، ئەم قەشەیە رەچەتەیەکی پێ بوو باسی چۆنێتی سپی‌کرد نەوەی مرواری رەنگ هەڵبزرکاوی تیادا نووسرابوو . قەشەکە لەبەر چاوی تریفیزاندا مرواری‌یەکی رەنگ هەڵبزرکاوی هێناو خستی‌یە قاپێکەوە کە پڕ بوو لە میزی کوڕێکی هەرزەکار ئنجا بە چینێك لە زاخ دای پۆشی‌و داینا هەتا ووشك بووە . ئنجا مرواری‌یەکەی دەرهێناو خستی‌یە تێکەڵاوێك لە جیوەو شیری دێڵەسەگ ، تریفیزان چاوی بڕیبووە دەستی قەشەکەو زۆر سەری سوڕما کەدی مرواری‌یەکە سپی بۆتەوە ، لەبەر ئەمە باوەڕێکی تەواوی بە قەشەکە کرد ، خێراهەستاو چوو بۆلای بازرگانێك هەشت هەزار فلۆرنی (جۆرە دراوێکە) لێ قەرز کرد بەرامبەر بە پاشماوەی ئەو زەوی‌و زارەی کە هێشتا مابووی . نزیکەی سێ ساڵ لەگەڵ ئەو قەشەیەشدا ئیشی‌کرد ، کەرەسەی خاوی ئاسنیان دەهێناو دەیان خستە سرکەوە بەنیازی ئەوەی پیرە بەردیان بۆ راست بێتەوە . شەوو رۆژ لەو کارگە پیسەدا ئیشی دەکرد . سامانەکەی هەتا دەهات بەرەو نەمان دەرۆیشت ، وای لێ هاتبوو لە بیری ئەچووەوە کە دەست‌و دەموچاوی بشوات‌و ئیشتیای خواردن‌و خواردنەوەشی نەمابوو هەتا وەکوو نەخۆشی رووی تێ‌کردو ناهومێدی کاری کردو بەرەو لاتی رۆیشت ، دیسانەوە کەلوپەلەکانی کۆکردەوە کە بەرەو باوان بێتەوە بۆ شاری (پادوا) لە ئیتالیا ، بێ پارە ، بێ هاوڕێ ، لاوازو پەشۆکاو ، کەچی هەر وازیشی نەدەهێنا ، دیسانەوە چووەوە بۆ

دورگەی (رۆدس)و لەوێ لەگەڵ قەشەیەکی تردا ڕێککەوت ، ئەو قەشەیە دەیووت کە گۆیا نهێنی بەردەکەی لایە ، بەلام کوا ئەو بەردە نەگبەتە ؟ (تریڤیزان) شەست ساڵ تەمەن‌و هەزارەها کرۆنی لە سامانەکەی لەم پێناوەدا بەخت کرد ، تینی ئاگری کورە لەشی کردبوو بە زووخاڵ ، ئنجا دەشی کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکانی فەیلەسوفە کۆنەکان ووتی نەوەکا هەندێك شتم بەسەردا تێپەڕبووبێت‌و نزیکەی دە ساڵی تریشی خەریکی ئەمەبوو . شەوێك خەودایگرت ، لە خەویا فریشتەیەك‌و فوارەیەکی جادووگری دی ، تەماشای دەکرد ئەستێرەکان لە ئاسماندا خۆیان دەڕازیننەوە وجلو بەرگەکانیان دادەکەنن ، (تریڤیزان) واقی و ڕمابوو نەی دەزانی ئەم تەلیسمە چی‌یە ؟ . لە قەشەیەکی تەنیشت خۆی پرسی ئەمە چی‌یە ؟ قەشەکە وەلامی دایەوەو ووتی : خودا یەك‌و دەو سەدو هەزا رو دووسەد هەزاری خولقاندوە ئنجا بە ژمارە (10) لێکی داون . (تریڤیزان) ووتی بە خودا تێ نەگەیشتم دەلێیت چی ، قەشەکە ووتی : لە مە زیاترت پێ نالێم چونکە من زۆر ماندووم . لە پڕێکدا (تریڤیزان) خەبەری بووەوە ، وای هەست دەکرد کە خەریکە ببووڕێتەوە و لەمردن نزیك بۆتەوە (نەم دەزانی کە پێشی هێنانەدی ئاواتەکەم دەمرم ، ئاواتە خوازی ئەوە بووم کە بە بینایی چاوی خۆم ئەم نهێنی‌یە بسمم . ئەی خودای گەورە ئایا تەنها ساڵێکی تریشم دەدەیتێ ؟ . ئەی خودا گەورە هیچ نەبێت ڕۆژێکی ترم بدەری با تینوێتی خۆمی تیادا بشکێنم ، تەنها ڕۆژێکی تر بۆ ئەوەی لێرەدا لە سەر ئەم زەوی‌یە شتێك بزانم ، توو گەورەیی خۆت یەك ئەموستیلەم بۆ بشکێتە کە لەوە پێش نەشکێنرابێت ، تەنها یەك ووشەم پێ بلێ کە هیچ گوێ یەك جگە لە گوێی من نەیبیستبێت) بەلام خودای گەورە بە دەنگی‌یەوە نەهات‌و ئاگری ژێر بۆ تەکە کوژایەوەو لە هۆڵی کارگەکەدا ئامرازەکان ساردو پەرشو بلاو بوونەوە وەکوو ئەو دەستە ساردەی کە لەوە پێش دروستی کردن‌و ڕێکی خستن ، بەم جۆرە لە ساڵی 1490 ی زایینیدا (تریڤیزان) چاوی لێکنا . ئەوەی لە مێژوودا ئاورێك بدایەوە بۆ دواوە دەبینێت کە ئەم بیروڕا پڕووپوچە ، واتا شیانی گۆڕینی کانزایەکی هەرزان بەها بۆ کانزایەکی بەنرخ ، وەکوو لەو سەردەمەدا باوبوو ، فراوانترین جێگەی داگیرکردبوو لە مێشکی زاناکانی ئەو سەردەمەداو کارێکی تەواوی تێ کردبوون ، بە درێژایی (17) سەدەو بەلکو زیاتریش ، چونکە ئەم بیرو ڕایە تەماعێکی زۆری دەدا بە خەلقی ، تەنانەت کاریشی کردبووە سەر ڕەفتارەکانیشیان ، بۆ نموونە زانایەکی بە ناوبانگی وەکوو (ڕۆجەر باکۆن) کە زانا ترین کەسانی ئەوسەردەمەبووە ، پێشی خەوتن‌سەد نوقلانەی لێداوە کە ئادەمیزاد لە دوا ڕۆژدا کەشتی و فڕۆکە دروست دەکات ، تەنانەت ئەم زانایەش کەوتبووە دوای ئەم بیرو بارەوەڕە پڕووچەو باوەڕی بەو زایناری‌یە کۆنە ، زانیاری کیمیای کۆن ، هەبووە . هەروەها زانا (ئیسحاق نیوتن) کە خاوەنی ڕوون‌ترین زەین بووە لە هەموو وەختێکدا ، ئەمیش هەر کیمیای کۆن کاری تێ کردووەو گەلێك کتێبی لەسەر ئەم مەوزوعە کڕیوە ، تەنانەت لە سەدەی هەژدەهەمدا ، جگە لەوەی کە لە ژوورەکەی خوێدا لە کۆلێجی (ترنتی لە کامبرج) کارگەیەکی پچووکی دامەزراندووەو چەند تاقی‌کردنەوەیەکی کردووە بە مەبەستی گۆڕینی کانزایەك بۆ کانزایەکی ترو باوەڕێکی تەواوی بەو ڕەچەتەیە هەبووە کە کۆمپانیایەك لە لەندەن دەری کردووە دەربارەی پتر کردنی زێڕ ، جگە لەمەزانا (روبەرت بۆیل) کە سەرۆکی کۆمەڵەی شایانەبووە لە ئینگلتەرە بایەخێکی زۆری بەم بیرو رایە داوە . ئەو کیمیا گەرە کۆنانە ، لەو سەردەمانەدا ، پایەو مەقامێکی گرنگیان هەبووەو خەلقی زێرێکی زۆریان لێ گرتوون ، کۆشکی شایەك‌نەبوو لە ئەورووپادا یەکێکی لەم کیمیا گەرانە تیادا نەبێت ، چونکە ئەمانە گۆیا ئیشەکەیان گۆڕینی کانزای هەرزان بە های (وەکوو قوڕقوشم‌و تەنەکە) بووە بە کانزای بەنرخی وەکوو زێڕو بەو پێ‌یە پتر کردنی سامانی وولات .

تۆمارکراوەکانی مێژوو وای دەگێڕنەوە کە هەندێك لە پاشاکان ئاڵوگۆڕیان بە کیمیا گەرەکانی خۆیان کردووە وهەندێك لەو کیمیا گەرانە خراونەتە چینی (پلەی) میرەکانەوە ، تەنانەت هەندێك لەو کیمیا گەرانە ڕاستەوخۆ لە پاڵ پاشاکانیاندا ئیشیان کردووە ، دەگێڕنەوە کە ئیمپەراتۆر (ڕۆدۆڵفی دووەم) بەتە نیشت کۆشکە ڕازاوەکەیەوە ، شاری پراگ ، چەند خانوویەکی پچووکی دروست کردبوو کە بریتی‌بوون لە کارگەی کیمیایی ئیمپەراتۆر خۆی ئیشی تیادا کردوون‌و هەتا ئێستاش هەرماون‌و هەتا ئێستاش ئەو شیشی قوڕ قوشمانە ماون کە (ڕۆدۆڵف) هەوڵی داوە بیان‌کات بە زێڕ لە ئینگلتەرە بەر لەوەی کە (تریڤیزان) لە دایك ببێت بە دووساڵ ، پەرلەمان بڕیارێکی

دەرکردووە بۆ قەدەغە کردنی دروستکردنی زیو وزێر بە رێگەی کیمیایی ، دوای ئەمە پاشا (هەنری) چوارەم بڕیارێکی دەرکردو ماوەیدا بە دروستکردنی زیوو زێر لە لایەن هەندێك کەس تایبەتیەوەو لیژنەیەکی لە (10) زان پێکهێنا بۆ گۆڕینی کانزاگان ، بەلام پاشا (هەنری) شەشەم لەوە زیاتر بوی رۆیشت و هانی پیاوە گەورەکان و قەشەکانیدا کە زانیاری کیمیا بخوێنن بۆ مەبەستی دروستکردنی زێر ، بەلکو میری بتوانێت ئەو قەرزانەی کە لە سەرین بیان داتەوە . لە سالی 1445 زاینیدا دوو کەس (ئەدمۆندی ترافورد) و (تۆماس ئەشتۆن) کومپانیایەکیان پێکهێنا بۆ دروستکردنی ئەم کانزا زەردە دل فرینەو توانیات برێکی ئەوتۆ دروست بکەن کە بەش بکات بۆ لێدانی سکەی میری ، کە سکۆتلەندیەکان دەنگو باسی ئەم زێرە ئینگلیزیەیان بیست هەندێکیان لێ پەیدا کردوو شیەیان کردەوە کە تەماشایان کرد بریتیە لە جیوەو مس و کەمێك زێر واتا ئەمە زێرێکی ساختە (قەلب) بووە ، لەبەر ئەوە پەرلەمانەکەیان کۆ بۆوەو بڕیارێکی دەرکرد بە قەدەغەکردنی ئەو زێرە ساختەیە لە ناو چەکەی خۆیاندا بێگومان هەندێك لەو کیمیا گەوە کۆنانە دڵپاك و دلسوز بوون لە هەول و تەقەللاکانیاندا وەکوو مام (تریفیزان) ، بەلام لەگەل ئەوەشدا مێژووی زانیاری کیمیا پڕە لە دەنگو باسی چەندەها مرۆڤی تەلەکەبازو فێلبازی ئەوتۆ کە بە قسەی زل و زمانی لووس خەلقیان فریودەداو زانیاری کیمیایان کردبوو بە گالتەخانە ، قسەکانیان پڕ بوو لە ووشەی ئالوزو نادیارو ناڕوون ، شتی وایان دەکرد کە خەلقی هەتا رادەیەك باوەڕیان پێ بکات ، بۆ نموونە شیشی ئاسنیان دەهێناو دەیان خستە دەفرێکە وە کە گیراوەی خوێی مسی تیادابوو ، ئنجا شیشە کەیان دەردەهێنایەوە خەلقەکە تەماشایان دەکرد کە شیشەکە بە چینێکی تەنکی سوور داپۆشراوە تەلەکە بازەکان وایان تێ دەگەیاندن کە ئەم چینە سوورە زێرە ، بەلام راستیدا زێر نیە بەلکو مسە ، چونکە لێرەدا ئاسنەکە جێگەی مسەکە دەگرێتەوە لە خوێیەکەدا ، ئاشکرایە کە زۆربەی کەرەسە خاوەکان (مواد أولیە = خامات) دەشێت کە کەمێك زیویان زێری سروشتیان تیادابێت ، ئەگەر ئەو کەرەسە خاوە بەباشی لە سەر ئاگر گەرم بکرێت دەشێت کە ئەوبرەکەمە زیوو زێرە بە دەست بکەوێت ، ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئەو کەرەسە خاوە بووە بە زیو یان زێر ، ئنجا ئەو تەلەکەبازانە سودیان لەم کردارە

وەردەگرت بۆ هێنانەدی مەبەستە چلکنەکانی خۆیان ، ئیمڕۆ لە زۆر لە مۆزەخانەکانی ئەوروپادا دەبینین کە گەلێك پارچە کانزای زەرد پیشان دراون کە گۆیا ئەمانە لە دەستکردی کیمیا گەرە کۆنەکانن ، هەروەها بزماری ئاسن ناوەکەی هەلکۆلراوەو پارچە زێری تێ ئاخنراوە بۆ ئەوەی کە بلێن ئەم زێرە لەو ئاسنە دروست کراوە . گەلێك کەس تووشی زیان و نەهامەتیەکی زۆر هاتووە لە پێناوی بەدەست هێنانی بەردی فەیلەسوفەکاندا ، دوور نەڕۆین مام (تریفیزانی) خۆمان کە هەموو موڵك و ماڵەکەی لەم رێیەدا داناو هەر بەوداخەشەوە سەری نایەوە . لاپەڕەکانی مێژوو پڕن لە چیرۆکی ژیانی چەندەها تەلەکە بازی وا کە خۆیان بە پەنگ داوەو پیس ترین مردن مردوون ، بۆ نموونە (مارکۆ براجا دینۆ) کە میری باڤاریا لە سێدارەی داوە ، هەروەها (ولیم دی کرۆ نیمان) کە هەمان رۆژی رەش دی بەدەست (مەرکیز بیروثەوە) ، جگە لە (داڤید بینتەر) کە فێلی لە میری سەکسۆنیا (ئەغستۆس) کرد ، ئەوەبوو کە ئەغستۆس ویستی لە سێدارەی بدات ، کاتێکیان زانی داڤید دەست پێشکەری خۆی کردو خێرا خوێ گوشت . تەنانەت ژنیش لەم کارە ترسناکە بەدەرنەبووە ، لەوانە (ماری زجلرین) کە خۆی بە کیمیا گەر دادەنا ، ئەوەبوو (دوقی برنزویك) کە ناوی (یۆلیوس) بوو سوتاندی . (فەرەدریك) میری( فرتزبرج) سێدارەیەکی دامەزراندو هەمیشە بەو شێوەیە هێشتیەوەو بە زێر بومە خسەرەی ، رووکەشیکرد بۆ هەلواسینی ئەو کەسانەی کە بەلێن دەدەن بۆ دروستکردنی زێرو بە لێنەکانیان ناهێتە دی . لە هاوینی سالی 1867 ز دا سێ فێلباز (ڕوموالدو روکاتانی)ی رۆمانیو (دۆن جۆزیە ماروتو) ی ئیسپانیو (دۆن ئەنتۆنیۆ چیمنیە)ی ئیتالی لە پاریس کۆبونەوەیەکیان کرد وبلاویان کردەوە کەوا رێگەیەکی نهێنی هەیە بۆ گۆڕینیی زیو بە زێر ، بە زیرەکی خۆیان دەیان زانی کە (فەرەنسیسی جوزیف) ئیمپەراتۆری نەمسا ، بە پێی خوو رەوشت و نەریتی خێزانێتی خۆیان ، بایەخێکی زۆر بە کیمیا گەری دەدەن ، هەستان چوون بۆ ڤییەناو بە هەرشێوەیەك بێت خۆیان گەیاندە بەردەمی ئیمپەراتۆرو پێیان ووت کە ئێمە مەزنترین نهێنیمان لایە . بۆ ئەو خاوەن شکۆیەیان گێڕایەوە کە لە ناوچەی (ماریپۆزا) لە کالیفۆرنیا پارچە کانزای سپی ئەوتۆ هەیە کە زێری تیادایە ، ئەم زێرەش بە کاری جیوەو گەرمیی خۆر بەسەر زیوەکەدا

پەیدا بووە ، هەر وەها وتیان «بەلام ئێمە دەتوانین بەرێگەیەکی دەستکرد ئەم گۆڕینە خێرا پێ بکەین ئەویش بەتێکەڵ کردنی زیوو جیوە ، ئێمەش هەروەکوو چۆن لە سروشتدا ڕوو دەدات ، تێکەلاوەکە دەدەینە بەر گەرمی‌یەکی بەتین‌تر وەك تینی گەرمی‌ی خۆر» . (فەرەنسیسی جۆزیف) نزیکەی (10) هەزار ریالی دانێ بەرامبەر بە ئاشکراکردنی ئەم نهێنی‌یەو نهێنی‌یەکەی خستە ژێر دەستی مامۆستا (شرۆتەر) ، ئەو زانایەی کە توخمی فۆسفۆری دۆزیوەتەوەو ، داوای لێ کردن کە خۆی واتا (شرۆتەر) لە پێشدا ئەم تاقی کردنەوەیە بکات بۆ ڕاستو درۆی ئەم سێ زەلامە . (شرۆتەر) تاقی کردنەوەکەی کرد کە تەماشایان کرد هیچ دروست نەبووە نە زێڕ و نە زیوە ، سێ زەلامەکەش لە کوێ هەڵیان دەگریتو لە کوێ دایان دەنێیت ، کەس نەیزانی بە کوێدا بۆی دەرچوون و ملی خۆیان لە سێدارە ڕزگارکرد . تەنانەت لەم دوایی‌یەدا ، نزیکەی پەنجا ساڵ لەمەوبەر ، لە ئەمەریکا ، کارێکی وەکوو ئەمانە ڕووی داوە ، (دوکتۆر ستیفن . هـ . ئیمنس) کە شاعیرو چیرۆك نووس و کیمیا گەرێکی ئینگلیزبووە وای بلاو کردەوە کە شتێکی دۆزیوەتەوە ناوی ناوە (ئەرجێنتارۆم) لەبەردی فەیلەسوفەکان دەچێت ، ئەگەر بخرێتە لاوی زیوو زێڕەوە ڕێژەی زێڕەکە زیاتر دەبێت ، لەم لاشەوە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیش دەستیان کرد بە بلاوکردنەوەی ئەم دەنگو باسەو بە هاراتێکی زۆریشیان پێوەکرد ، (دوکتۆر ستیفن) کومپانیایەکیش پێکهێناو دارشتەیەکی (سبیکە) لەم مادەیە فرۆشت بە میریی کێشەکەی نزیکەی (10) ڕەتل بوو بە (954) ڕیاڵ . خەڵقی کە ئەمەیان بیست وتیان هەبێو نەبێ کیمیای کۆن سەری هەڵداوەتەوەو بەردی فەیلەسوفەکانیش لە خەوە هەمیشەیی‌یەکەی خەبەری بۆتەوە دوکتۆر داوای لە خەڵقی کرد کە بە پارە لەم کومپانیایەدا بەشداری بکەنو پێشەکی قازانجیش بۆ دەست نیشان کردنو بەڵێنی دا کە پیشانگایەك دەربارەی ئەم مەوزوعە بکاتەوە لەو پیشانگا جیهانی‌یەدا کە بڕیاروابوو لە ساڵی 1900 ز دا بکرێتەوە ، پیشانگا جیهانی‌یەکە لە کاتی خویدا کرایەوە کەچی دوکتۆر دیار نەبوو ، بەمە ناوی خرایە وە ٠٠

ئەو لیستە ڕەشەی کە ناوی تەڵەکەبازەکانی پێشووی تیادا تۆمارکرابوو ، هەتا ئیمڕۆش ، کیمیای کۆن ، هەر لایەنگرو دەستو پێوەندی خۆی هەیەو هەر بەم شێوەیەش دەڕوات هەتا ئەفسوونو جادوو گەری باڵی ڕەش بەسەر مێشکی خەڵقیدا گرتبێت . لە فەڕەنسە کۆمەڵەیەکی کیمیایی هەیە پیشەکەیان هەر لێکۆڵینەوەیە لە کردارە کۆنەکانی گۆڕینی کانزاکان . لە سویدیش بەنا وبانگترین نووسەرو ئەدیب کە ناوی (ئۆگە ست شتریندبەرگ) بووە ، باوەڕێکی تەواوی بە شیانی گۆڕینی کانزاکان هەبووەو وتویەتی (خەڵقی لێم دەپرسن ئایا دەتوانیت زێڕ دروست بکەیت ؟ . منیش دەڵێم : دەشێت زانایەك بتوانێت سەجەرەی ڕەچەڵەکی باوکو باپیری پشیلەیەکت بداتێ ، بەلام ئایا مەرجە کە ئەو زانایە بتوانێت پشیلە بخولقێنێت ؟) ئۆگەست وەکوو ئەوانی‌تر هەڵەشە نەبوو ، بەڵکو دەیوت من دەتوانم ڕێگە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەتەڵە پیشان بدەم ، بەلام من ئەوە ناڵێم کە دەتوانم زێڕ دروست بکەم . لە ئەڵمانیادا لە ساڵی 1929 ز دا تۆکمە چی‌یەکیان گرت ناوی (فرانس تۆزند) بوو بە تاوانی ئەوەی کە فێڵی لە هەندێك لە پیاوە دەوڵەمەندەکان کردووە ، یەکێکیش لەمانە سەرداری لەشکر (جەنەراڵ ڤۆن لۆد ندۆرف)ی بەناوبانگ بووە . (تۆزند) سەد هەزار ریاڵی لەم جەنەراڵە وەرگرتووە بەرامبەر بەوەی کە قوڕقوشمی بۆ بکات بە زێڕ ، (تۆزند) یشی هیچی بۆ نەکراو لەشاری (میونیخ) خرایە بەندیخانەوە ، بەلام زمانی هەر درێژو لەکارا بووەو پاکانەی بۆ خۆی دەکردو دەیوت ڕێگەکەی من ڕێگەیەکی زانیاریی‌یانەو ڕاستەقینەیە ، ئێوە ماوەم بدەنێ بۆتانی بسەلمێنم ، ئەوانیش بە ناچاریی داخوازی‌یەکەیان هێنایە دیو بردیان بۆ سکەخانەی میریی‌و لەوێ لەبەر چاوی بەڕێوەبەرو دوو پیاوی شارەزاو جێگری گشتی‌و دادگەرێکدا (قازی) داوایان لێ کرد کە تاقی کردنەوەکە بکات ، مام تۆزند دەستی کرد بە ئیش ، بەلام ئەمان لەپێشدا زوو فریای کەوتن هەموو لەشیان پشکنی‌و هەموو ڕێگەیەکی فڕوفێڵیان لێ بەستەوە و زۆر بەووردی سەرەنجیان لێ دەداو دامودەزگاو داوودەرمانی پاکوو تەواویان خستە بەردەستی ، دوای دووسەعات لە ئیش‌کردن نزیکەی دەیەکی غرامێك زێڕی لە (67) غرام قوڕقوشم دروستکرد ، شارەزاکان ئەم ئەنجامەیان زۆر پێ خۆش‌بوو بلاویان کردەوە کە ئەم کارە بە بیری کەسدا نەدەهاتو مایەی خێرو بەرەکەتێکی زۆرە وویان خەملاند کە کیلۆغرامێك لەم زێڕە تەنها پێنج ریاڵ پارەی تێ

دەچێت . کەچی لەو کاتەدا کیلۆگرامی زێڕ لە بازاڕ بە (700) ریال بوو ، کەوابوو دەبێت هەموو دانیشتوانی جیهان باوەڕ بەم پیاوە بلیمەتە بکەن . بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو لە ڕۆژی دووەمدا شتێکی سەیر ڕوویدا ، بەڕێوەبەری سکە خانەکە بڵاوی کردەوە کەوا (هەرچەندە ئێمە هەموو ڕێگەیەکی دەغەڵمان لەو فێڵبازە بەستبۆوە ، لەگەڵ ئەوەشدا وادیارە کە بەدزییەوە لە دەرەوە هەندێك زێڕیان لە سوتوی جگەرەدا بۆ هێناوە ، ئەم زێڕەش هەر ئەو زێڕە بووە کە (تۆزند) دەیووت من دروستم کردووە) .

کابرا جارێکی تر خرایەوە بەندیخانە کەچی هەر لە زمان نەدەکەوت . لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە : ئایا ئەم هەموو هەوڵ و تەقەللاو ئەرکەی کە دراوە لە پێناوی دۆزینەوەی بەردی فەیلەسوفەکاندا ، بەدرێژایی ئەو سەدانە ، بە فیڕۆ چووە یانە ؟ ئایا ئەو هەموو کارەسات و نەهامەتییە بە یاری منداڵاندا دەنرێت یانە ؟ یان کیمیای کۆن ، وەکوو کیمیاگەری جیانی بەناوبانگ (لیبیگ) دەڵێت کیمیا یەکی راستەقینە بوو ؟ . لە راستیدا کیمیاگەریی کۆن خۆی و ڕووداوەکانی و ئەو ئەرکەی لە پیناویدا کێشراوە ، بە فیڕۆ نەچووە . زانای بە ناوبانگ (فەرەنسیس باکۆن) باسی کیمیای کۆن و ڕووداوەکانی دەکات و دەڵێت : من کیمیای کۆنم وەکوو ئەم چیرۆکە دێتە پێش چاو :- پیاوێك بەر لە وەی کە بمرێت بە منداڵەکانی دەڵێت : من لە شوێنێکی تایبەتیدا لەبن دارمێوەکەدا زێرم بۆ بەجێ هێشتوون کەمردم بچن بۆخۆتان دەری بهێنن و : بەشی بکەن ، کە باوکە مرد منداڵەکان دەستیان کرد بە گەڕان بە شوێن زێڕەکەدا ، لە پێناوی ئەم کارەدا بنی مێوەکەیان هەڵ کۆڵی و چرگژوگیاو کرم ورەکێکی ووشکە وەبووبوگەن هەبوو فڕێ یاندا و زەوییەکەیان پاکو خاوێن و شیکردەوە ، هەرچەندە کە هیچ جۆرە زێڕێکیشیان نەدۆزییەوە ، بەڵام لە کاتی وەرزی بەرهەمدا ترێیەکی زۆریان بۆ خۆیان چنییەوە . هەروەها بەم تەرزەش لە کیمیای کۆندا ، هەرچەندە ئەو گەڕانە بەردەوامەو هەوڵ و تەقەللایەی کە بەشوێن زێڕدا دراوەو ئەنجامی نەبووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بوونەتە هۆی دۆزینەوەی بڕێکی مەزن لەو راستییانەی کە ئیمڕۆ خزمەتی کیمیای نوێ دەکەن ، کیمیا گەرە کۆنەکان بە بێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن ، لە پێناوی زێڕ دروستکردندا ، گەلێك مادەی کیمیایی بە نرخیان دۆزیوەتەوە وەکوو : تێزاب وترشی هایدرۆکلۆریك و ترشی گۆگردیك ، جگە لە شائاو ، واتە ئاوی شایانە (تێکەڵاوێکە لەو دوو ترشەی کە ئێستا باسمان کردن) و زێڕ دەتوێنێتەوە هەروەها لە پێناوی گەڕان بە شوێن تۆوی زێڕدا ، لە سەرە نوێلك و لە تاوبەرماوە وپیسابیدا ، بەدرێژایی چەندەها سەدە ، گەلێك توخمی تازەی وەکوو ئەنتیمۆن (کل) و زەرنیق و بزموث و فۆسفۆریان دۆزیوەتەوە . جگە لەوەی کە گەلێك لەو مادە کیمیاییە بە نرخانەی کە ئیمڕۆ بەکاریان دەهێنین وەکوو : زاخ و بۆرەك و گۆگردیدی باریۆم و لیمۆن دووزی و گەچ و قوڕقوشمی سوورو خوێیەکانی زیو کە شانازیی دۆزینەوەیان بۆ ئەو کیمیا گەرە کۆنانە دەگەڕێتەوە . مادەی گۆگردیدی باریۆم ئەگەر بە رۆژ بدرێتە بەر هەتاو بەشەو دەبریسکێتەوەو لە لایەن (کاسکاریلۆ) کە پینەچییەکی ئیتالی بووە لە شاری پۆلۆنی دۆزراوەتەوە سەرەڕای ئەوەی کە زۆر لەو ئامرازو دامو دەزگایەی ئیمڕۆن لە کارگەو تاقیگەکاندا بەکاریان دەهێنین لە لایەن ئەو کیمیا گەرە کۆنانەوە داهێنراون وەکوو : بۆتەو دەزگای دڵۆپاندن و چەوتەك و گەرماوی ئاویی و تەرازوو ، هەرچەندە بە شێوەیەکی ساکاریش بووبن . ڕێگەی جیاکردنەوەی زێڕیان بە جیوە داهێناوە ، جگە لە دەرهێنانی مادە قلیەیییەکان لە خۆڵەمێشی ڕووەك ، ئەمانە هەمووی وسەرەڕای دۆزینەوەی چەندە کردارو ڕێگەی پیشەسازییانە . بەراستی هەرچەندە نەشیان توانی زێر دروست بکەن بەڵام لەگەڵ ئەوە شدا ئەم پیاوە سەرلێشێواوانە سامانێکی باشیان بۆ بەجێ هێشتووین و ڕێگەیان بۆ کیمیای نوێ تەخت کردووە .

مەوزوعی دروستکردنی زێڕیش ، چۆن (تریڤیزان) چوار سەدە لەمەوپێش بەجێی هێشتبوو هەروا مایەوە . (تریڤیزان) بەر لەوە دەمی لێك بنێت لە سەر نوێنیی مردن لە دورگەی (رۆدس) لێیان پرسی : ئێستا ئەڵێیت چی ، زێڕ چۆن دروست دەکرێت ؟ ووتی : بۆ دروستکردنی زێڕ دەبێت هەر بەزێڕ دەست پێ بکەین .

**سەرچاوەی ئەم باسە**

**کتێبی (بواتق و انابیق ـ قصة الکیمیاء) / دانەری (بەرنارد چاڤی) / لە لایەن دوکتۆر احمد زکییەوە کراوە بە عەرەبی .**

# کـــاروانـی رۆشـنـبـیـری لـه کـوردسـتـانـدا

## لـــه ســـلـێـمـانـی

**« ئاسۆس » : ئامادەی کردووە**

**فیستڤاڵی ساڵانەی پەروەردەی سلێمانی**

مەڵبەندی چالاکی قوتابخانەکانی لەمەڕ بەڕیوەبەرێتی گشتی پـەروەردەی سلێمانی ، بـەهاری ئـەم ساڵی شـارەکەیـان بە هونەری رەسەنی کوردی رەنگینکرد ، ئەو بەرهەمانەی ساڵان بۆ بەغداو پارێزگاکـانی تریـان دەبرد ئـەم ساڵ لە سلێمـانی پێشکەش بە جەماوەریـان کرد ، مـاوەی چەنـد رۆژێك هـۆڵی ئـامـادەیی کـوڕان و هـۆڵی چـالاکی بـەرنـەدەکـەوتن ، لەو بەرهەمانەی پێشکەش کران :

**یەکەم ـ** شانۆنـامەی وێـرانە ، لە نـووسیتی یوسف عـانیو وەرگێرانی رەؤوف حەسەنو دەرهێنانی هونەرمەند زاهیر مەحمود قوتابیانی سانەوی خانزادی کچـانو ئـامادەییی سلێمـانی کوڕانو پـەیمانگـای هونـەرە جوانەکان دەورەکانیان دەبینی .

بەڕێوەبەرایەتی ئەو سێ قوتابخانـەیە لەم بـارەیەوە دەڵێن :

.« ئاشکرایە ئەمڕۆ قوتابخانە وەکو جاران نەماوە کە تـەنیا پێـویستی سەرشـانی بریتی بێت لە لایـەنـە زانیاریەکان ، بەڵکو بە هـۆی گۆڕانی پـەروەردەیی هـەمیشەییـەوە بـوتـە بنکـەیـەکی رونـاکبیـری ، شەوەزەنگی نەزانین رووناك دەکـاتەوە . هـەروەها شانۆش تەنیا وەکو بنکەیـەکی پێکەنـین یان گـریان نەماوە بەڵکو بوتە گۆرەپانێکی پڕ ئامانج بۆ پەروەردە کردنو هۆشمەندی جەماوەر بۆ بەرەو ژیانێکی باشتر . لێرەوە قوتانجانەو شانۆ یەکیان گرتووە ، زانیاریو رووناکی بەیەك گەیشتوون ، ئامانجی شۆڕشگێرانەو هۆشمەندی جەماوەر تێکەڵ بە یەك بوون بۆ گەیشتن بە ئامانجو دوارۆژێکی باشتر » .

لە راستیدا هەرچەندە ئەم قوتابیە لاوانە یەکەم جاریان بوو کە روو بەرووی جەماوەر دەبوونەوە ، بەڵام شایانی رێزو ئافەرین بوون ، ئاواتمان وایە هونەرمەندی سەرکەوتوویان لێ پێ بگا .

هونەرمەند زاهیر مەحموود ، هەوڵێکی تایبەتی لە دەرهێنـانی شانۆگەریەکەدا دابوو ، دەربارەی ئەم بەرهەمەی دەڵێ :

« وێرانەکەمان سپیو پاكو جوانە ، نیەتمان پاكو روونە ، روونە وەکو چاوەکانی ئێوە ، خراپەشمان بۆ کەس نەبـوە . شتێکی سەیر بە دەورمانا دەخولێتەوە ئێمەش لە ناو نوێنی نەرمو شلدا لێی نووستوین ، پرخەی خەومان دێو بێ ئاگاین زۆرمان وتو زۆر هـاوارمان کـرد ئێستـا کـاتی کـردارە ، کـاتی کـرداری دلسۆزانەو بەرهەم دارە ، ئەوەی رۆی : رۆی گرنـگ ئێستاو داهاتوە .

با ئەم شانۆیە شوێنی پەیمان تازە کردنەوە بێت بۆ خـزمەتی هونەری راستەقینە ، گەلی کورد ببێت بە خزمەتگوزار لە کاروان سەرەرای هەموکاروانێکی هونەری راستەقینەدا ئەگەر بمانەوێ وابکەین ، ئەتوانین »

لەم شانۆگەریەدا هەن ئەیانەوێ لانەی خەڵکی بکەنە وێرانە ، دەرەبەگ جوتیار ئەچەوسێنێتەوەو لەگەڵ خۆشبەویستەکـەیی لێکیان دائەبڕێو شوێنەواریان لێ وێران ئەکات ، رەنجەدەرێکی زەحمەت کێش هەموو خۆشی ژیانی نیگایەکی چاوی ئافرەتێکی چەوساوەی وەك خۆیەتی ، لەو نیگایەش بێ بەری ئەکرێ بە هۆی چاوچنۆکیو بێ ئابڕوویی چینە بەرەو ژوورەکانەوە . ماف زەوتکردن ، مرۆڤ لە مرۆڤایەتی خستن ، ئازاردان . بەڵام لە ئەنجاما دەنگی هەموو چەوساوەو ماف خوراوەکان ئەبێتە یەك دەنگو خۆشیان ئەبنە یەك کەس ، واتە یەك ریز بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەوانەی ژیانیان لێ تاڵ کردوون .

وەرگێرانەکەی چیرۆکنووس رەؤوف حەسەن رەوانو پاراوبوو زۆر لە زمانی شانۆوە نزیكبوو .

ئەو قوتابیانەی دەورەکانیان دەبینی ئەمانە بوون :

شەهلا صالح حسینو هیوا عەزیزو ئاراس طیبو میدیا رەؤوف

ورەناك حەمە رەزاو لەتیف عەبدوللاو كامەران رەفیقو شەونم مەحموودو ئاسۆ عوسمان مارفو كاوە قادرو رزگار قادرو ئەحمەد مەحموود میوانی شەرەفمەندی شانۆگەریەكەش مامۆستا كەمال دلشاد بوو كە دەوری « كور » ە بورجواكەی دەبینی ،چەپكە گوڵی تایبەتیمان بۆ ئەو كیژەی دەوری ( فاتە ) ی كارەكەرو ئەو لاوەی دەوری ( قالە ) ی بەسزمانی دەبینی .پیرۆزباییمان بۆ دەرهێنەر ، كاك زاهیر مەحموودی هونەرمەند .

**دووەم - شانۆ نامەی [ ئەنتیگۆنا ] : نووسینی : جان كۆكتۆ**
وەرگێرانی : سەلام فەرەج كەریم ، دەرهێنانی : هونەرمەند جیهاد دلپاك ، ئەم شانۆ نامەیە بریتییە لە تۆڵە سەندنەوەی كریۆن لە وانەی بە ناحەزی خۆیان دادەنێ ، تەنانەت فەرمان ئەدا كە نابێ لاشەی دوشمنەكەی بنێژرێ ، لە كاتێكا ئەنتیگۆنا دەیەوێ تەرمی براكەی بشارێتەوەو سەرپێچی فەرمانی پاشا ئەكا ، ئەیگرنو فەرمانی كوشتنی دەدرێ ، ئەوەش بۆی نابێ بە پاكانەكە خۆشەویستی هیمۆنی تاقانە كوڕی كریۆنە . هێمونیش لەتاو خۆشەویستەكەی ، خۆی ئەكوژێ ، كە ئیریدلیسی شاژن بەم كارە رەها تە دەزانێ ، ئەویش لە عەزرەت كورەكەی خۆی ئەكوژێ . تەنیا كریۆن خۆیو تاوانەكانی روو بەرووی یەك دەبنەوە .. تازە پەشیمانیش هیچی لەدوا نییە . هونەرمەند شەمال عبدالله رەش سەركەوتوانە دەوری كریۆنی دەبینی ، شەماڵ عومەریش لە دەوری هیمۆنا زۆر سەرنج ڕاكێشەر بوو .

قوتابیانی خانەی مامۆستایانو ئامادەیی سلیمانی كورانو پیشەسازیو ئامادەیی سەلاحەددینو ئامادەیی كشتو كاڵو ئامادەیی كوردستانی كچان بەشدارییان لە نواندنی شانۆ نامەكەدا كردبوو .
دەورەكانیشیان بەم شێوەیەبوو :
كوردستان ئەحمەد : ئەنتیگونا
نەسرەت ئەلماس : ئەسمینیا
كەریم قادر : پاسەوان
دلسۆز ئەحمەد : ئیریدلیس



بەكر رەشید : ترسیاس
كامیل فەخرەددین : سەرۆكی كۆرس
رزگار ئەمین : پەیامبەر
نزار ئەمین : پاسەوان
سۆران محمد طه : =
عادل عەلی : منال
هۆشیار قادرو پێشرەو رەفیقو سامان محمد امین وئەمین ئەلماسو جەلال كەریم ئەمینو ئەبو بەكر رەحمانو عومەر سالحو تاریق غەریبو ئەبو بەكر حەمە رەشیدو ئیسماعیل عوسمانو ئەسعەد موحەمەدو فریا موحەمەدو كاوە حەمە پاشاو موحەمەد رەزا ، ئەم قوتابیانەش كۆرس بوون .
هونەرمەند جیهاد دلپاك دەرهێنەری شانۆ نامەكە ئەلێ : « مرۆڤی سەربەستو ڕاستگۆ بە ئاسانیو بە درۆ نالێ : بەڵێ ، بەڵكو ئەلێ : « نەء » كە داوای لێكرا كارێك بە ئەنجام بهێنێ ، كارێك كە بڕوای پێی نەبێت ، هەروەهاش ئەگەر بڕوای بە كاری بوو ، یان بە هەڵویستێك ئەلێ : بەڵێ . ئەگەر چی لە ئەنجامی ئەم هەڵویستەشیا ژیانی خۆی بەخت كردووە .
ئەنتیگۆنا نموونەی مرۆڤی ڕاستگۆو سەربەستە لە هەڵبژاردنی هەڵویستی خۆی بەرامبەر بە فەرمانی كەسانی تر . » .

**سێیەم - فیستڤاڵی گۆرانیو مۆسیقاو هەڵپەركێ :** دوای تەواوبوونی هەفتەی شانۆگەری ، ئەمجا پۆل پۆل خەڵكی روویان ئەكردە هۆڵی ئامادەیی كوران بۆ بەسەربردنی كاتێكی یەكجار خۆش لەگەڵ تیپی مۆسیقای نەورۆزو تیپی مۆسیقای پیرەمێرد ، كە هەردووكیان سەر بە بەڕێوەبەرێتی چالاكی قوتابخانەكانن .
ئەو چالاكیە هونەرییانەی لەو ڕۆژانەدا پێشكەش كران بەرەو دوا ئەمانە بوون :

* گەشتی بناران : بریتی بوو لە چەند هەڵپەركێیەكی كوردی لێكدراو . ڕاهێنانو ئامادەكردنی : فەرەیدون دارتاش مۆسیقای : جەمال شادانو جەمال كابانو صباح احمدو زانا محمودو ئاكۆ عەزیز . تابلۆی رەنجی جوتیاران

: ڕاهێنان و ئامادەکردنی فەرەیدون دارتاش ، مۆسیقای جەمال شادان و جەمال کابان ئەو قوتابخانانەی بەشدارییان کردبوو ئەمانە بوون :

1 — سانەوی کوردستانی کچان
2 — ئامادەیی سلێمانی کچان
3 — قوتابخانەی ناوەندی شیلان و پەیامی کچان
4 — خانەی مامۆستایانی کچان
5 — ئامادەیی هەڵکەوتی کوڕان
6 — ئامادەیی پیشەسازی
7 — سانەوی سەلاحەددین
8 — سا نەوی رۆشنبیر
9 — ئامادەیی ئەزمر
10 — ئامادەیی سلێمانی کوڕان

* سروودی لاوان ـ ووتنی کۆرس ، ئاوازو دابەش کرد نی صەلاح رەؤوف ئامادەکردنی ـ ئەنوەر قەرەداخی .
* گۆرانی دەباریٚ ووتنی دووقـۆڵی ئاشناو بەناز ، ئاوازو دابەش کردنی : ئەنوەر قەرەداخی
* گۆرانی خەندەی بەهار ووتنی : عدنان و شیرین ئاوازو دابەش کردنی : ئەنوەر قەرەداخی
* سەمفۆنیای [ ئۆڤەرتیری ] ـ سەرتاشی ئەشبیلیە ڕاهێنانی : سەلاح رەؤوف

دەربارەی ئەم مۆسیقایە ، هونەرمەند ئەنوەر قەرەداخی ووتی :

« پارچە مۆسیقایەکە پێی دەوترێ [overture] لەپێش ئۆپێرایەکەوە لێ ئەدرێ کە هونەرمەندی بە ناوبانگی ئیتالی « جـواشلیـو ئـەنتـونیـو روسنـی » ( 1792 — 1867 ) لە



20/2/1816 لەسەر شانۆی ( رتیوری ئەرجەنتینا ) لە رۆما بۆ یەکەم جار پێشکەشی کردووە .

ئەم مۆسیقایە سەرەتای کردنەوەی ئۆپێراکەیەو لە فۆلکلۆری ئیسپانییەوە وەرگیراوە . ئەم مۆسیقایە وردەکاری هەست و ناخێکی بەرزی تیادایە بەجۆرێك ئەگەر ئۆپێراکەی لەگەڵدا ببینرێ یەکسەر گوێ گر هەست ئەکات ئەم ئاوازە تایبەت بۆ ئەم ئۆپێرا کومیدیە دانراوە .

ئەوەی شایانی باسە ئەم تیپە خنجیلانەیە کە ئەم مۆسیقایە پێشکەش ئەکات بەپێی توانای خۆی سەرەتایەکی گەشەدارمان بۆ والا ئەکاتەوە ، ئەویش ئەوەیە [ هونەرمەندی کورد لەو توانایەدایە ئەگەر کەرەسەو پێویستی‌ی هونەری بۆ برەخسێنرێت ئەی سەلمێنێ کە خاوەن هونەرەو شان بەشانی هونەری میلەتانی جیهان دەڕوات . ] لەم مۆسیقایەدا هەندێ ئامێر بەکار نەهێنراون کە تایبەتن لە ژەنینی ئەم مۆسیقایەدا ، بۆ نمونە فاجووت ، ئوبوا ، هەندێ ئامێری تر . چونکە ئامێر ژەنی ئەو ئامێرانەمان نییە لەبەر ئەوە هەندێ ئامێری ترمان بەکار هێناوە »

ئەوەی شیاوی باس بێ ئەنوەر قەرەداخی و محمد أمین حسن لەم مۆسیقایەدا بەشدارییان کرد ، صەلاح رەؤوفیش سەرکردایەتی تیپەکەی ئەکرد ئەو قوتابخانانەی بەشداری ئەم چوار چالاکیەی دواییان کرد : لە کچانا ناوەندی ژین ، شیرین ، ئامادەیی سلێمانی ، سانەوی کوروستان . لەکوڕانیشا : رۆژهەلات ، کاوە ، هەڵکەوت ، سەلاحەددین ، بە هاوکاری قوتابخانەی بێخودی سەرەتایی کوڕانەو ، (23) قوتابیش ئامێر ژەن بوون .

* لە چالاکیەکانی تیپی مۆسیقای نەورۆزو لە ئامادە کردنی عوسمان محمد أمین و ڕاهێنان و سەرپەرشتی خالد سەرکار ئەم چالاکیە دیارانە پێشکەش کران :

1 — سوناتای ڤینیسیا : دانانی مۆزارت .
2 — گۆرانی ئێوارەی پاییز : ئاوازی نەوزاد مەحمود وتنی : ئالا عومەرو حەمە جەزا قادر ، ئامادەو دابەش کردنی : خالد سەرکار ..
3 — گۆرانی هەنگە بچکۆلە : هۆنراوەی : ع . ع . شەونم ووتنی : ئالا عومەر : ئاوازو دابەشکردنی : خالد سەرکار

4 – مۆسیقای لە یادی « فەرمان »
دانانی قوتابی : بەختیار محمد کریم
دابەشکردنی : خالد سەرکار
(19) مۆسیقا ژەن و کۆمەڵێك کۆرسی کچان و کوڕان تیایا بەشداربوون

## « چالاکی هاوبەشی نێوان هەردوو تیپ « نەورۆزو پیرەمێرد »

1 – (35) مۆسیقا ژەنی کوڕو کچ خۆشترین ئاوازیان بە گوێی دانیشتوانا ئەدا ، لەو هۆڵە گەورەیەدا کە کورسی یەکی چۆڵ بەدی نە ئەکراو ژمارەیەکی زۆریش خەڵك بە پێوە ڕاوەستابوون ، لەگەڵ دەنگی مۆسیقادا هۆڵەکە کش و مات دەبوو ، بە پەرۆشەوە گوێگران دەچوونە جیهانی مۆسیقای پاك و بێگەردەوە .

لە سەرەتادا لە ئامادەو دابەشکردنی خالد سەرکار سرووی [ واوەرن ] پێشکەش کرا . دوای ئەوە پارچە مۆسیقایەك بەناوی ( زەردەخەنە ) وە لە دانان و دابەش کردنی فرنسیس دادود یوسف ئەمجا گۆرانی [ بەخێربێن ] هۆنراوەی عوسمان شارباژێری و ئاوازی سەیاح محمدامین ، ئەم گۆرانییە ( چیاو پەری ) بە هاوکاری کۆرسی کوڕان و کچان پێشکەشیان کرد .

2 – پارچەیەك مۆسیقا بە ناوی [ ڕەوت ] دانان و دابەش کردنی ئەنوەر قەرەداخی ئەوەی جێی باسە ئەم دوو تیپە مایەی دڵخۆش بوونی خەڵکەکە بوون وە هیوای دوارۆژێکی روونیان لێدەکرێ .

## ئۆپەرێتی : دارستان

ئامادەکردن و دەرهێنانی : جیهاد دڵپاك
سەبارەت بەم ئۆپەرێتە مامۆستا کاوە ئەحمەد میرزا دەڵێ :
« ئەم ئۆپەریتە دەربارەی دارستانی دێی [ خەزان ] دەدوێ کە لە میرنشینێکی نزیکیانەوە هێرشیان دێتە سەر بۆ بڕینی دارستانەکەیان و ، تا بەو گڕەی دەوروبەری کوڕی میر رووناك ببێتەوە ، چونکە وەك ئەفسانەکە دەری دەخات دەبوو تا 40 شەو میرنشین شەوانی رووناك بێ ، نەبا زەفەر بە کوڕی میر ببرێ .

جەماوەری چەوساوەی دێی خەزان ڕای خۆیان یەك دەخەن و بە توندی بەرگری لە خۆیان و دارستانەکەیان دەکەن ، وە لە ئەنجامدا هێزی میلەت بەسەر هێزی زۆردارا سەردەکەوێ ، زەردەخەنەی خۆشی دێتەوە سەر لێوەکانی کوڕو کاڵی دێی خەزان . »

ئۆپەرێتەکە ئەم هونەرمەندانە ئاوازیان بۆ دانابوو .
1 – گۆرانی : زەوی جوانە ، لەگەڵ گۆرانی خۆشییە لە میرنشین دانان و دابەشکردنی : فرنسیس داود یوسف
2 – گۆرانی ، سەردەمێ بوو ، لەتەك گۆرانی بازوو هەڵکەن دانان و دابەشکردنی : خالید سەرکار
3 – بەهێزی بازوو ، دانان : ولیەم یوحنا ، دابەش کردن : سەلاح ڕەؤوف جووڵانەوەکانی ئۆپەرێتەکە : فەرەیدون دارتاش دانەرو ڕاهێنەری ، بوو، خالید سەرکارو ولیەم یوحەنا مەشقیان بە کۆرسی ئۆپەرێتەکە کردبوو .

بەم شێوەیە جارێکی تریش هونەرمەندانی شاری سلێمانی سەلماندیان کە هەمیشە هەڵگری مەشخەڵی هونەری کوردین .

## پیشانگەی خالید زامدار

بەرێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی ، لەم ڕۆژانەی دواییدا ، دووەم بەرهەمی هونەرمەند خالید زامداری لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی بۆ ماوەی هەفتەیەك پێشکەش کرد ، ژمارەیەکی زۆر لە هونەرمەندان و هونەر دۆستان سەریان لە پشانگەکەدا . ئەم هونەرمەندە لە ساڵی 1945 لە شاری سلێمانی لەدایك بووە ، هەر لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە هۆگری بواری هونەرە ، تائێستاش دیوارەکانی بەرامبەر نیشتەجێکەی هەموو هەفتەیەك بە تابلۆو شیعری هەمە جۆر دەرازێنێتەوە .



# لــــە هــــەولــێـــر

**شوان : ئامادەی کردوە**

**پێشانگای ڕۆژنامەگەری کوردی**

ڕۆژی سێشەممە 1983/4/26 نەقابەی ڕۆژنامەنووسەکانی ناوچەی کوردستان ـ مەڵبەندی گشتی لە پارێزگای هەولێر ـ پێشانگایەکی ڕێکوپێکی خنجیلانەیان بە یادی بیرەوەری دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی‌یەوە سازکرد .



لەم پێشانگەیەیدا 31 تابلۆی تیابوو ، زوربەیان هونەرو شیعر تیایانا دەستیان لەملی یەك کردبوو ، لەو تابلۆیانەی سەرنج ڕاکێشەر بوون :

* لەسەر ڕێگای ئاش : ئەم تابلۆیە پارچە شیعرێکی گۆران بوتە هەوێنی .. کە ئەڵێ :

**لەسەر ڕێگای ئاش قازو مراوی**
**چاوەرێی ڕۆژن هەڵبێنی چاوی**
**بەڵام تا خولقی نەکا چێشتەنگاو**
**نایەتە ناو دێ پرشنگی هەتاو**

* تابلۆی ناو ڕێگا تەق تەق ئەمەش ئیلهامی شیعرێکی مامۆستا گۆرانە کە ئەڵێ :

**ناو ڕێگا تەق تەق لارێ بەردی زل**
**کە هێشتا کەردوون پێی نەداوە تل**
**گاە سەرەو ژوورە گاە سەرەو خوارە**
**تاڵ و شیرینی دنیاری ڕێبوارە**

* تابلۆیەك بە ناونیشانی : جیهان ئاشە

ئەمەشیان جێ پەنجەی شیعرێکی عەلی کەمال باپیری تیابوو کە هونەرمەند لە ژێریا دەقی شیعرەکەی نووسیبوو

**جیهان ئاشە زەمین و ئاسمانیش**
**هەردوو بەرداشە**
**ئەمان هارێ بە وێنەی دانەوێڵە**
**ئاخری ئەم ئاشە**

* تابلۆی ( سەرچاوەی ئاوێك )

بەم شیعرەی مامۆستا گۆران ڕازابوەوە

**سەرچاوەی ئاوێك کەڵەکێك لەسەر**
**ژنێ تێی ئەچێ ، ژنێ دێتە دەر**
**ئەمە لە لادێ کانی ژنانە**
**قیبلەگای دڵی هەرزەکارانە**

* داری ئازادی

ئەمەشیان شیعرە بەناوبانگەکەی بێکەس بووبوە چوارچێوەی کە ئەڵێ :

داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ

جگە لەم تابلۆیانەی باسمان کردن چەند تابلۆیەکی تریشی جوان و ڕەسەن بوون ، وەك :

* من کۆترێکی بێ دەسەڵاتم
* لای من گوڵاڵە بۆیە پیرۆزە
* هونەری ڕەسەن
* پەپوولەی باڵ هەڵوەریو
* پڕ بە گەرووم ئەقاسپێنم
* سەرو سیمایەك ئەمەندە جوان بێ
* لەبیرتە تۆمان ئەوەشاند .

هیوامان وایە ئەم هونەرمەندە لە بواری هونەردا سەرکەوتوو بێ و لە بەخشینا بەردەوام بێ .



پێشانگاكە بریتی‌بوو لە زۆربەی ئەو رۆژنامەو گۆڤارە ئەدەبی‌و رۆشنبیری‌و كۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌یە كوردانەی لە رۆژی لە دایك‌بوونی یەكەم رۆژنامەی كوردی‌یەوە تا دەرچوونی گۆڤاری كاروان .

پێشانگاكە بەم شێوەیە رێكخرابوو :

1 – رۆژنامە كوردی‌یەكان : ـ لەوانە :

* رۆژنامەی كوردستان [ 1898 – 1902 ] كە تا ئێستا بە یەكەم رۆژنامەی كوردی دائەنرێت‌و رۆژی دەرچوونی كراوە بە جەژنی رۆژنامەگەری كوردی .
* رۆژنامەی پێشكەوتن ( 1920 ) .
* رۆژنامەی رۆژی كوردستان [ 1922 ] كە خاوەنی [ ئیمتیازو مدیری مەسؤول ( م . نوری ) ] بوو .
* رۆژنامەی بانگی كوردستان ( 1922 ) كە لەلایەن مستەفا پاشای یاملكی‌یەوە دەرئەچوو ، وە ماموستا رەفیق حیلمی ( محرری ) بەشی توركییەكەی بووە .
* رۆژنامەی دیاری كوردستان ( 1926 ) .
* رۆژنامەی ژیان 1926 .
* رۆژنامەی هەولێر كە لە ساڵانی پەنجاكاندا لە شاری هەولیر دەرئەچوو .
* رۆژنامەی هاوكاری كە لە ساڵی 1970 وە لە لایەن دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوكردنەوەی كوردی‌یەوە تائێستا بە هەفتانە دەرئەچێت .

2 – گۆڤارە كوردی‌یەكان : ـ لەوانە :

* گۆڤاری رووناكی لە ساڵی ( 1935 ) دا لەلایەن پارێزەر شیت مستەفاوە دەرئەچوو .
* گۆڤاری گەلاوێژ كە یەكەم ژمارەی لە ساڵی ( 1939 ) دا لە بەغدا دەرچووە .
* گۆڤاری شەفەق كە یەكەم ژمارەی لە [ 15 ] كانوونی دووەمی 1958 دا لە شاری كەركوك دەرچووە .
* گۆڤاری رۆژی نوێ ژمارەیەكی لە نەورۆزی ساڵی 1960 دا لێ دەرچووە .
* گۆڤاری هەتاو لە هەولێر لەلایەن گیوموكریانی یەوە دەرئەچوو .
* گۆڤاری دەفتەری كوردەواری لە حەفتاكاندا لە شاری بەغدا لەلایەن دكتور مەعروف خەزنەدارەوە دەرئەچوو .
* گۆڤاری ( بەیان ) و ( رۆشنبیری نوێ ) لەلایەن دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوكردنەوەی كوردی‌یەوە لە بەغدا دەرئەچێت .
* گۆڤاری كاروان لە شاری هەولێر لەلایەن ئەمینداریتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوانەوە دەرئەچێت .

شایانی باسە لەگەڵ ئەوەی كەلێ رۆژنامەو گۆڤاری كوردی ئەوتۆ هەبوون كە رۆڵێكی مەزن‌و گرنگیان بینیوە لە پەرەپێدان‌و گەشەكردنی زمان‌و ئەدەب‌و رۆشنبیری كوردیدا كەچی لە گەڵ ئەوەشدا لەو پێشانگا خنجیلانەیەدا رۆشنبیران بە دیداری شاد نەبوون ، دیارە ئەوەش هەر لە ئەنجامی چنگ نەكەوتنی ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەوەبووە ، ئەگەرچی هەندێكیان تەنیا بەرگەكەیان بە ئۆفسێت . وێنەی گیرابووەوە ... لەوانە : رۆژنامەی تێگەیشتنی راستی ، گۆڤاری روانگەو رۆژی‌نوێ‌و هەردوو دەستە خوشكان گۆڤاری [ دیاری لاوان‌و یادگاری لاوان ]

نواندنی چالاكی‌و سازكردنی ئەو جۆرە پێشانگایانە لەلایەن نەقابەی رۆژنامە نووسانی ناوچەی كوردستانەوە ، وەك ئەركی سەرشان‌و هەوڵێكی سەرەتایی هەنگاوێكی بەجێ‌و كارێكی بەكەڵك‌و جێی رەزامەندی جەماوەری ئەدیب‌و رۆشنبیرانە .

## كۆمەڵە تابلۆیەكی خنجیلانە و هونەرمەندێكی چكۆلانە

لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەری لە هەولێر بۆ ماوەی سێ رۆژ پێشانگایەكی رازاوە لەلایەن ئەمینداریتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوانەوە بۆ ( هونەر عەبدولواحد مەرجان ) سازكرا .

رۆژی شەممە 1983/4/19 ماموستا محەمەد ئەمین محەمەد لەگەڵ كۆمەڵێ رۆشنبیرو هونەر دۆستان پێشانگاكەی كردەوەو بە چاوێكی پڕلە رێزو تەقدیرەوە ئامادە بووان بیروڕای



خۆیان سەبارەت بەرکولی بە تام و بۆ وبەرهەمی دەست ڕەنگینی ( هونەر عەبدولواحد ) دەربڕی و ڕاستەوخۆ سۆزی خۆیان بەرامبەر تواناو بەهرەی ئەو منالە دەربڕی ، بەراوردکردنی بەرهەمەکە لە گەل تەمەنی منالیدا جێی شانازی یەو چاوەڕوانی داهاتێکی ڕووناکی لێ ئەکرێ و پیان وابوو لە چاو تەمەنیدا هەنگاوێکی باشی بەرەو پێشەوە ناوە .

### هونەرمەند لە دێراوی چەند وشەیەکدا

* [ هونەر عەبدولواحد مەرجان ] تەمەنی چواردە بەهارەو لە شاری هەولێر لە 1970/3/11 دا چاوی بەدنیای ڕۆشن هەڵهێناوە .
* قوتابخانەی سەرەتایی هەر لە شاری هەولێر تەواو کردووەو ئێستا قوتابی یە لە پۆلی دووی ناوەندی برایەتی .
* هەرلەو ساتەی مۆسیقاو نیگارکێشان دوو دنیای سەرنج ڕاکێشەری بوون ، لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی یەوە هۆگرو هاوبەشی چالاکی یە هونەری یەکانی قوتابخانە کەیانی کردوە .
* بەشداری لە چالاکی تیپی مۆسیقای مەڵبەندی ( مدرسە الرعایة النموذجیة المختلطة ) داکردوە .
* لەم چوار ساڵەی دوایی یەدا هاوبەشی پێشانگای هونەری قوتابخانەکانی پەروەردەی هەولێری کردوە .
* ساڵی 1979 خەڵاتی مهرەجانی ( هەرێمی ) منالانی لە بەغا وەرگرتووە .
* دوا چالاکی ئەم پێشانگایە یە کە [ 18 ] تابلۆی زەیتی دیمەنی هەمەجۆری سروشتی پێشکەش کرد .

### عەشقی هونەر

هیچ کارو ئەنجامێکی گەش و بەجێ نایەتەدی ، گەر خۆشەویستی و عەشقێکی پیرۆزو هەوڵ و تەقەلایەکی هەمیشەیی لەگەڵدا نەبێت ، پەروەردەی چاك ، ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پێگەیاندن و خەملاندنی کەرەسەی لەبار ، ژیانی ناو خێزانیش بە شێکی نەبڕاوە لە تێکڕای کۆمەڵ و یاساو ڕێساکەی .

( هونەر عەبدولواحد ) سەرەتای ئاشنابوونی هونەری بۆ پەروەردەو ڕێنمایی ژیانی ناو خێزانەکەی ئەگەڕێتەوە ، یەکەم ماموستای سروشتی دایەو بابەیە ... هونەری هونەرمەند شوێن پێی باوکی هەڵگرتووە ، سەرەرای خۆشەویستی نیگارکێشان عاشقی دنیای مۆسیقاشە ، لەو لاوە ئاوازی مۆسیقاو لەم لاشەوە تابلۆی بێ ڕتوشی سروشتی ولاتەکەی ... هەر کە دیمەنێکی سروشتی جوان و دلگیری بینیبێ یان وێنەیەکی خەیاڵاوی تەلی هەستی لەراندبێتەوە ، دەم و دەست لای ( هونەر ) بێ زۆر لە خۆکردن و بەپێی توناولێهاتویی خۆی ڕەنگی داوەتەوەو خێرا ئەو عەشقە پیرۆزەی لە نووکی خامەی ڕەنگە خۆشەویستەکانی یەوە ڕژاندوتە سەر ( کاغەزێك ، مقەبایەك ، پارچەتەختەیەك ) هونەر یان هونەرمەند و ئیدی تابلۆیەکی ساوا لە دایك بووە .

لە سەرەتادا ( هونەر عەبەالواحد ) بە ڕەنگی ئاوی و ماجیك و باستیل وێنەو نیگارو تابلۆکانی نەخش ئەکرد ، ئەوسا وردە وردە پەل و پۆی بەهرەی هونەری رووەو ڕێبازو قوتابخانە تازەکانی نیگارکێشان و کەرەستە تازە بەکارهاتوەکانی سەردەم کشاوە ( ئەمە بێ ئەوەی خۆی شارەزای لەو قوتابخانەو ڕێبازە هونەریانە دابێت ) .

( هونەر ) ماوەی دوو ساڵێکە هەوڵ و تەقەلای خۆی بۆ تابلۆی زەیتی تەرخان کردوە تابلۆکانی ئەم پێشانگایەی کە بریتین لە ( 18 ) تابلۆی زەیتی ، ڕەنگدانەوەی بیری تیژی منالی و هەستی ناسکی دەرئەخەن و لە زۆر لایەنەوە خۆیان ئەنوێنن ... لەوانە : دیمەنە سروشتی یەکانی [ ڕەواندز ، چیای سەفین ، چۆن ژیان ئەبینم ، گوندەکەم ، جوانی ... تادوایی ]

جێی سەرنجە ، پێشانگای ئەم هونەرمەندەی تەمەنی لە 13 ساڵ تیپەڕ ناکات ، جێی ڕەزامەندی بینەران بوو ، ئەوەی شایانی باس و جێی هیواو دڵخۆشی یە ( هونەر عەبدولواحد ) بە کەیف و دڵنیایی یەوە ، بیری وردی خۆی لەمەڕ تابلۆکان بۆ بینەران دەرئەخست و بەوپەری بڕوا بە خۆکردنەوە بەرگری لە واقیعی ڕاستگۆیانەی تابلۆکانی ئەکردو بە شادی یەوە سەرنج و بۆچوونی بینەرانی وەرئەگرت ، تا لە دوا ڕۆژی دنیای هونەری دا ڕەچاویان بکات و کەڵکیان لێ وەربگرێت و تاقیکردنەوەی نوێی لێ دروست بکات .

# پۆستەی کاروان

● ئامادەکردنی ـ سۆران حەریری ●

خوێنەرانی ئازیزو هێژا ، وا دووبارە پۆستەی « کاروان » پێتان دەگاتەوەو شادومانە کە لە ژمارەیەکی تری گۆڤارەکەتاندا چاو بەچەند نامەیەکی ئێوەی ئازیزدا بگێڕیتەوەو وەلامی ئەو برا خۆشەویستانەش بداتەوە کە بەبەرهەمەکانیان « کاروان » یان بەسەر کردۆتەوە ..

خوشکو برا ئازیزەکان ، ئێمە بۆ جارێکی دیکەش دڵنیاتان دەکەینەوە کە لاپەڕەکانی کاروان هەمیشە بۆتان کراوەیەو هەردەم دەرگا لەسەر پشتە بۆ هەموو ئەو دۆستو برا شیرینانەی کە خامە ڕەنگینەکانی خۆیان تاو دەدەنو بەرهەمی خۆیانمان بۆ دەنێرن ، ئەوەش ڕادەگەیەنین کە ناردنی ئەو بەرهەمانەیان خزمەتێکی پیرۆزە لە بواری دەوڵەمەند کردنی گۆڤارەکەمانو بەرەوپێش بردنی کاروانی ڕۆشنبیری کوردی دا ..

دەبا هەر لەم ڕوانگەیەشەوە ڕووبکەینە ئەو مەیدانەو خێراتر ئەسپی خۆمان لە مەزرای خوێندنەوەی زیاترو خۆرۆشنبیرکردندا تاوبدەینو لێی دوو دڵ نەبین ، لە هەمان کاتیشدا با ئەوە بزانین کە هەموو سەرکەوتنێك لە هەوڵدانی بەردەوامو بروا بەخۆ بوونەوە سەری هەڵداوەو بەرە بەرە بەرەو پۆپە ڕۆیووەو شوێن پێی خۆی قایم کردووەو ئامانجی پێکاوە ..

دەبێ ئەوەش بزانین کە بەرهەمێك یا بابەتێك لەبەر لاوازی وەیا زۆر هۆی تر بلاو نابێتەوە شتێکی ڕاستەو هیچ گەردێکی بەسەرەوە نییە ، بەڵکو لەوانەیە هەر بەخۆشتان حەز بەوە نەکەن بابەتو بەرهەمی کزو لاواز بەسەر لاپەڕەکانی کاروانەوە ببینرێنو ببنە جێی گلەیی خوێنەران .. دەسا با لەمەودوا هەوڵ بدەین بەرهەمی چاکو بەکەڵك ئەنجام بدەینو پێشکەش خوێنەرانی بکەین ..

ئیتر وا لێرەدا دەوەستینو گەشتێکی تر دەکەین بەنێو ئەو نووسینو نامەو بەرهەمانەی کە پێمان گەیشتوونو وەلامی ئەو خوشكو برا ئازیزانەمان دەدەینەوە کە هاریکاریمان لەگەڵدا دەکەنو دڵسۆزانە بەدەنگمانەوە دێن .. ئەمانەیش بەشێکن لەو نامانەی کە پێمان گەیشتوون ، هیوا دارین لێمان ڕازی بنو هەربژین ..

● بۆ هەردوو دۆستە ئازیزەکەی گۆڤارەکەمان کاروانو سازان حەیدەری ، پڕ بەدڵ سوپاستان دەکەینو هیوادارین هەمیشە وێنەتان زۆر بێتو لەم هاوکاریەتان بەردەوام بن ، بێگومان بەشداریکردنتان لە گرەوی « کاروان » دا بە ناردنی دوو نەخشەی جوان بۆ بەرگی گۆڤارەکەمان مایەی شانازیو بەختەوەریمانە کە دوو مندالی ئێسك سووکی وەکو ئێوە وا بەگەرمیەوە بەدەنگ بانگەوازەکەمان هاتوونو دیاری خۆتانتان پێشکەش کردووین ، ئێمە دووبارە پڕ بەدڵ داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەینو هەربژین ..

● خوشکی ئازیزمان نەبەز کۆیی ، شادومانین کە خوشکێکی دڵسۆزی وەك ئێوە وا بەگەرمیەوە بەشداریمان لەگەڵدا دەکەن بە ناردنی بابەتو بەرهەمی خۆتان ، هەرچەندە حەز ناکەین بە خوشکە « نەبەز » بڵێین ببورە بۆ بلاو نەکردنەوەی بەرهەمەکەت ، بەلام پەیمانی ئەوەشت دەدەینێ کە ئەگەر بەرهەمی چاکترمان بۆ بنێریت ئەوە بێگومان بلاوی دەکەینەوەو ئێمەیش خۆشحال دەبین کە خوشکێکی وەکو تۆ بە پەنجە ناسکو ڕەنگینەکانی خۆی لاپەڕە ئازیزەکانی کاروانمان بۆ برازێنێتەوەو بە ئاواتەوەین نموونەی خوشکی وەك ئێوە بە تەنگەوە هاتووی پێشکەوتنو پەرەسەندنی ڕۆشنبیری کوردیمان هەر زۆربنو لەسەرکەوتندا بن ..

بۆ ئەم برا ئازیزو بەڕێزانەی کە شیعرو پەخشانیان بۆ ناردووین :-

ئەزوەر ، عوبید خدر غەمبار ، قاسم ڕێباز ، صلاح نورالدین صابر ، ئەمین ئاکۆیی ، سمکۆ بەهرۆز محمد ، غەیاس عبدالقادر ، عبدالواحد قادر ، کریم جمیل ، شۆڕش فتاح ، سەرکەوت علي

